

# شێخ ڕەزای تاڵەبانی

علی خورشید

ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی ئەدەبی کوردیمان بدەینەوە، ئەوا دەبینین بەرهەمی شیعری شاعیرە کلاسیکییەکان لە سەرەتاوە لە چەند پەرەدەیێك خۆی نواندووە.. وەك پەردەی غەرامیاتو شیعری غەزەلیان زۆر بووە، شاعیر پابەندی عەشق دلبەرێك بووە، کەوتۆتە کەمەندی نازی نازدارانو مەستو مەیزەدەی خەتو خالو نیگای چاوی کاڵو گوڵو گونای ئاڵو- وەیا شەیدای قەدو باڵای نمامی عەرعەریان بووە، کەوا زوربەیان لە شیعردا حەزیان بە هونەری بەلاغەتو عیلمی بەدیعو بەیانو معانی کردووە، لە نێوهەڵبەستەکاندا: جناسو تەلمیحو، بەدیعو تشبیە، ئیستیعارە، مەجازو کنایة، اطناب، ئیجاز» یان بەکارهێناوە بە بیری تیژو نازکی خەیاڵو ووردی مەعناوە لەگەڵ جوانی ووشەو عیبارەتی ڕەنگینیان بۆ ڕازاندۆتەوە. هەندێکی تریش لە شاعیران ڕوویان کردۆتە پەردەی تەسەوفو ئیلاهیاتو فەلسەفەوە، بەسۆزێکی فیتریو سۆفیانەوە لە کونجی تەکیەو خانەقاکاندا وەیا بە زیانێکی دەروێشانەو زاهیدی خەلوەتنشینی بە جۆریٚ خۆیان لە دەریای تەسەوفو عەشقێکی ڕاستەقینە نقوم کردووە. جگە لەمانەش دیمەنی سرووشتیو نیگاری جوانو ڕەنگینی هاژەی تافگەی کۆساران لە قەد پاڵی شاخەکان لێکی دەدایەوە لەگەڵ دەنگی خوڕەی ئاوی کانیاوەکانو لەگەڵ فێنکی بای شنەی نەسیما دەیدا لە خشەی نەرمی گیاکان، ئەمانە هەمووی وەك سەرچاوەیەك هەستو ئەندێشەی شاعیرەکانی پێ بزواندوە کە بە شیعرە کانیانەوە پابەندی ئەم نیگارستانە بن.

جارجایش هەر بۆ هەوێن شیعری نیشتمانییان گوتووە.

لە دەوری شاعیریەتی مەلای جزیریدا، ئەم ووردەکارییەی جوانی ووشەو ڕازاندنەوە زۆرباوی سەندبوو، بەڵام مەلای جزیری هات ئەو ڕێبازەشیعرییەی شکاندووە، هەرچەندە لە شیعرەکانی خۆیشیدا هونەری بەلاغەتی بەعەرەبیو کوردی بەکارهێناوە، بەڵام ئەو عەرەبیی بە کوردی ڕازاندەوە یەکەم کەس بووە ئەم ڕێچکەی گرتۆتەبەر بەتایبەتی لە سەدەی پازدەهەمدا، ئیدی شاعیرانی دوای ئەویش هەر هەمان ڕێچکەیان گرتەبەر، لە هونەری شیعردا ئەم شێوازە شوێنی خۆی چەسپاندووە، مێژووی ئەدەبی کوردی قەرزاری مەلایەو، وەپێغەمبەری سەدەی پازدەهەمیەتی(١).

لە پاشدا زوربەی شاعیرانمان وردە وردەی پەردەی غەرامیو شیعری غەزەلیان کەم کردووەتەوەخۆیان لە قاڵبی هەڵبەستی کۆن رزگارکردووەوەك قەسیدەو غەزەلو پێنج خشتەکی- چوار خشتەکی- تەرکیب بەند- تەرجیع بەند...هتد. هەوڵەکەشیان بۆ ئەوە بوو. لە شوێن شیعری غەرامی، شیعری نەتەوایەتی بڵێن بەکێشی سووكو پاشبەند گۆڕینو بەکارهێنانی ووشەی سادەو ساکار بۆ ئەوەی زوربەی خەڵك تیٚیان بگەنو لەبەندو باوی لەغزو گرێدانو ووردەکاری رزگاریان بیٚ، هەرووەك حاجی قادر لەم شیعرەیا گوتوویەتی:

**بەیتەکان عەیبی مەکەن خوارو کەچن(٢).**

مەقسەدم لەم بەندو باوە دەربچن

هەرچەندە ئەم شیعرە لە هونەری بەلاغە لاوازی تیایە بەڵام مانای خۆی بە جوانی دەبەخشیٚو لەبەندوماناا ووشە زلیو باوی قورسی رزگاریان بووە، تەنیا بایەخ بە ناوەرۆك دراوە

هۆی ئەو گۆرانکارییەش ئەوە بوو، زوربەی شاعیرانمان بۆ ئەستەمول چوونو چاویان بە ئەدەبیاتی قەومەکانی تر کەوت کەوا شیعری نەتەوایەتی چەند بایەخی پیٚ دراوەو بۆ پێشخستنی نیشتمانو نەتەوەکەیان ڕۆڵێکی ئێجگار گرنگی بینیوە. جگە لەمەش هەڵسوکەوتی زوربەی شاعیرانمان لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخانییەکان بووە، هەستی نەتەوایەتی کاری تێکردوونهەرئەوەبوانە ئاخری بوخوریٖ سەدەی هەژدەهەم زۆربەی شاعیرانمان شۆڕشیان بەبەرهەمی ئەدەبی دەستپێکردووە، ئەمە لەلایەکەوە. لەلایەکی تریشەوە پاشماوەی کارەساتی بابانەکان هەر مابوو، گڕو بڵێسەی شیعری مەولەویو مەلا مستەفای بێسارانی، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بەرهەمی شیعرەکانی «نالیو سالمو کوردی» کە سیٚ کوچکەی بابانیان پیٚ دەڵێن، نووسینی بەرهەمی شیعریان بەشێوە دیالیکتی کرمانجی خواروو نووسراوە، کە بووە بە قوتابخانەی «نالیو سالمو کوردی ئیدی زوربەی شاعیرەکانی دوای ئەوان پەیڕەوی نووسینی ئەو شێوە زمانەیان کردووە بۆ هێنانەدی ئاواتو مەبەستیان. ئیتر ڕێچکەی خۆی گرت. یەك لەوانە شێخ ڕەزای تالەبانی بووە، پەیڕەوی ئەم قوتابخانەی کردووە کە پەیدابوونی قوتابخانەی شیعری نویٚیە لە دەوری بابانەوە لە شاری سولەیمانی. هەر بەوزاراوەیەی نالیو سالمو کوردی شیعریان پیٚنووسیبوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەدەبیاتی تازە، ئەو بەشە زاراوەیە، شێوە دیالیکتی ئاخاوتنی کرمانجی خوارووی پیٚ دەڵێن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕەگەزی بەشەکانی دیالێکتی تری کوردی لەو ئەدەبیاتەدا زیاتر بوو.

**یادی ئەمجارەمان شێخ ڕەزای تالەبانییە کە یادی «٧٩» ساڵەیەتی گیانی پاکی بە خاك سپێردراوەو، ئەستێرەی گەشی لە ئاسمانی ئەدەبیاتدا کوژاوەتەوە.**

شێخ ڕەزاو بەسەرهاتی ژیانی:

شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحموودی کوڕی یوسف ئاغایە لە بنەماڵەی «کاکە سوری قەرەداخییە لە خێڵی زەنگنە، مامەکانی بەشێخی تەریقەتی قادری ناوبانگیان دەرچووە، کە شێخ «عەبدولکەریم، فەتاح، محێدین، غەفوور، محەمەد سالح ؛ محەمەد عارف، عەبدولعەزیز» بوون- وەبراکانیشی شێخ (عەلی- عەبدولقادر- عەبدولواحد-

حەسەن) بوون.

وەباپیرە گەورەیان کە شێخ مەلا مەحموودە، شاعیری تەسەوف بووە، مەسنەویاتی شاعیری تەسەوفی گەورەی فارسی جەلالوددین-ی رۆمی شەرح کردووە، وەشێخ مەلامەحموود رابەری تەریقەتی قادری بووە، بە هۆی شێخێکی گەورە پێگەیشتووە بووە بە شێخی «بەرمال»، ئەو شێخەش شێخ ئەحمەد هیندی لاهوری‌یە(٣) .

شێخ رەزا لە ساڵی ١٨٣٧ لە دێی قرخ لە چەمچەماڵ لە دایك بووە(٤).

شێخ رەزا لە تەمەنی حەوت ساڵیدا لای شێخی باوکی دەستی بەخوێندن کردووە، لەپاشا چەند کتێبێکی سەرەتایی لای شێخ عەبدولغەفووری مامیشی خوێندووە، ئینجا بۆ کۆیە چووە، لە مەدرەسەی زانای بەناوبانگ جەلی زادە مەلا ئەسعەدی باپیری مەلا محەمەدی کۆیەدامەزراوە، وەلەگەڵ حاجی مەلا عەبدوللای کوری مەلا ئەسعەدو شاعیری بەناوبانگ «کەیفی جوانرۆیی»دا پێکەوە لە مزگەوتی گەورەی کۆیە فەقێ بوون، وەهەرسێکیان لە ژوورێکا دەرسیان خوێندووەو موتالاًیان کردووە، لە پاشا زویری لە نێوان شێخ رەزاو- کەیفی روویداوەو لە ئەنجامدا کەیفی کۆیەی هەر لەبەر ئەم ناکۆکی‌یە جی‌هێشتووە .

شێخ رەزا لە سلێمانی لە مزگەوتی گەورە- مزگەوتی کاك ئەحمەد»یش خوێندوویەتی . شێخ رەزا تا تەمەنی بیست‌و پێنج ساڵی خۆی بە خوێندنی عیلمی عەرەبی‌و ئەدەبیاتی فارسی‌و تورکی‌یەوە خەریك کردووە، لە پاشا ئەکەوێتە سەر ئەوە کە ولاتانو پایتەختی دەولەتی عوسمانی ببینێ بۆ ئەوە سەر بەرێتە ناو قاپی ژیانەوە، لە «١٨٦٠» بەسەر «حەلەب»دا بۆ ئەستەمول چووە، دوو ساڵێك لەوێ ئەبێ‌و ئەگەرێتەوە بۆ کەرکووك، لە ناوچەی هەولێردا ئەبیسێت کە هەر لەو ساڵەدا باوکی مردووە، لەپاش شەش مانگێك لە دوای مردنی باوکی- لەگەڵ شێخ عەلی برایا تێکچووە، ئەچێ بۆ کۆیە بۆلای شێخ غەفووری مامی کە گوایا کچی خۆی بداتێ بەم ناوەوە زیاتر لە شەش مانگ لە کۆیە ئەبێڵێتەوەو بیگاری پێ ئەکا لە پاشا کچەکەیشی ناداتێ! . ئەویش تۆراو بۆ کەرکووك گەراوەتەوە، بە دەردەسەری‌و پەژارەیی لەو ناوچەیەدا رایئەبوێری تا «١٨٦٦» دا بۆ جاری دووهەم دەشت ئەگرێتەوە بەرو بۆ ئەستەمول چۆتەوە، لەم کاروانەیدا «ئەرزەروم»یش ئەبینێ.. ئەم جەلەبە ماوەیێکی زۆر لەوێ ئەمینێتەوەو بە شیعرو ئەدەب خۆی لە «صدری اعظم» نزیك خستۆتەوە، لە وێشەوە ئەکەوێتە بەرچاوی ئەهلی «بابی عالی»، دەنگ‌و ئاوازەی لەو ناوەدا دەنگی داوەتەوە، هاتو چۆی هەموو دیوەخانێکی کردووەو، بە هۆی صدری اعظەمەوە ئەنێرێ بۆ حەج، لە رێگەی میسرەوە حەج ئەکاو ئەگەرێتەوە بۆ ئەستەمول، تا لەوێ بووە، گەڵی جار هاتو چۆی ئەحمەد پاشای بابانیشی کردووە .

بەم جۆرە رائەبوێرێ تا لە «١٧٨٤»دا ئەگەرێتەوە بۆ کەرکووك‌و ئەستەمول بەتەواوی بەجێ دێڵێ . لەلایەن حکوومەتی عوسمانی‌یەوە نەختێ مانگانەی بووە، خۆیشی وردە وردە بەبەریەوە کشت‌وکاڵی لە دەری کەرکووکەوە- بە بەریەوە کردووە، ژیانێکی رەندانەو ئەدیبانەی رابواردووە، زۆر جار هاتو چۆی وەسمان پاشاو محمود پاشای جاف‌و پیاوە گەورەکانی ئەو ناوەی کردوە، تا لە «١٨٩٨»دا بە تەواوی کەرکوکی بەجێ‌هێشتووەو چوەتە بەغدا لە تەکیەی طالبانی دانیشتووە .

لە بەغداش لەگەڵ ئەربابی قەڵەم‌و ئەدەبدا رایبواردووە، میانەی لەگەڵ بنەماڵەی سەلیم بەگی بابان‌و سەید «عەبدولرەحمانی نەقیب»ی بەغدادا زۆر خۆش بووە. تا لە «١٩٠٩»ی میلادی لە تەمەنی «٧٤» ساڵیدا بە نەخۆشی زەحیری کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی گەیلانی لە نزیك شێخ عەبدولقادری گەیلانی‌لەبەغدا نێژراوەو لەسەر قسەی خۆی ئەم دوو دێرە شیعرە فارسیەی خۆی لەسەر بەردی گۆرەکەی نووسراوە .

**یارسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف**
**داخل جنت شوم در زمرهٔ أصحاب تو؟**
**او رود در جنت‌و من درجهنم چون رواست؟**
**او سگ اصحاب کهف‌و من سگ اصحاب تو؟**

شێخ رەزا وەك بۆمان دەرکەوت لە شیعر نووسیندا پەیرەوی قوتابخانەی (نالی‌و سالم‌و کوردی)ی کردووە، هەرچەندە شاعیر دوای ئەوانیش بووە. یەکێك لە خاسیەتەکانی ئەو قوتابخانەیەش ئەوەیە کە سوودی لە جوانی زمانی کوردی دیوە. تاوەکو لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەڵێك شاعیری پێشکەوتووخوازانە بە شیعری نەتەوایەتی هاتنە کۆری شیعردانان وەك (حاجی قادر) حەریق، مەحوی. عەبدوللابەگی مسباح‌و دیوان)..هتد بایەخی شیعری شێخ رەزا لەوەدیارە کە زوربەی خەڵك بە ئاسانی تێ‌ئەگەن‌و لەبەر سادەیی‌و رەوانیی بووەتە ویردی سەر زمانی خەڵکەوە، چونکە لەکێشی سووك سوارە لە ناوەرۆکیشدا واتادارە..

دێرە هەڵبەستەکانی بەقسەی خۆش‌و نیکات رازاندۆتەوە .

لە کتێبەکەی د.عزالدین مصطفی رسول بە ناوی شێخ رەزاوە کە باسی ئەو سەرچاوانە دەکا تاکو ئێستا لەسەر شێخ رەزا نووسیویانە، ئینجا لەسەر هەر نووسینێك لەو سەرچاوانە بیروڕای خۆی تیایە دەربریوە، یەك لەو سەرچاوانە کە ئەمین فەیزی بووە یەکەمجار لەسەر شێخ رەزا نووسیویەتی:

«له(٦) چوار لیساندا شاعر بووە. بیلخاسە ئەشعاری کوردی‌یەی هەموو عیبارەتە لەفەساحەت‌و بەلاغەت. لە نیکاتی دەقیقەو زەرافەت‌و سیعەتی قەریحەو مەعلوماتی خاریجە تەقریرە» د.عزالدین دەڵێ: ئەمین فەیزی لە بلاوکردنەوەی شیعرەکانی شێخ رەزادا نموونەی لە هەموو بابەتەکان بلاوکردۆتەوە تا دەگاتە پلەی دووەمی شیعری سەتیر، خۆی لەو بابەتی دووەم پلە لاداوە، لێرەدا، د.عزالدین ئەم خۆلادانەی ئەمین فەیزی بە جۆرە رایەکی رەخنەگرانەی لەقەڵەم داوە .

وادیارە ئەمین فەیزی لە بابەت شیعری هەجووی شێخ رەزاوە هیچ بابەخێکی پی‌نەداوە بە هیچ جۆرێك ناوی نەهێناوە .

دیسان لە بارەی مامۆستا سەجادی دواوە، دەڵێ بە درێژی باسی شێخ رەزای کردووە، دیارە شێخ رەزا بە یەکێك لە کەڵە شاعیرەکانی کورد دادەنێت. رەنگە سەجادی یەکەم کەس‌و دواکەس بێت کە زۆرتر لەلایەنی هەجوگەری‌و شەرە جوێنی شێخ رەزا- کۆڵیبێتەوە . راستە لە زۆر شوێندا ئەوە دەردەبرێت کە شێخ رەزا هەر شاعیری هەجوو نییەو جاروبار نووسیویەتی .

«لە بن دەست ئەمەشەوە لە شیعری ستایش‌و پیاهەڵوتنیشدا(٧) وە نەبێ لە شاعیرەکانی‌تر کەمتر بووبێ بەڵکو لە گەلێ شوێن‌دا پێشکەوتووتر بوە، خەیاڵێکی

نازكو تەبیعەتێكی ئاوێنەیی بووە، بەتایبەتی ئەگەر هەستی خێرێكی لە یەكێ كردبێ بەتەواوی لالغاوەی شیعری كراوەتەوەو هەتا بێت وەسفێكی بەرزی بۆ هاتووە، خۆ ئێجگار لە بەشی فارسی‌یەكەیدا...

لەگەڵ ئەمەشدا زۆرتری ئەو لاپەڕانەی «مێژووی ئەدەبی كوردی» كە بۆ شێخ رەزا تەرخان كراون، بۆ باسی هەجووی شێخ رەزان، بایەخێكی ئێجگار گرنگی داوەتی تەنانەت كە لەزمانو دیمەنە بەلاغی‌یەكانی شیعری شێخ رەزاش دەدوێت، نموونە هەر شەڕە جوێنی شێخ رەزایە . لەم بارەیەشەوە بریاری گەورەی بۆ شێخ رەزا داوە وەك نووسیویە:—

«لە شیعرەكانیا— لە بەشی كوردی‌یەكەی—ناتوانێت بڕە شیعرێك ببینیتەوە كە ڕێچكەی یەكێكی‌تری گرتبێ، یا لەوی وەرگرتبێ .

بەتایبەتی كە دێتە سەرباسی زەمو قسە پێ‌وتن، یەكەمین شاعیرێكی كوردەو كەس نەتیوانیوە لە دۆزینەوەی شتی ووردی جنێوو قسە پێ‌وتندا بیگاتێ، نەوەك هەر ئەوەندە بەڵكو ئینكار ناكرێ كە شاعیری بەرزی عەرەب «جەریر» لە باسی جنێودا زۆر بەناوبانگە، من لام وایە ئەگەر لە دەوری شێخ رەزادا بوایە نەیئەتوانی لە خاكی «یەمامە»وە پێ‌بنێتە خاكی عیراق» .

ئەوەی سەرنجی ئێمە رابكێشی شێخ رەزا هەر شاعیری هەجوو نەبووە، هەروەك د.عزالدین دەڵێ:— شێخ رەزا لە هەموو مەبەسەكانی ئەوسای شیعردا بەرهەمی هەیە، لە هەندێكدا رەسەنی‌و سۆزی دەروونی مرۆڤانەی شاعیر دیارەو لە هەندێكدا شاعیری كلاسیكی‌یەو دەبێت مەرجی بوونە شاعیر بەجێ‌بێنێت . باشتراوایە لە توێی باسەكەدا ئەم بڕیارە بسەلمێنرێت.. وەهەروا بەم جۆرە بەپێی مەبەس شیعری شێخ رەزای دابەش كردووە

١—شیعری دڵداری ٢—شانازی ٤—ستایش ٥—بەرەو نیشتمانیەروەری ٦—تەسەوف ٧—شاعیرو رژێمی عوسمانی ٨—باری ژیانی خۆی‌و ژیانی كۆمەڵایەتی[٨]» .

لێرەدا ئەوەی ئێمە مەبەستمانە شیعری هەجوویەتی، بە درێژایی مێژووی ئەدەبی كوردی كەسێك نی‌یە وەك شێخ رەزا خۆی لێدابی‌و، ئەم داب‌و نەریتی كۆمەڵایەتی‌یەی كە باوە لە نێو خەڵك بە پێی رەسم‌و دەستووری زەمانە حوكمی خۆی لە ناو هەموو چینە كەسانێكی كوردەواری چەسپاندووە، شێخ ئەم داب‌و نەریتەی تێكشكاندووەو، بەو پەڕی‌تواناوە پەردەی شەرمی لەسەر شیعرەكانی خۆی لاداوەو، لە نزیك‌و دوورەوە پەلاماری خەڵكی داوەو گەورە بچووكیشیانی لێ قورتار نەبووە، ئەگەر گەشتێك بەناو دیوانەكەی شێخ رەزادا بكەین دەبینین:— لە شیعرەكانیا تووشی سەدەها كارەسات‌و بەزمەساتی سەیرو بە سەدە ها شارو دێهات گەڕاوە، ناوی سەدەها كەسانی ئەو ساكەمان بۆ دێنێتەوە، جگە لە ناوهێنانی چەندین تایفەو هۆزو بنەماڵەو ڕێبازی ئایینی‌و تەریقەت، وەگەلێك رووداوو شەڕو شۆڕی رۆژگار. ئەو داب‌و نەریتی كۆمەڵایەتی‌یەی زۆر باوی هەیە لە نێو كوردەوایدا خۆ دەنا دەوڵەتێكی ئیسلام‌و دەوربەرێكی كۆنە خوازی‌و دووری رۆشنبیری دواكەوتووی باری ئەدەبی هەر ئێجگار دەرگای لێ‌داخرابوو، لێرەدا پرسیارێك دێتە كایەوە چۆن شێخ رەزا بە شیعری هەجوو توانی بەگژ سولتان‌و پاشاو والی‌و وەزیرو سەلەشكرو— موتەسەریف‌و نوێنەرو شێخ‌و— ئاغاو بەگ‌و خان‌و میران دابچی؟

ئەی چۆن هەر بە شیعرەكانیشی گەیشتۆتە سولتان‌و پاشاو میرو سەرلەشكرو والی‌و زاناو شێخ‌و ناوداران پایەو پلەی خۆی‌پێ نواندووەو هەمیشە لە بەرز كردنەوەدا بووە؟! .

رۆژ لە دوای رۆژ ئەو گلۆلە دەزووەی لە دوودەستی هاتووە بە هیچ شێوەیێك تاڵە دەزووەكەی نەپساوەو ئەویش نەترساوە . لە وەڵامدا دەڵێین «پارسەنگ»!

كەوا بوو بۆ باس‌و لێكۆڵینەوەكەمان بڵێین

**شێخ رەزاو پارسەنگی تەرازووی شیعری هەجوو... لە پرسیارو وەڵامدا:— .**

چەند هۆیەك هەیە دەستی شێخ رەزای گرتووە تاوەكو پێ بنێتە تخووبی سنووری هەجووەوە بیكا بە موڵكی خۆیو نەتەوەكە لێی نەیەتەدەر، یەك لەو هۆیانە ئەوەیە كە شێخ رەزا بەرەچەلەك لە بنەماڵەی شێخەكانی تەریقەتی قادری‌یەو... باپیرە گەورەی مەلا مەحموودی زەنگنەیە، بەرەسمی شێخی بەرمال ناسراوە كە بەهۆی شێخێكی گەورە پیگەیشتووەو ناوی شێخ ئەحمەد هنیدی لاهوری‌یە، لە چەند شوێنێكی كوردستان‌و شارانی تریش تەكیەو دەروێش‌و مریدیان هەبووە، پایەو شوێنی تایبەتی‌یان لە نێو خەڵك‌دا هەبووە، ریزو حورمەتیان لە نێوخەڵك‌دا پلەداربووە .

هەر وەك مامۆستا مەسعوود محەمەد لە باسی كەیفی جوانرۆییدا باسی ئەم ناكۆكیەمان بە ئەمانەتێكی مێژوویی بۆ دەگێرێتەوە ئەو شەڕەشیعرەی نێوان شێخ‌رەزای تاڵەبانی‌و كەیفی جوانرۆییدا، لەبەر دوو هۆ بووە، یەكەكیان: «ئەوەیە كە شێخ رەزا لە كۆمەڵایەتیدا خۆی زۆر لە ژوور كەیفی‌یەوە گرتووەو پێی ئەستەم بووە رووتەیێكی وەك كەیفی بەو چەشنە بێ پەروابێ لەگەڵیا . دووەمیان . ئەوەیە كە كەیفی هەرگیز دانەماوە لە جەوابدانەوەی شێخ رە رەزا، ئیتر مانەوەی هەردووكیان دەبێتە شتێكی نامكن . حاجی مەلا عەبدوللا، مامۆستای كەیفی، لەبەر ئەو دۆستایەتی‌یە كۆنەی كە لەمەیانی جەلی زادان‌و تاڵەبانیاندا هەبووە، بەتایبەتی لەبەر زێدە خۆشەویستی‌یەكی بەینی حاجی مەلا ئەسعەدو شێخ ئەورەحمانی تاڵەبانی واتە باوكی شێخ رەزا سەرەڕای مەقام‌و دەسەڵاتی تاڵەبانیان‌و بێنەوایی كەیفی ناچار دەبێ حاجی مەلا عەبدوللا كە روو لە كەیفی گرژكاو لێی بتۆرێت‌و لە ئەنجامدا حاجی مەلاعەبدوللا كەیفی دەركردووە» .

هۆی دووەمیان دەوڵەمەندی شێخ رەزایە لەبەكارهێنانی زاراوەو وشەی جوانی كوردی، چونكە شێخ رەزا هەر لە دەوری منالیدا بەدوای خوێندن گەڕاوەو ئەو دێو ئەو شاری كردووە، جگە لەوە لە كۆمەڵگای كوردەواری زۆر نزیك بۆتەوەو لە دیوەخان‌و تەكیەو خانەقادا لە كۆڕی ئەو مەجلیسانەی كە دانیشتنی لەگەڵدا كردوون‌و بەخێرایی فێری ئیدیۆم‌و پەندو قسەی نەستەق‌و نیكاتی سەرنج راكێشەر بوو، چونكی شێخ لە شیعرەكانی بەشە كوردی‌یەكەی پەیڕەوی شێوە دیالیكتی كرمانجی خواووی كردووە لەلایەنی ئەو، ەوە شتێكی زۆر رەوان‌و سادەبووە، كە بەسەر زاری‌دا هاتووە، بۆ ئەوەی ئەم پەندو قسە نەستەقانەی نێو كۆمەڵگای كوردەواری بخاتە قالبی شیعر بە شێوەیێكی هونەركارانە دایبڕێژی، هەتا وای‌لێهاتووە شانازی بەزمانی بكا، ئەوەندە تیژو كاریگەر بووە، وەك شمشیری میسری بڕیاری بە بڕشت بووە .

هۆی سێ‌یەمیان: ئەوەبووە شەڕە شیعرەكەیەتی لە نێوان «شكری فضلی»و شێخ

رەزادا بەربەرەکانی‌یەکی زۆری خایاندووەو وای لە شێخ رەزا کردووە، پەلاماری هەموو زاراوەو ووشەی گران وەك تیرهاوێژ ئاراستە بکا، لەم قاپی‌یەوە دانانی شیعری شەرە جنێوو، جنێو بازی وەکو ئاو خواردنەوە بووە لای ئەو کەسیش نەی توانیوە خۆی لی‌بدا .

هۆی چوارەمیان ئەوەیە: لایەنی شیعری کۆمیدی‌یەکە شێخ رەزا کەوا زوربەی خەلکی رەش‌و رووتی گرتۆتەوە، بۆن‌و برینگی پێکەنین‌و بەزمەساتی لی‌هەلقولاوە، هەر وەکو مامۆستا عبد الرزاق بیمار لە باسی «شێخ رەزای کومیدیو سالوك» دەلی: «واتا دەمەوێ بلێم لایەنی کۆمێدی لە شیعرەکاندا بووەتە پاسپۆرت بۆ تێپەربوون بەسەر هەموو سنوورێکدا(١٠)» .

هۆی پێنجەمیان ئەوەیە «شێخ رەزا یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی کە بە چوار زمانی کوردی فارسی‌و تورکی‌و عەرەبی شیعری مولەممەعی هەیە . ئەوەی بۆ شێخ‌بۆ شێخ رەزاش گونجاوە لە جیهانی شیعردوا ئەو زمانانەی پێی گوتوون بۆ هیچ شاعیرێکی‌تری کوردی رێك نەکەوتووە (١١)» .. شێخ رەزا بە هەر چوار زمان شیعری هەجووی رێکخستووە، وەلە هونەری بەلاغەتیش دریغی لێوە نەکردووە لە دانانی تشبیه‌و- ستعارة- کنایة- توریە..هتد زۆر خێراو تەردەست بووە، لە پرسیارو وەلامدا ئەم هەموو ووردەکاری‌یەی لە هونەری بەلاغەتدا بە زۆری بۆ ئەوە بەکارهێناوە پارسەنگی مانا شیعری‌یەکەیەتی وەك پردێکە بۆ خۆ دەربازکردنی لە وەلامدانەوەی پرسیاری هەمە چەشنەی خەلکەوە .

هۆی شەشەمیان ئەوەیە ؛ شێخ هەر شاعیری هەجوو بەزمەسات‌و گالتەو گەپی ژیان نەبووە، شیعری ستایشی ئاینی‌و خواناسیشی هەیە، جگە لە بەشە کوردی‌یەکەی شیعری ستایشی بە فارسی‌و تورکیش هەر داناوە، هەرچەندە شێخ رەزا بەرگی تەسەوفی لەبەرخۆی نەکردووە، چونکە لە شیعرەکانیا ئەم پلەیەی وەدەست نەهێناوە کە شاعیرێکی تەسەوف لە دەریای عەشقێکی راستەقینە خوی تیایە نقوم کردبێ، هەرچەندە بەرەو تەریقەت‌و مەزەب‌و پیاو چاکان رۆیشتووە، بەلام وەنەبێ پریشکی هەجوو نەیانی گرتبێتەوە، لێرەدا شێخ رەزا پارسەنگەکەی بلیمەتانە راگرتووە هەرچەندە سنووری شیعری هەجووی فراوانە، لە شیعری ستایشی ئاینیش گەلێك فراوان بووە، شاعیرەکانی پێشوو پەردەی شیعری تەسەوف ئیلاهیات بۆ ستایشی پێغەمبەرو خولەفاکانیان گوتووە، لێرە شێخ رەزا خۆی‌داوەتە پال غەوسی گەیلانی‌و هەروا خۆشی داوەتە پال ئیمام رەزا، ستایشی تەریقەتی قادری کردووە هەروا ستایشی تەریقەتی نەقشبەندیشی کردووە، سۆزو خۆشەویستی‌یەکی دەروونی بۆ ساداتی بەرزنجە چەسپاندووەو بروای تەواوی پی‌هەبووە، هەروەك لەو شیعرەیا دەلی:-

**موخالەفەم نی‌یە من سەعاتێکی میقاتم**
**غولامی حەلقە بەگۆشی جەمیعی ساداتم**

تەنانەت زۆر جار هەستی هەجوو جنێوبازی شێخ رەزا جولاوە لە سنووری ـدات دایگرتووەو بە«شکری فەزلی» گوتووە : -

**من دەزانم کێ لە خشتەی بردووی ئەما چە سوود سەییدە**
**سەیید قسەی سووکی دەبێ دەرحەق نەکەم(١٢)**

هۆی حەوتەم ئەوەیە : شاعیرانی پێشوومان لەمەبەسی شیعری‌یان دریغی‌یان نەکردووە ، بەلام هیچ کامێکیان وەك شێخ رەزا بۆی نەچووە .

ئەوکاتەی شێخ رەزا ئەو پەردەیەی کردەوە ئەدەبی کوردی دەمێك بوو پێویستی بە شیعری هەجووی شێخ رەزا بووە ، هەروەك نووسەری بەناوبانگی جیهانی (سیلدن زودمان) دەلی : «شعرەکانی شێخ گەلێك بەئاوازو دەنگدارە بۆ ئۆف‌و ئازاری کوردەواری ، چونکە ئەدەبی کوردی تێنووی ئەم بابەتە شیعرانەیە کۆمەلایەتیش هەر تامەزرۆیەتی خۆزگا دەیان رۆلەی وەك شێخ رەزایان لە ئامێز بگرتبایە ، ئینجا ئەدەبی کوردی وجاغی رۆشن دەبۆوە ، بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتی کۆمەل‌و ، وە لە پێناوی پاراستنی مافی مرۆڤایەتی‌و نەتەوەو کەلەپوور» .. بی‌گومان قسەکەی سیلان وادەگەیەنی ئەدەبی کوردی خوا خوای بووە .. کە شێخ‌رەزایێکی وا بلیمەت‌و زیرەکی بۆ بێتە کۆری مەیدانەوە .. شێخ ئەوەی لە دەستی هاتووە بی‌پەروا بە هەموو کون‌و کەلەبەرێکی نەتەوەکەی‌دا چووەو ، هەرشتێکی نارەوای دیوە ، بەزمانی ئاگرینی ئەنجامی خۆی پێکاوەو هیچیش نەترساوەو زۆریش بی‌باك بووە ، چونکە شێخ زۆر چاك لە رووی کۆمەلایەتی‌یەوە نزیك بۆتەوەو خێرا گیرو گرفتەکانی ئەو کۆمەلەی بە خەلك راگەیاندووە .

کەوابوو شێخ زۆر چاك لەو راستی‌یە گەیشتووە ، لەو مەیدانەدا هەر خۆی تاقە سوارە ئینجا هەرچەند ئەسپی تاوبدا هەرکەمە ، بەگوێرەی قسەکەی سیلدن ئەگەر نۆ شاعیری وەك شێخ رەزامان هەبایە ئینجا وجاغمان کوێر نە دەبووو رۆشن‌و ئاوەدان دەبوو ، هەر بۆیە شێخ گوێی‌ی بەکەس نەداوەو ، لە نزیکترین کەسەوە دەستی بەشیعری هەجو کردووە.

هەرجەندهـەندێ کەس دەلێن شێخ رەزا جوێنی بە باوباپیرانمان داوە چ رەوای هەقە؟ ئەوە چی‌بە؟ .. گوایا شیعری گوتووە ! با شێخ جوێنی بەسێ چوار کەس دابێ لەبابی هەجووەوە ... ئەو مەبەستی ئەو دوو سێ کەسە نی‌یە ! لێرەدا شێخ ویستویەتی ئەو بۆشایی‌یە پر بکاتەوە لە ئەدەبی کوردی کە لەلای هێندێ کەس دیار نی‌یە لەلای شێخ بەزەقی دیاربووە ، شێخ رەزاش هەروای لێك داوەتەوە ئەگەر جوێنی دا چی یە؟ ئەو پەری هێندێ کەس لێوی خواردەکا ! ! ! نە ئاسمان دەروخێ‌و نە زەویش شەق دەبێ . لێرەدا شێخ تەرازووی شیعری لە دەست خۆی بووە ، چونکە خۆی بەتەنیا لەو مەیدانە بووە ، هەر چەندە زمانی تیژبووە هەر ویستویەتی زیاتر ببڕیت تاوەکو پارسەنگەکەی لەنگ نەبێت هەروەك خۆی دەلی : من جنێوم بە دووسێ کەسی‌داوە لەگەل شێخ صالح ووتووێژ دەکا .

**تۆ کە خۆت مەیلی جنێو بازی دەکەی «شێخ صالح»**
**بۆ دەکەی سەر زەنشی من کە«رضا» هەجاوە**
**غایەتی بەندە جنێوم بە دو سیە کەس دابێ**
تو هەتا ایستە بە قوربان ، بە هەزارت داوە (١٤)

بێگومان لەو شیعرەیا ئەگەر شێخ صالح بڵێت بۆ پێم دەڵێی (هەزارت داوە) لەوەڵامدا دەڵێ لەگەڵ جوێنی تۆمە . مەبەستم چی‌تر نی‌بەو پارسەنگەکەی بەوەراست کردۆتەوە .

نموونەی شیعری : —

**پیر کە کوکی‌و ، نەترِی ، دوورەلە مردن هێشتا**
**وردە ئاهەنگی دوای کۆکە نشانەی ئەجەلە**
**پیر کە کوکی‌و ترِی دەنگی وەکو بارە زەلە**
**شاهدی موعتەبەرم عززەتی مەغووری تەلە (١٦)**

لێرەدا شێخ رەزا هاتۆتە سەر وەسفی پیاوی پیر : ئێمە هەموومان دەزانین پیری دەردێکەو هەموومان بەخزمەتی دەگەین‌و پیری زۆر قسەی لە سەر هاتووە . هەرچی چۆتە خزمەتی بەسەد عەیب لە دەستی رزگار نەبووە . هەروەکو دەڵێن پیری‌و سەد عەیب — دورت لێ نزیك بووە . مەبەست لە چاو کزی‌یە ، دووت لێ بووە بە سێ — مەبەست گۆچانە . جووتت لێ بوویتە تاق — مەبەست ددانە ... هتد. وادیارە شێخ رەزاش زۆر قینی لێ بوویتەوە . بۆیێ واکەوتۆتە زەمی . بەڵام لێرەدا شێخ رەزا دەوری «پزیشکێك» ی پسپۆری بینیوە هەڵساوە نەخشەیێکی کاریکتۆری بۆکێشاوە . هەموو تەختیتی قەلبی وەرگرتووە ، وەنیشانەکانی مردنیشی پێ وتووەو عیلاجیشی داوەتێ بەخۆرایی . لێرەدا شێخ رەزا دەردی پیری بە بێ ئومێدی ناهێڵێتەوە تروسکایی‌یێکی رۆشنی بۆ هێشتۆتەوە . لێرەدا لەبەسەرهاتی چیرۆکی پیری .. خۆی دەکاتە پاڵەوانی چیرۆکەکەو دەوری پاڵەوانێتی وەدەست دێنێ ، هەر چەندە پیری پەککەوتەی سەراوسەر بەزەوی داداو . بەڵام راستیشی دەکاتەوە پارسەنگەکەی بۆ راگرتووە ...وەك دەڵێ :

**عومرم گە یی بەهەشتا ... بەکارە هێشتا**
**تصدیق گەر نەفەرموی . هەستم بەرم بەرەشتا ! (١٧)**

نموونەی شیعری‌ی :

حەوشەیێکم هەیە بەقەدەری لەپێ
رۆژ عیلاجی ئەکەم بەشەو ئەتەپی
مەنفەذو درزو ، ئاودزی هەر چەند
دەیگرم، دەیکوتم، بە دەست‌و بە پێ
شەو کە دێم دەم دەکاتەوە وەکو هار

وا ئەزانم سەگەو بە من ئەحەپێ
سەرو رێشم لە تۆزو قسل‌و گەچا
وەك پەلاسێکە پڕ لە رشك‌و سپێ
خەمی شاگردەکان زیاتر دەخۆم
گەورە هەر چاکە ئاخ لە دەس دەس‌و پێ (١٨)

شێخ رەزا لێرە وەسفی خانووەکەی دەکا بە شێوەیێکی گاڵتەجاری . دیسان نەخشەی خانووەکەی دروست کردووە ، لێرە مبالەغەیێکی بێوێنەی تیایە کردووە . بە جۆرێکی بەزم‌و گاڵتە جاری‌و کاریکاتۆری عەیبەکانی دەست نیشان کردووەو خۆشی وەك ئەندازیارێك ئەو جۆرە خانوانەی کە دروست کراون رەفز دەکاتەوە ، تەنانەت خانوویێکی وا بچووك بەم شێوە ئەندازەیە بکرێ ! .. ئەی خانووی گەورەتر دەبێ چۆن دروست بکرێ . چارەسەری بابەتێکی باری کۆمەلایەتی کوردەواری کردووەو . وەستاو کرێکارو شاگردانی ئەوسای بەرامبەر بە کۆمەڵ ریسوا کردووە . خەڵکی لێ بە ئاگا هێناون — بەرێگایەکی هونەری خەڵکی لێ‌هۆشیار کردونەتەوە یا وەك رەخنەگرێکی توندوتیژ هێرش دەباتە سەریان بۆ ئەو بارە ناهەموارەی لە ناو کۆمەڵدا دیارە — بۆئەوەی خەڵك زۆر باش ئەم جۆرە کەسانە بناسێ بە ناوی وەستاو شاگردی خۆیان دەژێن‌و کۆمەڵ سوود لە بەهرەو کردەوەیان وەرناگرێ ، هەر چەندە شاعر کەلە سەرەتاوە ناوی خانووەکەی خۆی هێناوە بەڵام مەبەستی هەر ئەوە بووە عەیبی ئەوانیش دەربخات‌و پارسەنگەکەی بەوە داوەتەوە ، شیعرێکی مەلا هەوایی شاعیری خوالێ‌خۆشبوو هەیە ئەویش هەر لەسەر خانوو گوتوویەتی :

**فەلەك لێم ناگەرِێ . تیغی زوبانم دێتە دەر چ بکەم !**
**بە رێژانی حەوادیس پێم دەخوا خوێنی جگەر چ بکەم**
**هەتا روژێ لە ناگەهـ بان‌و دیواری هەموو روخا**
**ئیتر بۆ خۆم نەکەم گریان‌و شین‌و قوڕ بەسەر چ بکەم**
**ئەگەرچی خانوەکەم لایێکی روخاوە بەسەریەکدا**

**به فیردەوسی نەزانم یا بەگەنجی پڕ گوهەر چ بکەم**(١٩)

من لێرە مەبەستم ئەوەنی‌یە شاعیری‌یەتی هەوایی‌و شێخ ڕەزا بخەمە نای یەك تەرازووو بەراوردی یان بکەم ، چونکە شاعیری‌یەتی شێخ گەلێ بەرزترە ، هەر چەندە ئەم شاعیرەشمان شیعری هەجای ووتوە ، شعری بە کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی هەیە . **پەیرەوی قوتانجانەی شیعری نالی‌و سالم و ئەوانی دی کردووە** بەلاّم سادەیی‌و سووکی‌و ڕەوانی لە شیعرەکانی‌دا ئاشکرا دیارە ، ئەویش هەروەك شێخ لە واقیعی ژیانی کوردەواری بەقووڵی ورد بوویتەوە ، لە چوار چیوەی ژیانی خویەوە پەنجەی بۆ گەلی زامی ناسۆری کوردەواری درێژ کردووەو بە هەڵبەستی شیعری خەڵکیان هۆشیار کردۆتەوە .

نموونەی شیعری‌ی شێخ ڕەزا : –

## ئێسترێکی ڕووت‌و قووت

میر بەسەد مینەت هەناردی ئێسترێکی ڕووت‌و قووت
دەست‌و پا سست‌و سەقەت ئەندامی هەرەك عەنکەبووت
خاوەنی ئالیکی نالێم پێ نەداوە موتلەقا
داویەتی ئەمما وەکو بیستوومە قووتی لایەموت
پووش لەلای حەلوایە ، حەتتاکو پەلووشەی چنگ کەوێ
بای ئەدا ، لوولی ئەدا ، قووتی ئەدا ، مانەندی حووت
گەرچی ناتوانێ بزوێ هێند لەرو کەم قووەتە .
دەنکە جۆیێکی نیشان دەی ، تا قیامەت دێ لە دووت
پشتی ڕیش‌و شانی زامدارو جەدەو بوو ناعیلاج
چەند قرۆشێکم هەبوو بۆم دا بە نەوت‌و عەنزەرووت
مەسلەحەت وایە هەتا نەیخواردووم بینێرمەوە
زۆر ئەترسم دفعەیی قووتم‌بدا بمکا بە قووت(٢٠)

شێخ باسی ئێستری میری کردورە کە بەسەد منەت بۆی ناردووە ئەو وەسفە شێخ ڕەزا بۆی کردووە لە هەر چوارپەلی بەس دوو گوێچکی ساغە لێرەوە نەخشەیێکی کاریکاتۆری بۆ کێشاوە کە باسی هەیکەلەکەی زۆر بە وردی دەکاو هونەری بەلاغەتی تیا بەکارهێناوە ، ئەم وەسفەی شێخ ڕەزا بۆی جووە کەسی‌تر بۆی نەچووە ، لێرەدا شێخ لە پاش وەسفدا کە ئەم هەموو نەخۆشی‌یەی هەیە ناچاربووە بە دوای پزیشکی ئاژەلی ناردووە چ پارەو پوولی هەبووە ، گشتی بۆ بەدەرمانات داوە ، هەتاکو زامەکانی تیمار بکا ، شێخ بەراوردێکی جوان دەکا لەبەینی خۆی‌و میر ، میر خاوەنی ئیش‌وکارێکی ئێجگار زۆرە دەربەستی ئەوە نایەن هێستر ماندووە برسی‌و تێنوو دەبێ ، جا ئەگەر ئەو ئێسترە تۆپی ئێسترێکی‌تر دێننەوە بۆ ئیش لە شوێنی ، بەلاّم لەلای شێخ ڕەزا ئەوە بۆی مەیسەر نایی ، لێرەشدا شێخ وای لە میر کردووە ئەو منەتەی لەسەر شێخ کردووە بەلای خۆی‌دا بشکێنەوە چونکە چ پارەو پوول‌و دارایی هەبووە ، هەمووی لە ئێسترەکە داوە هەر سوودیشی نەبووە ، ئەگەر هەجووی میریشی تێدایی میر هەر لە ئاست شێخ ڕەزاوە مەجبوورە بێدەنگ بێ ، پارسەنگی تەرازووەکەی ڕاست‌و دروست ڕاگرتووەو هیچ فێڵی لە میر نەکردووە .

سالمی شاعیر ئەویش باسی وولاخەکەی خۆی دەکاو دەڵێ :

**گوایا اظهاری عزوری خۆی ئەکا دێم زینی کەم**
**هەل دەتۆرێنی وەکو گای بارنەبەر خۆی شێت ئەکا**
**دەست ئەبەم زینی بکەم چونکە لە سواری عاجزە**
**بۆ لە قە خۆی خۆش ئەکات‌و مۆڕ ئەبێ لێم لابەلا** (٢١)

لێرەدا هێسترەکەی سالم بە پێچەوانەی هێستری شێخ ڕەزایە .

**سەرچاوەو پەراوێز**

١ - مێژووی ئەدەبی کوردی ماموستا علاء الدین سجادی – ١٩٧٢ چاپی دووەم بەغدا ل١٩٦ .
٢ گۆڤاری چیا – ماموستا کریم شارەزا – ژمارە٢ – سالی-١- ل٢ هەولێر ١٩٧١ .
٣ – رۆشنبیری نوێ ژمارە – ٣٥ – بەغدا ، ١/١١ ١٩٧٤ ل٤
٤ – دەفتەری کوردەواری بەرگی یەکەم بەغدا کانوونی دووەمی ١٩٧٠ ل١٢ – گەلێك بیروڕا هەیە لەسەر هاتنە دنیای شێخ ڕەزا بەلاّم د . عز الدین سالی ١٨٣٢ بەنزیك دادەنێ .
٥ مێژووی ئەدەبی کوردی – علاء الدین سجادی چ٢ بەغدا سالی ١٩٧٢ ل ٣٧٥ . ٣٧٦ . ٣٧٧ .
٦ شێخ ڕەزای تالەبانی د . عز الدین مصطفی رسول سالی ١٩٧٩ بەغدا ل .
٧ – شێخ ڕەزای تالەبانی – د . عز الدین مصطفی رسول سالی ١٩٧٩ بەغدا ل١٧
٨ – هەمان سەرچاوە ل٥٢
٩ – دەفتەری کوردەواری بەرگی دووەم – بەغدا : مارت نیسانی ١٩٧٠ ل٣٣
١٠ – گۆڤاری کاروان ژ : ٨ – سالی ١٩٨٣ ل١٨
١١ – مێژووی ئەدەبی کوردی د . مارف خەزنەدار ١٩٨٤ بەغدا ل ٢٠٧
١٢ شێخ ڕەزای تاڵەبانی د . عز الدین ١٩٧٩ بەغدا ل١٠٥
١٣ رۆشنبیری نوێ – محمود زامدار ژمارە (٣٥) بەغدا ١ /١١ /١٩٧٤ ل٤
١٤ دیوانی شێخ ڕەزای تالەبانی ل ٨٢ .
١٥ هەمان سەرچاوە تالەبانی ل ٨١ .
١٦ - هەمان سەرچاوە تالەبانی – ل ٨٣ .
١٧ مێژووی ئەدەبی کوردی – علاء الدین سجادی – ١٩٧٢چ٢ بەغدا ل ٣٩١
١٨ دیوانی شێخ ڕەزای تاڵە بانی – ل ٧١ .
١٩ گۆڤاری برایەتی ژمارە-١- سالی ١ بەغدا ل ١٤
٢٠ شێخ ڕەزای تالەبانی – د . عز الدین ١٩٧٩ بەغدا ل ٩٥
٢١ رۆشنبیری نوێ ژمارە (٣٥) بەغدا ١ / ١١ / ١٩٧٤ ل٢ .




# دوازده سێدارەی بێداد

عبد القادری دەباغی

لە ساڵانی ١٣٢٤و ١٣٢٥ی هەتاوی ١٩٤٥و ١٩٤٦ی زاین بەشێکی زۆری کوردستانی ئێران لەچنگی زۆرداریو ملهوڕی حەمە ڕەزا شا ڕزگاری هاتبوو. کۆمارێکی ساواو ئازیز دەیەویست بە هەموو هێزو توانایەوە کوردستان بەرەوپێش ببات‌و بەتیشکی پیرۆزی زانست‌و بیرو باوەڕی پێشکەوتنخوازانە. بە لەبەرچاوگرتنی هەل‌و مەرجی وڵات‌و داب‌و نەریتی تایبەتیی نەتەوەی کورد بە ئاواتی لە مێژینەی بگات..

ئاڵای پیرۆزی کوردستان دەشەکایەوەو گەلی کورد لە ژێر سێبەری پڕ پیت‌و فەڕی دەحەسایەوە. ڕۆڵە دڵسۆزو بە ئەمەکەکانی کورد لە هەموو لایەکەوە بەرەو پیری دەچوون‌و لە ژێر دەستی‌و مەینەت ڕزگار دەبوون.

بەڵام دوژمنانی نەتەوەی کورد لەسەر هەموویانەوە ڕێویە پیرەی پڕ فێڵی بەریتانیاو ئەمپریالیستی تازەکارو بەدەسەڵات‌و هاری ئەمریکا پێکهاتنی ئەو کۆمارەیان بە دژی بەرژەوەندی‌و قازانجی خۆیان دەزانی‌و قوڵە چوماخەکانیان کەوتنە پەلە قاژەو وتووێژو هانایان بۆ ئاغایان بردو گوێی کاربەدەستانی لەندەنیان بە درۆو بوختان پڕ کرد.

حەمەڕەزا شای تازە پێدا کەوتووی دیکتاتۆر خەوی لێ زڕاو ئارامی لێ هەڵگیرا. دەیان سیخوڕی پسپۆر. کە بە ئاوی ڕوباری (تایمزی) لەندەن بە

ـوی ڕ ویژکەری تایبەتی لە دەربارو دەورو بەری شادا کۆزیان بەستبوو.

هەوێ دزەکانیان باسی ئاوەدانیو بەرەوپێش چوونی ئابووری کوردستـانو دامەزراندنی فێرگەی کوردیو بلاوبونەوەی فەرهەنگو فۆنکۆرو دەرچوونی ڕوژنامەو گۆڤارو باش‌بوونی گشت لایەنەکانی کۆمەڵایەتی‌یان لە گەڵ جنێوو بوختان رادەگەیاند.

هەر ئەو بەرەوپێش‌چوونو پێشکەوتن خوازی‌یەو هەر ئەو خۆشەیستیەی گەل بە پێشەواو کۆمار بوو بە هۆی ئەوە کە دوژمنانی ڕووناکی‌و بەختەوەری بە پەلە دەس بەکاربن‌و بناخەی بڕمێن‌و فیداکاران‌و ئەویندارانی بخنکێن‌و ریشەی دەربێنن.

بۆ گەیشتن بە ئارەزووی گلاویان لەسەر پەندو ئامۆژگاری‌یە لە مێژینەکەی چەوسێنەرانی دنیا «دوو بەرەکی پێك بێنەو سەروەری کە» سەرۆك عەشیرەتە خۆفرۆشەکانیان هەڵخەڵەتاندو دڵخۆشیان دانەوە بە شیرینی شەکر تالاوی کورد فرۆشی‌و نۆکەریان بە گەرووداکردن....

داخی گرانم فێڵبازی‌و دەسیسە گەلی سیاسی‌و هەل‌و مەرجی زەمانیش بە قازانجی ئەوان، بە زیانی بەرەی پێشکەوتنخواز هەڵسوڕاو دۆستە

بێگانەکەش ئەو دەم قزە بوو.

هێشتا ساڵێ بەسەر تەمەنی کۆماری ئازاردا تێنەپەڕیبوو کە سوپای تالانچی‌و دژی ڕووناکیی ئێران هەلی بۆهەڵکەوت‌و هێرشی هێناو کۆماری ساوا لە هەر چوار لاوە گەمارۆ دراو خائینان‌و خۆفرۆشانیش کەوتنە جوولانەوەو سەما بە چەشنی پواز لەبن دەستی نەمامی تازە ڕوواودا هەڵچەقین. ئەوانەو زۆر هۆی دیکەش بوونە هۆی ئەوە کە کۆشکی هیوای کورد بە ڕووالەت ڕووخا، ڕۆژی کوردستان بە تەمی مەینەت گیراو گرتووخانەکانی پاشایەتی لە فیداکاران‌و ئازادی خوازان ئاخندرا. کالایەکی نوێ کەوتە بازاری کوردستانەوە، ڕێبازێکی تازە هاتە پێش ئەویندارانی نیشتمانەوە، یا ڕۆیشتنی سەر کورسی سێدارە یا ئاخنینی گیرفان لە دراوو پارەو دانیشتنی بان کورسی ئیدارە یا دوور کەوتنەوە لە ئامانج‌و پشت هەڵکردن لە نەتەوەو خۆ خەریك‌کردن بەژن‌و ماڵ‌و کۆکردنەوەی پوول‌وسامان‌و ماڵ‌ەسێ ریبانەیەکی سەیرو سەمەرەبوو. .. پێشەوا لە لوتکەی شەرەفەوە داوای هەڵبژاردنی ڕێگای فیداکاری دەکرد. دوژمنانی نەتەوەکەمان هەوڵیان دەدا بە هەر نرخ‌و بەهایەك‌بێ واز لە ئامانج بێنن‌و خۆشی ژیان بۆ ژیانی دوا ڕۆژیان پێك بێنن.

سیخوڕەکان بە ناوی «ئامۆژگاری کەر» دەهاتنە گرتوخانەو بە زمانی چەورو لووس بەدەورماندا دەهاتن‌و ئامۆژگاری‌یان دەکردین.

ئەوانەی حەزیان لە ژیانی ناوخێزان‌و هەوڵی پڕکردنی گیرفانیان‌بوو تەسلیمیان بوون، بەرەو ژیانێکی تازە دەچوون. ئەوانەی بۆ ژیانی شەرەف مەندانە ژینی نێو گرتووخانەو تەنانەت ڕۆیشتنی سەرداراونەیان هەڵبژارد. مانەوە. لەو سەردەمەدا نزیکەی (٦٠ ، ٧٠) کەسێ لەگرتوخانەی شاری سەقزدا بووین (٩) کەسیش لە گرتوخانەی شاری بۆکان. لە نێو گیراوەکانی سەقزدا هەموو جۆرە کەسێکی تێدابوو ، مەلا شێخ، مووچەخۆر. بازرگان، جووتیار، کریکار، زوربەیان پاش یەك دوو مانگ بە دەستەبەری سیخوڕەکان بەرەڵلاکران‌و ریزی خەباتیان بە جێ هێشت‌و برێکیان خۆیان لە داوێن دوژمن هاویشت.

بەلام ئەو نۆ کەسەی بۆکان هەموویان لە نیشتمانپەروەرانی وریاو ڕووناکبیری تایفەی فەیزوڵلا بەگیبوو کە ئاغاو خاوەن گوندو سوارچاك‌و ئازاو جوامێربوون هۆی ئەوە کەئەونۆ کە سەیان بەجوێ لە بۆکاندا هێشتەوە ئەوەبوو کە دەیانەویست بەهەر شێوەیەك بۆیان بلوێ هەڵیان خڵەتێنن. بەلام بەهۆی خۆڕاگری سالارە پیاوی تایفە، شەهید «ئەحمەد خانی فاروقی» هیچ کامیان ڕێگای شەرەفیان بەر نەداو خەیانەتیان بە نەتەوە نەکرد.

کاتێ دوژمن زانی ناتوانێ ورەی ئەو قارەمانانە نزم کاتەوە، دڵنیابووکە ئەویندارانی نیشتمان لە ڕووگەی وەفا ڕوو وەرناگێڕن‌و مەحوی ئاسا کە

دەفەرموێ:

دەرسی عەشقی من لە کن پەروانە یا بولبول‌بووە،.
بیگەمێ یا نەیگەمێ هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم

ڕێگای نەبەزی‌و قارەمانەی بەرنادەن‌و بە مەرگی زانی کە ئەوانە خۆ سووری خۆیان خەوی خۆش لە چاوی زۆرداران دەسووتێنن بەلام شا دەزڕێنن هەشت کەس لەو نۆ کەسەی هێنایە سەقز ئەوانە کێن؟.

بۆ هەتا ئێستا تەنانەت لەلایەن میرات‌گرانی سیاسیو ڕێبوارانی ڕێگای خوێناویو پیرۆزیان شتێکی‌ئەوتۆ کە شایانی‌ئەوانەبێ لاپەرەی‌مێژووی پێ نەڕەنگاوە؟ دەمەوێ تانەمردووم ئەوەندەی کە بشێ لە بیرەوەرییەکانم سەبارەت بەو سەردارانە کە لە سێدارەی بێدادی ڕێژێمی‌نەگریسی ئیستیبدادیو نۆکەری ئیمپریا لیزمەوە پەیامی‌تێکۆشان و نەبەزیو فیداکاریو

سەربەرزیان بۆ نەتەوەی خۆ یان تۆمار کرد، بنووسمەوە لە گۆڤاری هێژای (کاروان)ی بەرێزدا بلاوی بکەمەوەو دیسانەوە وەك بانگەواز بە بەرەی لاوانی پێگەیشتوو بێژم‌و لێیان بپارێمەوە کە هەولێ ژیانەوەی‌یادی ئەو جوامێرو قارەمانانە بدەن کە وون ناون یان خەریکە لە بیر بچێتە وە...!!

وەك دەزانین پاش روخانی دام‌و دەزگای رەزاشا کوردە دیلەکانی گرتووخانەکان‌و دوور خراوەکانی شاران بەرە بەرەوولات گەرانەوە.

بە داخەوە نەزمی دەرەبەگایەتی ژیایەوەو گشت ناوچەکانی کوردستانی ئێران بێجگە لەشاری مەهاباد بوو بە مەیدانی دەسەلاتی بێ ئەم لاولای خان‌و ئاغاو بەگ. بەلام لە لایەکی دیکەوە بە هۆی هەل‌و مەرجی لە بارو رووداوە پڕ سوودەکانی جیهانی‌یەوە کە هاوپەیمانانی ئەو رۆژەو دەسەلات دارانی ئەمڕۆ مزگێنی ئازادی گەلان‌و مافی ئینسانیان پەیتا پەیتا لە راگەیەنەرە گشتیەکانیانەوە بلاو دەکردەوەو بە شیعرو گوتارو رۆژنامەو گۆڤار، یارمەتی جوولانەوەی ئازادی خوازانەیان دەدا لەو قۆناخەدا لە مەهابادی لە تالانی‌و بروی حەشایر بە هۆی (قازی محەمەد)ەوە پارێزراو کۆمەلەی ژیانەوەی کورد پێك هات لە پاشان هەر لەبەر، چاوگرتنی هەل‌و مەرجی نێو نەتەوایەتی ناوی گۆڕدراو بە ناوی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) هاتە گۆڕەپانی ژیان‌و کۆماری پێك هێنا.

دوژمنانی نەتەوەی کورد بە هانای کوێخا دارو دەستە کۆشکنشین‌و بەروالەت‌شاهەنشاکەیانەوەد هاتن‌و بە پێچەوانەی گشت قانون‌و یاساکانی ئینسانی‌یەوە، مافی کوردیان پێشێل کردو چرای هیوایان کوژاندەوە پێشەواو رۆلە بەئەمەکەکانی لە گرتووخانەدا لە هۆدە دەرگا بە ستراوەکاندا بە بێ رەچاوگرتن تەنانەت قانوونەکانی خۆیان (دادگاهی) کراین. ئەوانە کێ بوون؟! .

تاقمی هەوەلی زیندانی شاری سەقز کە بە بێدادگاه نیزامی‌شا‌دران بریتی‌بوون لە:

١ ئەحمەد خان فاروقی –سالار–

٢–مەو لاخان. مەتین (برای سالار)

٣–محەمەد خان دانش وەر (برای سالار)

٤–عەلی خانی فاتح

٥– حەمەد بەگ فەیزوللا بەگی

٦–حەسەن خانی فەیزوللا بەگی

٧–ئەحمەد خانی شەجیعی (شەنگە)

٨–شێخ ئەمین ئەسعەدی ٩–شێخ سەدیف ئەسعەدی

١٠–عەلی ئاغا جوانمەردی ١١–رەسوول ئاغا مەحمودی (برای عەلی ئاغا)

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆرێ، بۆچی شاری سەقزیان بۆ خنکاندنی رۆلە بە ئەمەکەکانی نیشتمان هەلبژارد. ئەو یازدە کەسە کە بەدەستەی سالار ناو دەبران بەر لە پێشەوا لە سێدارە دران؟.

هەلبژاردنی شاری سەقز بۆ ئەو جینایەتە دوو هۆی هەبوو:

هۆی سیاسی: لە سەردەمی کۆماردا ئەندامەتی حیزب‌و پێشمەرگایەتی لە ناوچە رزگار کراوەکاندا بە ئاشکرابوو. بەلام لە سەقزو بانەو سنەدا، رێکخراوەکان بە نهێنی دامەزرابوون .. وە لە بەر ئەوەی شاری سەقز گەورەترین‌مۆلگەی هێزی نیزامی ئێرانی تێدابوو، رێکخراوی نهێنی سەقز ئەرکی قورسی ئاگادارکردنی حیزب لە پیلان‌و دەسیەکانی‌دوژمن چە لە باری سیاسیو چ لە باری نیزامیەوە بە ئەستۆوە بوو. .

سەرە رای ئەوەش نوختەی پێوەندی بانەو سنەش‌بوو فیداکاریو لە خۆ بوردوویو نهێنی کاری رێکخراوی سەقز دوژمنی هەراسان کردبوو، دەیەویست بەو جینایەتە، هەزاران ئەندام‌و لایەنگری حیزب پەژیوان‌و دلسارد بکاتەوە...

٢–سەقز دەروازەی کوردستان‌و ئازەر بایجانە .. هەر رووداوێ لەوێدا تەئسیر دەخاتە سەر شارەکانی ئەو ناوچە پان‌و بەرینانە ئەو ئاوەش لەمێژبوو رژابوو .. (شەریف الدولەی) قاجاری حەبیبەللا خانی تیلەکۆو رۆستەم خانی بانەیی هەر لە چیمەنی بەدیمەنی شاری سەقز لە سیدارە دابوو، وەك شاعیرێکی ئەو سەردەمە دەلێ

کۆنە پیلم حەقایەتی دەرم
سەر گوزەشتە نەزیزیلەیی سارم

کوا قەدەم خێر بە دەستی کێ ون‌بوو
ئێلی گەلباخی بۆ سەروبن بوو

تیلەکۆیی بەکێ کروان کز
باقیە نەقلی دارەکەی سەقز

بەلام بۆ حوکمی لە سێدارەدانی ئەو قارەمانانە کە لە ژێر فەرمانی

وتوویژی کردبوو بەلاّم لەو شەوەو لە نێو ئەو تەقەدا کێ بیبیستێ؟!

هەر لە کاتی هاوارەکەیدا بەر گوللە کەوت و کوژرا .

بە کوشتنی سەرلەشکر ئەمین پاشماوەی هێزەکە تەسلیم بوون و بە تەسلیم بوونی ئەمان پارێزەرانی شاریش ورەیان بەردا . لە گزنگی بەیان‌دا شارگیراو بەداخەوە تالاّن‌کرا .

سالار لەو تالاّن‌کردن و زولم و زۆرەو دڵگران‌بوو بە بیانووی چاوپێکەوتنی خزمانیەوە هاتەگوندی یەکشەوەو بۆ کرینی شمەك هاتە بۆکان و لەوێدا بوو کە هەوەل جار نوێنەرێکی (ژ.ك) چووە چاوپێکەوتنی

بریاریان‌دا کە سەبارەت بە پەیوەندیو ئەندامەتی پێشنیا (بکرێ) پاش چەند مانگێ نوێنەری کۆمەڵە سوێندی داو کۆمیتەی فەیزوڵلا بەگی سەقزی پێ ئەسپێرد را .

دڵسۆزی ئەو سێ برا بە ئەمەگەو خزمانیان هەموو ناوچەی گرتەوەو لە پێك هاتنی کۆماردا ئەوانە بە ئەفسەری (شانازی) هەڵبژێردران ،

له گرتووخانەشدا سالاربوو چەشنی ئازایەتی

نواندکە تەنانەت سەرۆکی دادگاش خۆشی،

دەویست ئەو شێوە دادگاهانە لە قانوونی ئێران‌دا بە (محاکمات صحرائی) ناونراون و قازییەکانی بە گشتی ئەفسەرن و لە هۆدەی بەستراوو بێ ئاگا داری خەڵك و بە نهێنی ئەو حوکمەی کە حکومەت پێیان دەسپێرێ بەبێ زیادو کەم بەکاری دێنێ، سەرەکی دادگای سەقز سەرگورد (عەلی ئەکبەر ضرغام) بوو، کە وەك خەسرەو زوزبەهی شەهید بە کینایە دەناوی دەبا لە دەس پەروەردەکانی سەرلەشکر (ارفع)ە کە نوێنەری ئەنجیلەبرنت‌ویس لە سوپای ئێراندایە ناوبرا پایەو پلەی سەرکەوت‌وبوو بە وەزیری (دارائي) دواجار کە خانە نشین‌کرا وابزانم هەر لە لەندەن مرد، ئینسانێکی ئەو سەردەمە ئارەقخۆرو چەقۆکێش و لوتی مەسلەك برێ جار راست‌بوو، دلێربو بێباکیو فیداکاری سالار ئەوی والێکردبوو کە ئاشکرا گوتی ئەگەر بەدەس خۆم با هەرگیز ئەو شێرە پیاوانەم نەدەکوشت..!! .

شەوی ٢٦ی رەشەمەی ١٣٢٥ی هەتاوی ١٩٤٦ زانین لە شەوە شوومە رەشەکانی مێژووی کوردە لە سەعاتێکی پاش نیوەشەودا ئێمەیان لە خەو هەستاند شەهیدان شێخ ئەمین ئەسعەدی کەس نەزانیو عەلیی ئاغای جوانمەردیو رەسووڵ ئاغای برای کە لە هۆدەکەی ئێمە نووستبوون وەخەبەریان هێنان، ستوانییەك «غرب دفتری» گوتی :

ئەوسێ نەفەرە بۆ سەفەر دەچن و باشمەکیان هەڵگرن و بچنە هۆدەی دەستەی سالار ئێمە حەپەسابووین و دەممان ببوە تاق چرا بەلاّم شەهید شێخ ئەمین گوتی: جەناب ئێمە هەر ئەو رۆژە بەرگی پێشمەرگایەتیمان لەبەرکرد خۆمان بۆ هەموو جۆرە سەفەرێ حازر کردووە لێفەو سەرینەکەی هەڵگرت و گوتی فەرمو .. دوو سەعاتی شەوی مابوو بە چرپەی پای سەربازی چاودێری لە خەو راچڵەکیم .. سەربازەکە دەگریاو فرمێسکی [7] بە گۆنایدا دەهاتە خوار .. پرسیم چییە؟!

گوتی:کوێرېم بۆ شێخ ئەمین، ئەو (١١) یازدە کەسە لە سێدارە دەدەن

ئەو وشەیە وەك خەنجەر کاری کردو تەزوویەك بە لەشمدا هات ، ماوەیەك وشك بووم سەربازەکە گوتی ئێوە مەترسن و دڵخۆشی دامەوە . ! .

خۆڵەمێشی سەر ئاگری مەنگەڵەکەم لاداو کتری‌یەکم لەسەر دانا ، خەو لەچاو تۆراو سەتان بیرو پرسیارو بیرەوەریم کەوتە مێشکەوە ، جگەرەکم داگیرساندو لەدەریای مەنگی خەیاڵدا مەلەم دەکرد. لەرزێکی نهێنی جەرگی دەتەزاندم جگەرەکە بەدەستمەوە دەلەرزی. وەسمان ئاغای حاجی کەریم ئاغا کە لەگەڵ باوکی گیرابوون و لە تەنیشت منەوە نووستبوو پەلامارمدا ، بەلاّم ئەوەندە . خەوەکەی قورس بوو وەخەبەر نەهات (عەلی کەرەمی ژاندارم) کەبەچەکی حوکومەتەوە هاتبووە ریزی حیزب لە خەو هەستاو بەزاراوە کەلهوری‌یەکەی پرسی . داشی چەس؟ چ خەوەرە؟ وەلاّمی من تنۆکی فرمێسك‌بوو کە بەبێ وشەو رستە گشت کارەسانی رادەگەیاند ، هەستاو هاتە لام و (عەبە گوڵێ)ی قەسابی خەبەر کردەوە ، (سەید کامیلی ئیمامی) شاعیری پایە بەرز لەسەر جێگاکەی تلایەوەو وەخەبەرهات . . کۆرمان بەست و بە رژنەی ئەسرین دەدواین ، (١١) سالارە پیاو (١١) قارەمان (١١) هاوڕێی دڵسوتاوی کوردستان (١١) رۆڵەی گیانبازی نیشتمان لە هۆدەکەی زینداندا بێ‌هەست راکشابوون ، نازانم چەندەی مانگ بوو؟ بەلاّم مانگەشەو ولاّتی رووناك کردبووەوە تارمایی مەلایەك و دوو سەرباز دیاری‌دا کەهاتنە پێش. زانیمان مەلاکە (حاجی مەلا غەفوری) ئیمام جومعەیە. لێمان مەعلووم بوو کەبۆ وەسیەت نووسینی شەهیدەکان هاتووە ، دەرگای ژوورەکەمان کرایەوەو (گروهبان حسێن موورادی) کە کوردو خەڵکی (سنە) بوو هاتە ژوور وەك (بی)ی ناو ئاو دەلەرزی لەحیرسی خۆی لێوی دەکرۆشت. رەنگی بەڕووەوە نەمابوو دایە پرمەی گریان ، دەنگی (ئاغای سالار فەرموو) لەنێو دالاّنەکەدا دەنگی دایەوە. سالار بەپلیکانەدا سەرکەوت و زۆری پێ‌نەچوو هاتە خوارێ دەرەجە دارێك‌ودە سەرباز دەوریان گرتبوو لە نێو حەوشەکە دەنگی بەشێوەیەك سامناك بەرزکردەوە فەرمووی : کورینە ئێمە لە رێگای ئازادی و سەر بەخۆیی کوردستان لەسێدارە دەدرێین بەلاّم رۆژی کەلەشێری

هەزار سالێ مریشکێ دێنێ . . . . بەخواتان دەسپێرم. بژی کوردو کوردستان ، بژی پێشەوای ئازیز ، لەوە زیاتر رێگایان نەدا لە حەسار بردیانە دەرێ. دوای ئەو عەولاّ خانی برای و ئەویش بەقارەمانەتیەوە دەنگی هەڵبری درووشمەکانی دووپات کردەوە ، عەولاّخان بەدەست راستی و ئەنگیوەیی و نەترسی و بێ باکی بەناوبانگ بوو . لە هیچ شەرێك دا تا سەرکەوتن لە سەنگەر هەڵنەساوەو گوللەیشی کەمتر بەخەسار چووە ، کاتێ لەدەروازەی زیندان چووە خیابان و تاپای سێدارە نرکەی شێرانەی خەڵکی سەقزی وەخەبەر هێنا . دوای ئەو حەمە خانی برای سالار کەتەمەنی لە سی (۳۰) سالێ تێ نەپەرپبوو لە سوار چاکی و جوان چاکی دا بەناوبانگ بوو ، لەنێو حەوشی زینداندا ئەو شیعرە فارسی یەی خوێندەوە :

**(منصور وارگر جیرندم ... به پای دار**

**مردانه جان بدهم که جهان نیست پایدار**

واتا : «ئەگەر بەوێنەی مەنصووری هەللاج بم بەنە پای سێدارەش پیاوانە گیان دەدەم دەزانم دنیا بۆکەس تاسەر نامێنێ . . . ! چوارەم شەهید عەلی خانی فاتح کوری سەرتیپ و خاوەنی گوندی قەلەندەرو نەتایفەی فەیزوللا بەگی بنە ئامۆزای سالاربوو. پیاوێکی بەزیبك و تیوەشاوەو هێمن و ژیرو خوێندەوارو جیگای رێزی کۆمەلانی خەڵك و جوامێرو بەشەرەف و سووتاوی ئەوینی نیشتمان و ئاشقی خەڵك و هەردو چیای کوردستان بوو . وەلاّمەکانی بەبەر پرسی بێدادگای شا بەرادەیەك مەنتیقی و قانوونی بوو کە گشت لێپرسراوانی مات کردبوو ، لەراستیدا دەولەتی شا هەرگیز نەیتوانی و نەیوێرا تەنانەت لاپەرەیەکیش لەو پرسیارو وەلاّمانە بلاّوبکاتەوە . . چونکە هەمووی بەلگەی لێزانی و ئازایەتی ی ئەو شەهیدانەبوو .

پێنجەم حەمە بەگی فەیزوللاّ بەگی کوری باباخان بەگی یەکشەوەبوو کە لە سوارچاکی و ئازایەتی و ئەنگیوەیی و میوانداری بە ناوبانگ و خۆشەویستی چینی وەرزێرو جوتیارو هەژارو نەویستی دەولەمەندان بوو ، گوندێکی چکۆلەی دە دوازدە مالی هەبوو کە ناوی – قارەوا چووکە بە بەلاّم بەو وەزعەش لە بەر ئازایەتی و بێباکی زۆر جار لەگەڵ بنە مالە دەولەمەندی حاجی تیلیانی نێوانی تێکچووەو ناچاری کردوون کەتەسلیمی بن .

شەشەم : حەسەن خانی فەیزوللاّ بەگی کوری جەلال بەگی ئامۆزای سالارو خاوەنی گوندی – کانی نیاز – لە (۵) پێنج کیلومەتری باکوری شاری سەقزبوو . . ئەم شەهیدە گەرچی ئەندامێکی تێکۆشەرو بەکەڵکی حیزب و زوربەی زۆری پەیام و نامەو خەبەری کۆمیتەی نهێنی سەقز لە مالی ئەو لە گوندەکەیەوە دەگەیشتە مەهاباد بەلاّم وەکو قاو بلاّو بوو لەجیاتی حەسەن خانی فەیزوللاّ بەگی خاوەنی مولکی ( پەچە سوورو کوچە تەلاّ) کە دەولەمەندو بیست هەزار تمەنی ئەو سەردەمەی بەرتیل دابوو ئەو حەسەن خانە کە ئەویش نازناوی – فەیزوللاّ بەگی – و هاو ناوی ئەم بوو چووە تەورێزو خانوویەکی کرێ تاچەندسالێ بەکوردستاندانەهات بۆراستی ئەو دەنگۆیە بەلگەیەك بەدەستەوە نیە بەلاّم لە بەرتیل خۆری و بێویژدانی کاربەدەستانی دەسەلاّت داری ئێرانی بە دووری مەزانن ، وێنەیەکی بەچاو بینراوی خۆم کەبەسەرهاتێکی وایە دەگێرمەوە . دوو مانگێ دوای شەهید بوونی ئەوان منیان بردە زیندانی ورمێ لەوێ کابرایەکی (٦٠) سالەی بەناوی (ئیبراهیم خەلیل) لێبوو کە نزیکەی حەوت مانگ بوو گیرابوو تاوانەکەیشی تەنیا ئەوەبوو کە ناوی ئیبراهیم خەلیلە کە پینەچی و پیرەپیاوێکە بەتاوانی هاوناوی لە گەڵ ئەودا نزیکەی سالێ گیراو بەهەزاو زەحمەت رزگاری بوو . . دەسەلاّت دارانی ئێران چاویان لەبەرتیلەو هەزاران ناحەق سەرکەوتووەو هەزاران حەق پێ شێل کراوە .

حەوتەم ئەحمەد خانی شەجیعی – شەنگە – کوری رەشە خانی تورکیان کەندی لە بنەمالەی فەیزوللاّ بەگی بوو کە باوکی لە نزیکان و خۆشەویستانی سەرداری شەهیدی بۆکان و لە سەرفەرمانی ئەو نازناوی (شجیع السلطنة)ی پێ بەخشرابوو. سوارچاکێکی جوامێرو ئەوەندە جوان چاك و بەرێزبوو کەبە(شەنگە) ناوبانگی دەرچووبوو ، ئەمیش وەك هاورێیانی پیاوانەو کوردانە بەرەوپیری مەرگ چوو ، بە دووپات کردنەوەی دروشمەکانی کۆمەلانی خەڵکی لە خەو راپەراند .

هەشتەمین کەس شێخ ئەمینی ئەسعەدی کەس نەزانی بوو ، شێخ ئەمین لە بنەمالەی شێخانی کەس نەزان کە لە چەند گوندی سەرشیوی سەقز لە ناوشاریش بە نازناوی ئەسعەدی بە ناوبانگی و پیاو ماقوولی وەك حاجی امین الاسلام (صدر العلما) و حاجی (شجیع) یان لێ هەلکەوتووە کە حاجی شەجیع بەئازایەتی و جوامێری و بێباکی و دلێری بە ناوبانگ بووە. براگەورەی شێخ سەدیق شەهیدە شێخ ئەمین دلمەندی یەکی تایبەتی بە خوێندنەوەی کیتب گەلی حقوق و قانون هەبوو بەبیرە تیژەکەی زوربەی قانوونەکانی ئێرانی لەبەربوو، وە تەنانەت لە موحامی – پارێزەر ە کانیش

شارەزاتربوو ، لە رۆژی گیرانمانەوە تا ئەو شەوەی کەشەهیدکرا پێکەوە هاونان بووین‌و ئامۆژگاری‌یە ئازایانەکەی سەبارەت بە تێکۆشان‌و کۆڵنەدان‌و لەسەر داوای مافی رەوا رۆیشتن‌و نەبەزین لە دوا رۆژم‌دا تەئسیرێکی زۆری هەبووە . لەبەر ئازایی‌و لێزانی لە ریزی ئەفسەرانی بە (شانازی) پلەی مایور بوو. سەرگورد ضرغام زۆری خۆش دەویست‌و بەگاڵتەوە پی‌ی دەگوت من (١٥) ساڵ خویندوومەو چەندین ساڵ رەنجم کێشاوە ئێستا سەرگورد واتا مایورم چۆن تۆ بە شەو نووستی‌و بەیانی لە لایەن پێشەواوە بووی بە هاو پلەی‌من ؟ ! شێخ ئەمین لە وەڵام‌دا دەیگوت : هەموو شتێ ئەزمونێکی هەیە فەرموو گەلاڵەیەکی نیزامی بکێشین کە قەلایەك بگرین بزانین بۆچوونی کاممان راسترە ؟ یا جەنابت (١٥)ساڵ‌خویندووتە ئێستا فەرماندەو سەرۆکی مەحکەمەی‌و من موحاکەمە دەکەی‌و دەزانی کەخۆیندەوراییم چەندە ؟ فەرموو هەر لە قانووون‌و یاساکانی نیزامی‌دا چەند ئەفسەر دانیشن‌و پرسیاریان لێ بکەن ؟ ئازایی‌و جەسارەتی شێخ ئەمین بەرادەیەك‌بوو کە ئەفسەرەکانی خستبووە ژێر تەئسیری خۆی‌و حورمەت‌و ریزیان لێ‌دەگرت زۆر جاران دەهاتنە لای‌و قسەیان دەکردو لە حازر جوابی‌و زانایی‌یەکەی سەریان سوور دەما . . ؟ئەو ئەفسەرانەی کەئەو شەهیدانەیان لە زیندانەوە بۆ مەیدانی سێدارەکان دەبردو، ئەو سەربازانەی کە دەوری شارو مەیدانیان دابوو ، ئەو خەڵکانەی کە بە نرکەی سالارە پیاوانی کوردەوە هاتبوونە دەرو لە مەیدانی مەرگدا شاهیدبوون بەگشتی دەگریان. نارەتەی شێخ ئەمین کە دەیگوت بژی کوردو کوردستان . . بژی پێشەوا ، دوژمن سەرنەوی‌یەو ئێمە سەربەرزین گشتیانی مات‌کردبوو گاڵەیان بەمەرگ دەکردو بە سەر بەرزی‌یەوە بەرەو پیری ژیانی هەتا هەتایی دەچوون .

نۆیەمین کەس شێخ سەدیق ئەسعەدی بنە ئامۆزای شێخ‌ئەمین بوو. شێخ سەدیق جوان چاکێکی بالاّ بەرزو برۆ پەیوەست‌و بەشان‌و شکۆو سوار چاك‌و ئەنگێوەو لە ئازایەتی‌دا بەناوبانگ بوو ، ئەویش لەهێزی‌پێشمەرگەی کۆماردا پلەی کاپیتانی بە شانازی هەبوو ، کاتێ کە حوکمی لە سێدارەدانیان پێ راگەیاند گوتبووی داخم ئەوەیە کە بە فێڵ گیرام‌و بە فەرمانی نامەردێکی وەك حەمەرەزا دەکوژرێم ، بەلاّم من‌و هەزارانی وەك من بە قوربانی کوردستانین ئێوەش تاسەر نای خۆن . کاتێ لە نهۆمی سەرەرەوە هێنایانە خوارو هاتە ژوورەکەی ئێمە خوا حافزیمان لێ‌بکات ئەفسەرێ پاڵی پێوەنا کە نەهێڵێ بێتە ژوورەوە ، شێخ سەدیق لێی وەرگەراوەو زللەیەکی لێ‌دا کە پەردەی گوێ‌ی ئازاری دێت‌و چەند رۆژ لە نەخۆشخانە کەوت. سەربازەکان بە دڵی پرلە خۆشەویستیەوە ئاگایان لە کارەسات‌بوو بەلاّم هیچ کامیان دڵیان نەهات دڵی ریبواری رێگای نەهات بشکێنن‌و ئێمەش ئاوێزانی بووین‌و بە هەنیسکی گریانەوە ماچمان دەکردو بە فرمێسکی چاوان رومای قارەمانانەی شێرە پیاوی دوژمن شکێنمان دەشۆری‌یەوە ، سەرگورد ضرغام خۆی هاتە خواری‌و بە پەلەو بە زمانی خۆش جوێی کردینەوەو دەرگای ژوورەکەی ئێمەیان داخست . وەختێ دەگاتە نزیکی مەیدان تایفەی ئەسعەدی بە گریانەوە دەنگ بەرز دەکەنەوە بەلاّم شێرە کوری سەقز وەك هەوری بەسام دەگرمێنێ : کەس بۆ ئێمە نەگری ژیان بەدیلی بایەخی نی‌یە.. رێگامان راست‌و حەقە . . بژی کوردو کوروستان. بژی پێشەوا ! !

دەهەمین کەس عەلی ئاغای جوانمەردی سەرۆك عەشیرەتی گەورکی سەقزبوو . . گەرچی نەخوێندەوارو مەکتەب نەدیووبوو بەلاّم ئینسانێکی ئازاو نەترس‌و دەوڵەمەندو خاوەن قۆناخ‌و قسە زان‌و نوکتە بێژو لە عەجەم بێزاربوو ، تەنانەت رێگای بە چەرچی‌و فەقیری عەجەم نەدەدا کە لە گوندەکانی کاسبی یان سواڵ بکەن ، لە سەر ئەوە گرتیان‌و هێنایانە سەقز لێ‌یان پرسی بۆ ناهێڵێ عەجەم بێتە گوندەکانت ؟ لەوەڵام‌دا گوتی : سواڵکەری عەجەم کە لە لای ئێمە مرد دەڵێن گەنجینەی بە کۆڵەوەبووەو کورد کوشتویەتی منیش هەزار بار قانوونی تارانتان بۆ بێنم بێ لێرە نای سەلمێنن ! جا شەر لە شێف‌و ئاشتی لە خرمان نە دەچمە موڵکی عەجەم نە عەجەمیش بێتە موڵکم. دەیانەوێ پرسیاری دیکەی لێ‌بکەن دەس دەکا بەگیرفانی‌و پێنج سەد تمەن دادەنێ دەڵێن ئەوە چی‌یە ؟ دەڵێ من هەر ئەوەندە فارسیم پێ‌بوو ئیدی زمانی نازانم بەلاّم ئەوە گشت زمانێ دەزانێ‌و وەلاّمیش دەداتەوە ، فەرماندەکە پێ دەکەنێ دەڵێ بەخوا وایە ئافەرین . . .

یازدەهەمین شەهیدی‌سێدارەی بێدادی رژێمی نەگریسی پاشایەتی لە شاری سەربەرزی سەقزی خوێناوی رەسووڵ ئاغای مەحموودی برای عەلیاغای جوانمەردی خاوەنی گوندی میرەدێ کەلەبەینی دووشاری سەقزو بانەهەلکەوتووەولەبەر ئەوەلەوسەردەمەدا رێگاو بانێکی باش نەبوو ئوتومێبیل بۆهاتو چۆ کەم‌و بە تایبەتی لە باران‌پەڵەی پایزەوە کە عەرز تەر دەبوو بەهۆی کوێستانی بە ناوبانگی (کەلیخان) تا مانگی گوڵان رێگای ئوتومێبیل دەبەستراو بۆ رەخنەگرتن لە حکومەتی پەهلەوی دەیانگوت کە بەفر کەوتە عەرز تا بەفر لادەچێ شاری بانە سەر بەخۆیە.
بەو هۆیانەوە گوندی میرەدێ کاروان بەزو چاخانەو شوێنی حەسانەوەو

دوکانی هەبوو بەو بۆنەوە ئاوەدانو قەرەباڵخو مزگەوتو فەقێو مامۆستای ێ بوو. لە سەردەمی تێکۆشانی کۆمەڵەی (ژ . ك)دا گرنگێکی تایبەتی بەو شوێنانە درابوو. گوندی میرەدێ بەهۆی نزیکی بەکوێستانەکانی کەلیخان – کێلەشین – شەك مەیدانی نەکەرۆز – وەزەنەو... و چەند رێگای قاچاخەرێ، کانگای ساتو سەودای گەرمێنو کوێستانو بۆ بڵاوکردنەوەی بیری کوردایەتیو جوڵاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی زۆر بەکەڵكو لەبارو ئێمەش بە باشی کەڵکمان لێ وەرگرت، بە تایبەتی کە رەسوڵ ئاغا پیاوێکی بەزیبكو وەجو وریاو نیشتمانپەرەوەرو فیداکارمان هێنایە ریزی خەباتو تێکوشانی سیاسییەوەو هەر ئەویش عەلیاغای برای، گەرچی براگەورەو سەرۆك عێل بوو بە دابو نەرێتی عەشایەری دەبوو ژێردەستی کاکی بێ، بەڵام بە وشیاری گشت کارەکانی خستە ژێر دەستی خۆیو کاکی هەر بەناو سەرۆکیبوو. سوارچاکی و ولاخناسیو نەنگێوەیی رەسوڵ ئاغا بەناو بانگو زۆر شتی سەیری لێ دەگێڕنەوە.. کاتێ لە پیلکانەکانی بێدادگا هاتە خوارێ و لە حەوشی زیندان بەرەو دەرگا دەرۆیشت سەری هەڵبریو رووی کردە هۆدەکەی ئێمەو گوتی: ئێمە ئەرکی خۆمان بەجێ هێناو رۆیشتین ئێوە دەمێننەوە، تو خوا کوردفرۆش مەبن هەرگیز فارسی رەگەز پەرست بە دۆست مەزانن. بە شەرەف بژین. وەسیەتم هەر ئەوەندەیە، بژی کوردو کوردستان. بژی پێشەوای ئازیز. ! !

خوێنەری خۆشەویست! بەم شێوە یازدە سالارەپیاوی کورد لە شاری نەبەزی سەقز لە سێدارە دران، بەڵام لەسەر حەوزە گەورە، بەرامبەر بە قەڵای سەرداری شەهید حەمە حوسین خانی سەردار، لەپێ دەشتی نەشکێنە لە شاری بۆکانی بووکی رازاوەی موکریانو مەڵبەندی چاو جوانانو دەنگخۆشانو مەقام بێژانیش سێدارەیەك هەڵخرابوو، بۆ کێ؟ بۆ رۆڵەی قارەمانی بەرەی شێر بەگی لە تایفەی فەیزوڵلا بەگی بۆ مایوری بەدەستو بردی هێزی بەرگری، بۆ فەرماندەی لێزانو بەرپرسی دلسۆزی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ناوچەی فەیزوڵلا بەگی بۆکانو هەوشاری پشتیوان بۆ عەلی بەگی شێرزاد ئەو سالارە پیاوەی کە خۆشەویستی هەموو ناسیاوانو جێگای حورمەتی دوژمنانیشیبوو.. خاوەنی گوندی یەکشەوەی بە ناوبانگو قارەمانو بێهاوتای موکوریانبوو.. ئینسانێك کە هەرگیز درۆی نەدەکردو رقی هەر لە درۆزنانو دووڕووان بوو. کاتێ کە «سروان خاکسار» ئەفسەری خەڵکی سنە لەوەختی لێ پرسینەوە دا دەڵێ بۆ ئاڵای کوردستانت بردە یەك شەوەو جێژنێکت بۆ گرت کە هەزاران کەس تێیدا بەشداری کرد؟ لەوەڵامدا گوتبووی: چونکە «کوردم». خاکسار گوتبووی «منیش کوردم». عەلی بەگی شێرزاد شێرانە نرکاندبووی «تۆ کوردنیت، ئەگەر رۆڵەی کوردبای لە تەنیشت منەوە دادەنای. لە دایکت بپرسە بزانە کوردی!؟ شێرزادەی قارەمان شێرانەو ژیرانە ژیاو پاڵەوانانەش لە پای سێدارەی بێداد لە نەتەوەو نیشتمانی ئازیزی ماڵئاوایی کرد... دوژمنانی کورد بە شەهید کردنی ئەوانو دە رۆژێك دوای ئەوانیش بە شەهید کردنی قافڵە سالاری شەهیدان پێشەوای نەمر وایان زانی کە ئاگری شۆڕشی پیرۆز دامرکایەوە... بەڵام رێبوارانی رێگای سووری شەهیدان پاش ساڵو نیوێك بێ دەنگیو تێ روانینو وچان. بە کارامەیی یەکی نوێو گیانێکی بەتین ترەوە هاتنەوە مەیدانو خەبات درێژەی کێشا، سەدانو هەزاران رۆڵەی دیکە لە بێدادگاکاندا گوللەبارانکرانو خوێنی ئاڵیان خاکی پیرۆزی نیشتمانی رەنگاند، قۆچی قوربانی فرە فراوانتر دەبوو، کارەساتەکان لە گۆرانی ئەویندارانو نووسراوەی نووسەرانیو شیعری شاعیراندا رەنگی دایەوەو کامەران گوتی:

**بستێکم نەدی لەم خاکە جوانە**
**خوێناوی کوردی تیا نەرژابێ**
**یا چیایەکی ئەم نیشتمانە**
**هەزاران مێشکی تیا نەپژابێ**
**بۆیە بە تەنیا هەر دڵۆپێ خوێن**
**بۆ شیعرەکانم ئەکەم بە هەوێن..**

**کە هەستیارێکی دیکەش بە کوردیو بەکورتی دەڵێ:**

**خۆین رژا، کەللە پژا، رۆڵە کوژا. خوێن رژان خۆشە کە ئابرو نەرژا. سوپاس بۆ خوداو بۆ رۆڵە خوێن پاکەکانی نەتەوەی کورد کە بە هەزاران قوربانی وێرانی گەلانی ئێران رێژیمی نگریسی (٢٥٠٠) دوو هەزارو پێنج سەد ساڵەی شاهەنشاهیان فەوتاندو خستیانە زبڵدانی مێژووەوە. ئەمرۆش نزیك بە (١٠٠) مانگ واتا ٣٦،٥٠٠ رۆژە کە کوردستانی راپەڕیو قەڵای ئازادیو کانگای هیرای ئازادیخوازانی ئێرانەو رێژیمی گڵاوو بێ دینو خوێن مژی ئاخوندیو نیزامی دیکتاتۆری مەزهەبی نەی توانیوەو ناتوانێ، ورەی رۆڵەی راستە قینەی کوردستان بشکێنی. دڵنیام کە هێزی بەهێزی گەل سەر ئەنجام هێزی رەشی ئاخوندیش دەفەوتێنێ.. ریشەی زوڵمو زۆری دیکتاتۆری ویلایەتی فەقیهی بەلێزانیو فیداکاری دەردێنێ. رەوڕەوەی مێژوو بۆ هیچ دیکتاتۆرێ بەرەو پاش ناگەرێتەوەو رۆژانی رەشی سەدەی ناوەڕاستو حکوومەتی کلێساو ئاخوند نەیان توانیو ناتوانن لەبەر تیشکی زانستو حەق ویستیدا بمێننەوە، ئەتیلاو جەنگیزو هەلاکۆو سەفەوییەکانو پەهلەوییەکانو هێتلەرو مۆسۆلینیو .... لە بەرامبەر جەبری مێژوو وەك بەفری هاوینو دەتوێنەوەو دەبێ بتوێنەوە...**

# زمانێ خۆ بزانە د چەند دێرکێن ڕەخنێدە

میکائیلێ ئیبراهیم

«کو تو کوڕێ زمانەکێ ئاشکرایی واتە ڕەه ددەی ل کویراتیێن ئاخا وەلاتێ خوە، ول کویراتیێن نەتەوا خوە. وکو یراتیێن کویراتیێن دیرۆکا خوە، نڤیسڤانێن فرەنسی‌یێن مەزن بزاڤا وان ل گەل زمانی وەکی بزاڤا وان ل گەل وەلاتی‌یە ب باوەڕیا کوڕی ب بابێ خوە، زمان نە (وەسیلە)یە بەلکو چارەنوسە، ڤێجا گەر نڤیسڤان نەتەوی بیت یان هەزازی[1] بیت، تڤیا وەلاتی (وەلات پەرس)بیت گەر نڤیسڤانەکی مەزن بیت،...»[2].

«زمان وەلاتە»[3] وپێتڤی‌یە ئەم لسەر وێ هندی بەرێ خوە ب دەینە زمانی خوە. ئەگەر چ زمانێ مە نەهاتی‌یە پارزن کرن[4] ژ پەیڤێن بیانیا، ودەستورا زمانی ژی هێشتا گەلەك گەلەك ب سادەو بێ دەستورەکا ڕاستو دورستە، بلی کو پەیڤێن کوردی ژی هێشتا هندی بێژی هەرێن ماین ونەگەهشتینە ناڤ ئێورگەها فەرهەنگا کوردی، کو دێ زۆر زۆر ژوان پەیڤان دێ بزربوون ڤەخۆتو داعویریت، هەر چەندە تۆرەڤانێن مە تا کو یێن مەزن ژی جارنا بەرامبەر پەیڤێن سادە ڕادوستن ونە شێن ب کار بینن‌و ب دەست وان ناکەڤیت، لێ ئەز باوەڕم کو هەمی پەیڤ یێن هەین، وپەیڤ نینە وزمانێ مەدا نەبێت تنێ پەیڤێن نوی نەبن ئەوێن نوی هاتینە سەر دنیایێ ئاخفتنێو زمانێ، مینا ناڤێن ئامێراو ناسوتێن[5] تازە هاتی ڤەدیتن. لێ نەبەس مەێن هەین بەلێ زمانێ مە ژ زمانێن هەرە دولەمەندە، سەیدا فوئاد حەمە خورشید دئەگەرا جوگرافی‌دە کو ئێکە ژ ئەگەرێن مەزن بۆ پەیدابوونا دیالێکیتێن (شێوە) زمانێ کوردی دبێژیت: «هەلو مەرجی خورسکی جێگەی کوردستان‌و باری خوادەی چیای سەخت‌و پێچ‌و پەنای گرانبڕو شاخ‌و دۆلی هەزار بە هەزارو بێ ڕێگاو بانی هەوراز ولێژیی بێ شۆمارو، ڕووباری خورو سەرماو سۆڵەی زستانیش، بە زۆری خێلەکانی لێکدا بڕیوەو، تێکەڵیی هۆزەکانی کەمکردووەتەوە، خۆ لە چەرخە کۆنەکان‌و چەرخەکانی ناوەڕاستدا، ئەوە هەر مەپرسە، چونکە ئەو سەردەمانە دانیشتوانی کوردستان تێکەڵی وهاودەنگی یان نەبووە. چ - لێکفێر بوونی بیروڕاو ڕۆشنبیری، جا ئەو لێکدا براوی وتەری تێکەڵنەبوونە، بەرە بەرە بوونە هۆی ڕەگداکوتانی ئەو جیاوازیە نە شێوەی ئاخافتنی ناوچەکاندا هەیە. بە ووتنێکی ڕونتر، بە کوردی. ئە کە ئەو دابڕکاریە جوگرافی کردە، لە زۆر کردن وجۆراو جۆرکر دیالێکتەکانی ئەم زمانەدا جیێ دەستیان دیارە»[6].

لە پاشان ئەلێ «ئەم کونجگیریە (عزلة) جوگرافیایی‌یە ئەوەی بەش زمانی کوردیی پاراست‌و نەیهێشت زمانە بێگانە کانیتر کاری تێبکەن‌و ب کەن، بەم جۆرە بە خاوێنی خۆی مایەوەو بوو بە یەکێ لە زمانە ئ کونەکانی خۆر هەڵاتی ناوەڕاست، کە تا ئەمڕۆش ووشەو ڕستەی ئاریی پیشان دەدات، کە کورد هەموو ڕۆژێ بە کاریان دێنن، کەچی زە فارسی لە دێر زەمانەوە دەستی لێهەلگرتوون»[7].

ڤێجا گەر پەیدا بوونا دیالێکتا زیان ب زمانی نخست بیت، بەلێ لا ب وج‌و سود ژی یا ب زمانی گەهاندی، لێ یێ من دڤێت ب هاڤێژمە ئەو وجا سەیدای خویا کری، ئەوە کو ئەڤ ئەگەر نەبەس زە پاراستی‌یە، لێ بوویە ئەگەرەك بۆ زۆر بوونا پەیڤان‌و دەولەمەندیا زمێ پەیڤان ب ڕادەکێ کو بێژن زمانێ مە بەرامبەر زمانێن هەرە دونەمە ڕادوەستیت ژ لایێ پەیڤان.

بەلێ جهێ داخێیە، کو ئەڤ دەولەمەندی‌یە چ ناگەهینیت. گ نەهێتە خرڤەکرن، لەو خرڤەکرن‌و ڤەکۆلین ل بارا وان پەیڤان ئەرکە پیرۆزە، ژبەر کو ڤەژینا پەیڤانێ وینەکە ژ ڤەژینامە، تا وەکو مە بەلگە ڤەژین‌و دەولەمەندیێ هەبیت‌و دیرۆکا مە ڤەژیت.

لەو کارێ سەیدا ئەمینێ ئوسمان کارەك پیرۆزە وپڕبهایە ژبۆ زمان‌و پەیڤ کوردی. وکێم کەس هەست ب وێ کارێ دکەن. وکێم ژی ژ تۆرەڤانێن

ـسەر وان بابەتان دنڤیسن، لیٚ تنیٚ چەندین بابەتن کو ب هژمارا تلیێن دەستێ نە. بەس یێن ب ڤی کاری رادبن نەمەرجە چەوتی‌یێ نەکەن، لیٚگەر چەوتی نەبیت گەلەك جارا راستی نابیت، بەلیٚ مەرجە کو ئەو دویرکەڤیت ژ ئەزئەزین خوە پەرستنیٚ بۆ هەر شیٚوەکی ژ شیٚویٚن زمانیٚ کوردی‌و تڤیا کاریٚ وی نەمازو پاك بیت بۆ زمانیٚ کوردی، دویر ژ ئەز ئەزینیٚ بیت.

سەیدا ئەمینی دوو بابەت بەلاڤە کربوون، ژ بن ناڤیٚ «زمانیٚ خوبزانە» بەت دگۆڤارا کاروان هژمارە (١٢)دا، ویادی ژی د «دەنگی‌مە»دا هژمارە (٣)، کو هەردووك لسەر زمانی‌نە، چەند پەیڤێن دەست نیشان کرین‌و ـسەر ڤەکۆلی‌یە، هەرچەندە بابەتیٚ ویٚ تیٚکەلە نەژ رەهە پەیڤان ئانکو «etymological» وواتایا پەیڤان‌و جارنا ریٚزمان‌و جارنا پەیڤێن ...سەن... تد. دوان هەردوو بابەتان‌دە چەند چەوتی دیاربوون ژمن‌را، ومن ژی ژدویڤ شیانا خوە هەول دای راستڤەکەم، و بەرسڤاوان ڤەدەم.

## ...ـعتیٚ یەکی[8]

### ١ - ب کیٚر

سەیدا دبیٚژیت پەیڤا (کیٚر) ژ (کار) هاتی‌یە، راستە (گەلەك جارا «ا - A»، ب «ئیٚ - e» تیٚ گوهەرتن)[9]، مینا (گارس - گیٚرس، ئاش - ئیٚش... تد) بەلیٚ ئەز باوەرم کو ئەڤ پەیڤا (کیٚر) ژ (کار) نەهاتی‌یە، ژبەر کو ئەگەر ئەم بەکویری ژ واتایا ئەڤیٚ پەیڤیٚ ب چینە خوار، دیٚ بینین کو ئەڤ پەیڤا (کیٚر - ب کیٚر) نە ئیٚکە ل گەل (کار - بکار)، (بکار) ئانکو (ستعمل). لیٚ (بکیٚر) ئانکو (بکەلك)، وئەڤ پەیڤ دجهیٚ خوە دە ... سەگەو دورستەو پیٚتڤی ناکەت ب کەینە کار، یان دانین هەردووك یەکن، وئەڤ هەردوو هەڤوکیٚن ژیٚری واتا وان خوەیا دبی: -

- ئەڤ کەلەمە ب کیٚر من نایێ.
- ئەز ئەڤیٚ کەلەمیٚ بکار ناهینم.

### ٢ - چۆن - چەوا

(چۆن، چەوا، چ تۆڤ، چ تۆر، کو توڤ - کو) ژڤان پەیڤان هەمیا کو هەمی ئیٚك واتایێ ددەن، گشت سەیدای یێن هیٚلاین‌و تنیٚ (کو) پێ گرتی‌و ئەڤ ب بنەجهتر دادنیٚت ژیٚن دی، وپیٚتڤی دکەت ئەڤ ب کار بهیٚت، ئەموژی ژبەر سیٚ ئەگەرا: یەك - (دبیٚژیت) یابەلاڤە، دوو - بۆ یەك بوونا زمانیٚ کوردی، کو خالا ئیٚکیٚ ئەگەرا وی‌یە، سیٚ - دزمانیٚ هندۆ ئۆرپایی‌دە بکار دهیٚت. لیٚگەر تەماشا کەین نە هند بەلاڤەو یێن دی ژی دبەلاڤن‌و پترژویٚ، لیٚ بەلاڤەیا پەیڤیٚ نە مەرجە تاکو ئەم ویٚ پەیڤیٚ بتنیٚ بکەینە ناڤ فەرهەنگا کوردی، لیٚ دبیت پەیڤ نە بەلاڤە بیت، بەس رەسەن بیت‌و ب دورستی بکار هاتبیت، ئەم دیٚ بکارهینین، وهەر چەند پەیڤ زۆر بن د ئیٚك واتایێ دە ئەویٚ دەولەمەندیا زمانیٚ کوردی نیشا ددە، ئو ئیٚك بوونا زمانیٚ کوردی نە دفرەدان‌و هاڤیٚتنا پەیڤان دایە. ونەدسادە کرنا زمانی کوردی دایە، لیٚ دهەست ب جانیٚ کوردیاتی‌یە. ئو هەبوون‌و نەبوونا ئەڤ پەیڤیٚن کوردی دناڤ زمانیٚن هندۆ ئۆرپایی دە نە ئەگەرە بۆ خوە پیٚڤە گرتنیٚ دڤەمان‌و نەمان وراست‌و چەوتیا پەیڤیٚن کوردی. ب تایبەتی سەیدای دبابەتا خوە یا یەکیٚ گەلە خوە ب زمانیٚ هندۆ ئۆرپایی‌دە ڤەگرتیە بۆ بنەجهکرنا پەیڤان.

### ٣ - دڤیٚت

سەیدا درستەکی‌دە دبیٚژیت: (بادینی‌و کرمانج تیٚکرا...)، بادینی کینەو کرمانج کینە، ما بادینی نە کورمانجن.

پاش دبیٚژیت (مینا دچەند جهیٚ دە): کو پیٚدڤیٚت ئەم پیٚتڤی - خوشتڤی... هتد) ب نڤیسین (خوشدڤی)، پیٚدڤی... تد) وڤەگەرینەڤە سەر رەهە پەیڤا ویٚ، بەلیٚ سەیدای ژبیر کریە کو زمانیٚ کوردی ژی مینا هەر زمانەکیٚ جیهانی شلکاتی یاتیٚدا هەی، وگەلەك جارا پیتین پەیڤان کیٚم‌و زیدە دبن‌و دەنگ دهیٚنە گوهرین، بەلیٚ، راستە، تڤیا ئەم رەهە پەیڤیٚ بزانین. بەلیٚ بۆ خواندنی‌و نڤیسینیٚ پیتان دانیٚنەڤەو راکەین ژ دویڤ پیٚتڤی بوونی. نەکو ئەگەر وەسا نەبیت تڤیا ئەم زۆر بەرهەمیٚ کوردی فرەدەین ئەگەر ئەڤرۆ ژی نەهاڤیٚن ژبەرکو ژ هزریٚن مە ئەڤ دمینن بەلیٚ سبە (ئانکو نەوەیێ داهاتی دیٚ ژبیرکەن.

### میٚر - زەلام

سەیدا دبیٚژیت (میٚر) ب مەعنا (زوج) دهیٚت‌و ئەم ب چەوتی ب واتایا زەلام (پیاو) دهینین، بەلیٚ راستە بواتایا (زوج) دهیٚت، لیٚ دوی دەمی ژی‌دا، بواتایا (زەلام) ژی دهیٚت. هندەك جارا، ئو نە چەوتە، وبناسیٚت نەزانینا مە نینە، لیٚ بناسیٚت زمانیٚ کوردی‌یە ئەگەر سەیدای باڤیٚت ب کەتە بناسیٚ ئیٚکی، و ئەڤە ئیٚکە ژ ڤاڤیٚریٚن ئەڤیٚ پەیڤیٚ‌و وەسا ژی بەلاڤە ل سەرانسەریٚ کوردستانیٚ‌و هەمی ژی هەر چەوت نینە.

### هار

سەیدا ئەڤیٚ پەیڤیٚ ب چەوت دادنیٚت دەما ئەم هەڤ‌ئیٚك ب کەین دگەل پەیڤا (دژوار)دا، و ب پەیڤەکا بنە جهـ دا نانیٚت، ودبیٚژیت: (هاری) نەخۆشیەکا سەیایە (سەگایە)، و (هار) دادنیٚتە بەرامبەر پەیڤا (مکلوب) یا عەرەبی، بەلیٚ نەخۆشیا سەیا ناچیتە پیڤازیٚ وبیبەریٚ دەدا کورمانج دبیٚژن: (ئەڤ پیڤازە چەندیٚ هارە) ئانکو دژوارە. لیٚ پیٚتڤی ناکەت ئەم ب خوە لبەر خوە بەرزەکەین‌و سەریٚ ریٚکا ل خوە وندا کەین.

**هوی - فێر**

سەیدا ئەمینێ ئوسمان پەیڤا (هوی) ب واتاو (هەڤ ئیك)، یا (فێر) دانانێت و ب چەوتی دادنێت، لێ ئەڤ ب دورستی ب واتا فێر دهێت، ب گروڤا دەقا شیرەتا خانی‌یێ نەمر کو ژ زاروکێن کوردا را گوتی‌یە، دەما زاروێن کورد ژ خوە مێهڤان کرینە. وئەڤ پەیڤ ب وێ واتایێ یێ هینای، دەما دبێژێت:

«... پشترا هونێ هینی (فێری) حەژێکرنا دیا مە گشان (هەمیان) کوردستانێ ب بن؛ یا دوویێ، ب خەبتن، ئیرۆ ژ بۆ هینبونێ (فێربونێ) ژ بۆ زانینێ ب خەبتن داکو حالێ دنێ بزانن ب پێشڤە هەرن ب بن مرۆڤ، ب‌بن هێژا، ب‌بن سەربەست، ب‌بن ئنسان (......)»[١٠] ئەم ژی پەیڤان ژ دویڤ دەقێن تورێ کەڤن‌و ژ دویڤ دەقێن فلکلوری دێ پارزوینین‌و نە ژخوەڤە، لەو ئەڤێ پەیڤێ گروڤێن کەڤن ل‌سەر هەنە کو یا راستە، تا وەکو ژکەڤندا ب وێ واتایێ هاتبیت، تڤیا راست بیت.

**پیر**

دڤردە سەیدای دیسان هزرێن خوە ژخوە شێواندیە وئینان‌و برنەکا ب‌وج کریە، دەما دبێژی: (پیرەمێر ئان پیرەژن) بو نیشاندانا ژی درێژی‌یێ‌یە. لێ دڤردە ل خوە وەردگەرێت ئانکو (ژمەرا) وەردگەرێت، دبێژیت دبنیاتدا (پیر) دهیتە گوتن بۆ مرۆڤەکی خودان جهوپایە بلند، وبۆ ژی درێژی‌یێ (کال) دانایە. بەلێ سەیدای نیڤەك پەیڤ ل مە گوهرین‌و ڤاژی کرن، لێ بەرەڤاژی ژی کرن، و دڤردە، وی خوەب (دبنیاتدا) ڤەگرتیە مینا دگەلە جهان دە، بەلێ گەر وەسابیت دڤیا ئەم بەلکو (مرۆڤاتی) هەمی ڤەگەریتەڤە سەر چاخێن ئێکێ بۆ فێر بوونا ئاخڤتنێ. بەلێ پەیڤ زیندەوەرە، بچویکە، دبیتە لاو، پێدگەهیت‌و دبیت رۆژەکێ دەما کار پێ نەما ب مریت. بلی وێ چەندێ ژی پایەداری د پیر بونێ داهەیە. ژبەرکو دگەل سالێن درێژ زۆرزان دبیت. وپاشی ژی پەیڤا (کال) نە پەیڤەکا رەسەنەو یاهاتی ناڤ زمانێ مەو کراسێ کوردی کریە بەرخوە، ود رەسە دە (کهل) ا عەربی‌یە.

**بابەتێ دوویێ**

**دیرۆك**

سەیدا دبێژیت ئەڤ پەیڤا (دیرۆك) مەعنا جهی‌و قوناغێ ددەت، لەو ئەو پەیڤا مێژوو ب بنەجهتر دادنێت، بەلێ پەیڤا هە واتە جهی‌و قوناغێ نادەت، وئەگەر ژرەهە پەیڤا وێ ب گەرین دێ بینین ئەڤ پەیڤ پێکهاتی یە ژ دوو پەیڤان: دویر (دیر) + (رۆ + ك) رۆژ

لێ ئەڤ پەیڤا لێکدایی ب واتا رۆژێن دویر یان رۆژێن چویی ودویر بوویی ژئەڤرۆ ددەت، ئو پیتا (ر – R) ژهەردوو پەیڤان گەهشتینە هەڤ، ویەك ژوان پیتان هاتی‌یە داعویران ژبۆی سڤکیا زمانی، لێ ژڤێرە ب مەعنا مێژوو دهێتەڤە لەو ئەم دکارین هەردوو پەیڤان ب‌کار بینین بۆ دەولەمەندیا زمانی.

**بەش**

سەیدا دبێژیت: (مەعنا «پشك دگەهینیت دسۆرانی‌دە بەلێ ب‌کرمانجی: (بەق) ڤەکری دگەهینیت). دڤردە مینا دبابەتا خوە یا یەکێ ل‌بەرخوە دشێوینی‌و دبێژی (دسۆرانی... بە کرمانجی) و دبابەتا یەکێ دە گوتیە (بادینی‌و کرمانج)، لێ نزانم مەعنا کورمانج ب چ تێگەهشتیە، گەر سۆرانی کرمانج نەبن، وبادینی کرمانج نەبن، پاکی ماڤە ل کوردستانا عیراقێ، مانە بابەتێ وی ل‌سەر زمانێ کوردی‌یە!؟. پشتێ هنگی ژی کورمانجێن ژێری ب ناڤێ سۆرانی دبەن، ونزانیت دبێژنە دەڤەرا هەولێرێ سۆران ژدویڤ میرگەها سۆران. ئو هەر چەندە کو گومان تێدا نیە کو سەیدای (کورمانج) دڤێ بابەتی‌دە ئانکو بابەتا دوویێ یا هینای ب گەرەکا کورمانجێن ژۆری، ئەڤە ژی بلی چەوتیا ب کار هیناناوی، وێ هندێ دگەهینیت کو کورمانجێن ژێری ب کورد دانایێت ژدویڤ هەڤوکاوی (بەلێ ب کرمانجی) ژبەرکو سەیدا پێتڤی دکەت ئەم باتی (بەش) بێژین (پشك) ژبەرکو ژدەڤ وی (سورانی) کورمانجیا ژێری نەکوردی‌یە. وژبیرکریە کو هەر پەیڤەك دبیت چەند مەعنایەکێ ب دەت، وەکی دهەر زمانەکێ جیهانی دە، هەر وەسا زۆربینا پەیڤان دئێك واتایێ دە سەربلندیا زمانی نیشان ددەت.

**بالاڤ**

سەیدا دبێژیت: ئەڤ پەیڤ دکەڤن‌دە ژ (ئاش) هاتی‌یە دارشتن، بەلێ پەیڤا (بالاڤ) دوو پەیڤی‌یەو پێکهاتی‌یە ژ بالا + ئاڤ

نەکو مینا سەیدا دبێژیت ژ: بال + ئاڤ

ژبۆ سڤکیا سەر زمانی یەك ژپیتا (ئا – A) رابوویە، دەما هەردوو پەیڤا ب هەڤ گەهشتینە، پەیڤا (بالا) ب واتا بلند دهێت. دڤێرەدە ب واتا سەرەڤە دهێت، کو دبیتە سەرەڤەیا ئاڤێ یان ژۆرا ئاڤێ (چ جۆ، چ کانی) ژبەر پاڤژیا ئاڤێ کورد دچن وێرێ ئاڤێ دهێنن‌وجلکا د شۆن، لێ دڤردە ئەڤ پەیڤە واتا جه- ددەت، ڤیجا بورینا چاخی بسەرداو پڕ ب کار هینانا ئەڤێ پەیڤێ ئەڤ ناڤ دایێ کو مەعنا (کۆلێ – کەلێ) یان جلك شوشتنێ ددەت، کو نە دجهێ خوەدایەو ب چەوتی ب‌کار دهێت، بەلێ ئەم نابیت

ژ بیرکەین کو هەر پەیڤەك، ل هەر چاخەکیٚ و ل هەر جهەکیٚ خو دگەل ویٚ چاخیٚ وی جهی دگونجینیت. ژ دویڤ پێتڤیا ژیانا مرۆڤی و ژ دویڤ ژیانا پەیڤیٚ، ژبەرکو پەیڤ ژی زیندەوەرەکە مینا هەر زیندەوەرەکیٚ دی. وخوە ل گەل ژینواریٚ خوە دگونجینیت نەکوو نازێت و دیٚ مریت و بیرڤە چۆن دیٚ داعویریت. لیٚ ئەگەر ئەڤ پێکهاتی بیت ژ:

بال + ئاڤ

ئەڤە مەعنا تەنشت ئاڤیٚ ددەتەڤە یان لیڤێن ئاڤی.

**طەنگاڤ**

**سەیدا دبێژیت ئەڤ پەیڤە ژی ژ (ئاش) هاتیە دارشتن. بەلیٚ ئەڤ پەیڤە پێکهاتی یە ژ:**

**تەنگ + گاڤ**

**نەکو ژ:**

**طەنك + ئاڤ**

**پەیڤا ئێکیٚ (تەنگ) ب مەعنا تەسك دهێت کو دڤێردە پر ب جهب مەعنا (کێم) هاتیە. پەیڤا دوویٚ ژی ب مەعنا (دەم) یان چاخ یا هاتی. و (تەنگاڤ) دهێتە گۆتن بۆ کێم وەختی‌یٚ. لیٚ دهەردوو پەیڤێن لێکدایی‌دە پیتەکا (گ – 1)** دهێتە داعویران ددەمیٚ نڤیسینیدە. بەلیٚ دەمیٚ پەیڤیٚ دزاراڤینین (نلفظها) هەردووك دهێنە گۆتن. دبێژن:

ئەز تەنگاڤم من وەخت نینە.

یان:

هەرە گاڤەکادی وەرەڤە.

ئەگە ئەڤ پێك بێت ژ:

تەنگ + ئاڤ

تڤیا هنگی تەنگە ئاڤ (تەنگە + ئاڤ) بیت. کو ب واتا (مضیق) دهێت دڤێرەدە، لیٚ ئەگەر بێت و بێژین یا هاتی‌یە سڤك کرن. وپەیڤ ژ باتی سیٚ پرتان یا بوویە دوو. وهەردوو پیتێن دەنگدار (ە – e) و (ئا – A) بکەینە ئەگەر ب پێك گەهشتنا وانڤە. ژبەرکو دوو دەنگدار نابیت ژدویڤ هەبن. لیٚ دڤێردە واتایا پەیڤیٚ دهێتە گوهرین و واتایا سەرەڤە ددەت (کێم وەختی‌ی). لیٚ ب کارهینانا پیتا (ط) یا عەرەبی ل شوینا (ت – T) یا کوردی تشتەك نوی‌یەو دزمانیٚ مەدە نینە. ئو بتنیٚ کێمەك ژ دەڤەرا دهۆکیٚ ب کار دهینن. لیٚ پێدڤێت تۆرەڤان ب بیتە بەرەڤانیٚ پەیڤا کوردی ژ تێك چۆنیٚ. نەکو ژیٚ بگەرێت ئەوێن رەوشەنبیریا بیانی کار تێکری وێنا ئەویٚ پەیڤیٚ ب خیچینن و ب شێلونین. وسەیدای ل چەندین جها ئەڤ پیت ب کار ئینایەو ب خوە ژی دکەڤیتە هەڤ دژی‌یٚ د گەل بیرو هزرێن خوەدە. دەما درەهە پەیڤا (کەلەم) قەلەم دگەریت دبێژیت: پیتا (ق) دبنیت‌دە دزمانیٚ مەدە نینە. لیٚ ئەو ب خوە پیتا (ض) یا عەرەبی ب کار دهینیت هەر چەندە پیتا (ق) پتر بەلاڤە وپیتا (ض) تنیٚ ل دەڤەرا دهۆکیٚ ب‌کار دهێت. ئەگەر چ هەبوون و نەبوون پیتا (ق) دزمانیٚ مەدە گێچەڵەك (ئاریشەکا) کەڤنە. تا نهو ژی هەڤ دژی‌یە مەی.

**٥ – دان و سطاندن**

ئەڤ پەیڤا پێکهاتی ژدوو پەیڤێن (معطوف) ـ سە نیت. سەیدای دانایە کو ل شوینا گێنگەشە یان (مناقشە) ب‌کاربیت. بە ... سە. گێنگەشە نە (مناقشە) یە مینا سەیدا دبێژی. بەلیٚ ژ دوو ... ئەوە. بەلکو مەعنا (اخذو عطاء) ددەت. وهەر چەندە پەیڤا (کێشە کێش) ژی بۆ ویٚ و تنیٚ دهێتە کرین. بەلیٚ ئەم دکاری پەیڤا (گفت و گۆ) یا کرمانجیا ژێری ب کاربینین و یا بەلاڤە ژی د ناڤ تۆژیٚ مەدا وجزیری ژی ل چەند جهەک ب کار هینای:

**سرزا کەلامیٚ ئەقدەسی**

**دەم دەم دلبسیٚ ئەنفوسی**

**تێتن (تنزل) ل حسی**

**نە ب گوفتوگۆیێ قصەدا[11]**

یان دبێژی:

**گفتوگۆیێ مەعرفەت چەندی «مەلا» پەیدا بکی**

**گەوهەرا مەعرفەتی نگهتیٚ کەس ب‌خرەدا[12]**

لیٚ ئەم بچین ب چەوتی

راست ڤەکەین داکو کورد ب بنە دوو زمان و... ئەڤە ژی ب هەمی رەنگاڤە مە نەڤێت و نهێنین. لیٚ مە دڤێت هەردوو شێوە لیٚ مەبن ئەکو ئێك.

**مەبەست**

دڤێرەدە دیسان سۆرانیا (کو گەرەکاوی کرمانجیا ژێری‌یە) ب کورد دانانێت و دبێژیت: (پەیڤا مەبەست ب کرمانجی (گەرەکاوی کرمانجیا ژۆری‌یە) ئانکو (مەگرێدا). لیٚ پەیڤا کورمانج کوردان هەمین ڤەدگریت نەکو بەس کورمانجیا ژۆری. لیٚ راستە (مەبەست) مەگرێد دگەهینیت. گەر ئەم (مە) ب‌کەینە رالناڤ وجوداکەین ل نڤیسینیٚ ژ (بەست). لیٚ گەر هەردوو ژی ب گەهنە ئێك (مە) نە رالناڤەو دبیتە پرچەك ژ پەیڤیٚ و خوا ڤاڤێر دکەت دگەل مەبەستا سەیدای‌دە. لیٚ ئەڤ پەیڤ دکرمانجیا ژێری‌دە:

مەبەست = گەرەك (قصد)

ژڤیێ هندیێ ئەڤ پەیڤە هاتی‌یە، لەو پر دجهیێ خوە دایە ب کارهینانا ئەڤیێ پەیڤیێ، وئەڤ پەیڤ نە هەڤئێکە دگەل پەیڤا (ئارمانج) (داخواز) وەکی کو سەیدای هەڤئێك کرینە، ژبەرکو (ئارمانج) (هدف) دگەهینیتو (داخواز) (أمل) دگەهینیت. بژلویێ چەندی ژی دڤێت ئەم چ جارا ژبیرنەکەین کو کورد تنیێ کورمانجیێ ژێری یان ژۆری نینە، لیێ کورد کورمانجێن ژێری ژۆرینە بهەڤ دوورا، لیێ مە دڤێت ئێك بوونا زمانیێ کوردی نەدوو زمانو هەرئێك ژخوەرا

**بسپور**

سەیدا دبێژیت: من یێ دیتی مە (بسور)د نڤیسن بۆ نیشانا «شارەزا» ئەڤە ژی خەلەتیەکا دیارە، ئەم دبێژنە بچوکیێ ژ «سنێل – مراهق» بچوکتر بسپورە، بچوکەکیێ بسپورە. ئانکو ژێك جودا دکەت، دەست پێکری تێدگەهینیت، بەلیێ بۆ مرۆڤەکیێ تێگەهشتی وزاناو شارەزا من گوە لیێ نەبوویە ل ناڤ کرمانجا کەسیێ بسپور بۆ ویێ مەعنایێ گوتبیت».

ب راستی ئەڤ پەیڤ ب دورستی هاتی ب کارهینان لیێ راستە واتایا ژبەك جوداکرنیێ دگەهینیت، کرمانج ب مشە ژی دکارینن، بەلیێ گونەە نە ژپەیڤی‌یە گەر تە گوە لیێ نە ب بیت، ونە دورستە ئەم گوە لیێ نەبونا ئێکی یان (کەسانەکی) بکەینە بنگەە بۆ گشتی، لیێ دناڤ هۆزێن کورد ئەڤ بەلاڤە، هرکی[١] دبێژن:

ئەسعەد بسپوریێ پەزی‌یە.

ئانکو ژێکڤە دکەتو دناسیت، لیێ ئەو پسپورا بۆ بچویکان ژی بکار دهێت هەریا ژڤی هاتی، ئانکو جودا دکەت مینا سەیدا دبێژی.

**شڤان**

دبارا پەیڤا شڤان سەیدا دبێژیت «شڤانیێ پەزی (ژڤان)ە بویە شڤان». لیێ سەیدا جەگەر خوین دبارا ویێ پەیڤیێ دبێژیت «درستە کو «شەڤ – ڤان» یێ ژبەرکو پەز بێتر بەشەڤ دچێرینن، وەکە شەرڤان لیێ دوو (ڤ) ب هەڤرا ب جڤن یەك تیێ هاڤێتن[١٣].

لیێ ئەز بێژم پەیڤا شڤان یاهاتی ژ «شیڤ – شڤ – (ش – si) + ڤان» کو هەتا نهۆ کورمانجێن ژێری گەلە جار دنڤیسن (شیڤان) لیێ ئەڤ (ش – شڤ) د گۆکا خوەدا پەز دگەهینیت، دزمانیێ ئاری Sheep –Scha) بەلاڤەو هەر واتا پەز دگەهینیت[١٤] ئەز بێژم هەر ژڤیێ یاهاتی: هەرچەندە (ئەز بێژم) گومان تێدایە، لیێ ئەز باوەرم کو ئەڤ پەیڤ هۆزین کوردی ب واتایەکا نێزیك ژپەز بکار دهینن.

**وضع حال**

وەکی سەیدا دبێژیت: «ئەڤ هەردوو پەیڤە گەلە دبەلاڤن» ول شوینا وان پەیڤا (کراس) بکارهینایە، وەکی دهەڤوکەکیێدە دبێژیت: –

خودیێ کەسیێ نە ئێخیتە وی کراسی(وضعی – حالی بەس پەیڤا کراس دڤردە ئیدیۆمەو نەپەیڤەکیێ دجهدایە بەلیێ مە دوو پەیڤێندی ێن هەین (سەروبەرو پەرگال)

دبێژن:

– سەرو بەریێ مە گەلە نەخۆشە.

– پەرگالیێ مە نەخۆشە.

یان – کەتینە کراسەکیێ نەخۆشدە

**مجانا**

سەیدای پەیڤا (بەلاش) بەرامبەرئەڤیێ هەدانایە، کو گومان تێدانینە. لیێ پشتی هنگی (هەروە) هەڤ ئێك مەعنا کریە، وهەڤوکەکا کرمانجیا لسەر ئینایە، دبێژیت: (ماخۆ نە دیێ ب هەروە دەتەمن) لیێ «هەروە» نە بەلاشە بەلیێ رەسەنا ویێ پەیڤیێ (هەروەسا)یە، وگەلە جارا (سا) رادبیت لەسەر «هەر وەسا» و دهێتە فرەدان یان ژی دبێژن (هەرهۆ) ئانکو (هەر هۆسا) لیێ دهێتن ب مەعنا (هکذا) و مەعنا (مجازیە) ئانکو بنڤاڤکی‌یە. لیێ ئەویێ هەڤوکیێ (ب) یا پێش هەروە زێدەیەو دەستکارە، لیێ جارێن هۆسا (مبالغة) فۆرت دزمانیدە، بەرا ل زمانی ددەتو دکوتیت (دڤوتیت).

**بەرهەم**

سەیدا دبێژیت: (بەر) ب کار ب هینین ژباتی (بەرهەم ژبەرکو (بەرهەم) فارسیە، لیێ سەیدا دڤردە دکەڤیتەڤە هەڤ دژیێ دگەل خوەدا، دەما ل گۆتارا خوەدا ئەوا ل کاروان هاتی بەلاڤەکرن، دەما گەلە پەیڤان دبەتەڤە سەر نژادیێ ئاری: هەر چەندە ل ڤێرە راستە کو نەبریەڤە سەر نژادی، بەلیێ هەرچیێ پەیڤیێ مە دوو ژیێ هەبن ئێك نەلیێ بیانی‌یە، بلی ویێ چەندیێ ژی، پەیڤا (بەر) ب مەعنا (ثمر) دهێتو بەرهەم ب مەعنا (انتاج) دهێتو وەسا ژی پوختەترە.

**بەرخۆر**

سەیدا دبێژیت (بەرخۆر ل شوینا (ضمان) دورستە بەلیێ جهیێ ضمان ناڤەگریتو سەریێ نەئێشیت پێتڤی دەسمالیێ نینە، لیێ بۆ ئەم ب خوە لبەر خوە بەرزەکەین ژبەرکو مینا سەیدای یەکەم جار دبێژیت: (بەرخۆر) ئانکو ئەوەیێ بەری دخۆت، ڤیجا هەر ویێ هندیێ ژی دگەهینیتو چ کلكو دویلکا ژی بۆچیێ نەکەین.

**بخودا بکەڤیت**

سەیدا دبێژی: مەعنا (برۆخیێ) (یسقط) دگەهینیت ، ئەریێ ئەڤ

چەندە ياراستە ، بەلىٚ نە پەيڤە ، لىٚ ئيديومە ومەعنا وىٚ ، داڤىٚ دانىٚيەڤە (بۆ خەلكىٚ)و ب خوە پێرا بكەڤى .

**بەرخو**

راستە مينا سەيدا دبێژى : «بۆ دياركرنا مرۆڤەكىٚ (أناني) ئانكو حەژ ل مەسلەحەتا خو بتنىٚ دكەت» . لىٚ ئەڤەژى ئيديومە ، كورمانج دبێژن ، نەڤشىٚ بەرىٚ خوەيە ، وژڤىٚ ياهاتى . لىٚ ئەزين ئانكو (أنانى) ، و(ئەزئەزين) ئانكو (أنانية) . هۆزانڤان دبێژيت[15] .

ئەز ئەزينىٚ ئەم ڤەهێلاين

ئاخ ژ دەردىٚ ئەز ئەزينىٚ

ئەز ئەزينا خانى گۆتى

دچيروكا مەمو زينىٚ

هەروەسا دبێژيت (ئەزين‌و ئەڤين)[16]

**ددان گەروى**

راستە مينا دبێژى : ب مەعنا (لئيم) دهێت ، لىٚ ئەڤەژى ئيديۆمەو نەپەيڤەك رەسەنە ، وپەيڤا (چلێس) ل شونا وىٚ تىٚ گۆتن .

**سالوخ‌دان**

(سالوخ) سەيداى ب مەعنا (وصف) دانايە ، ئەڤەژى نەراستە . ژبەركو ب مەعنا خەبەر دهێت[17] ، و(وەصف) كرمانج دبێژنىٚ «پەسن» .

**ساخلەت**

سەيداى ل جهىٚ (صفة) دانايە ئانكو واتاوىٚ ، لىٚ ساخلەت درەسەندە پەيڤا (خصلة) ياعەرەبى‌يەو بوويە ساخلەت ، لىٚ گەلە جارا دبهستين ، دبێژن (متحاج) ژباتى (محتاج) و دبێژن (مسادعە) ژباتى (مساعدە)و (نەعلەت) ژباتى (لەعنەت) .

**سەليقە**

سەيداى ئەڤ ژباتى (اصول) بىٚ هيناى ، لىٚ (سليقة) عەرەبى‌يەو نە كوردى‌يە .

**تيڤلدار**

سەيداى ل شونا رەمزيەو ئيديومىٚ داناى ، بەلىٚ (تيڤلدار) واتايا پەيڤا ئيديۆمىٚ نا گەهينيت ، ژبەركو ئەو پەيڤ ب خوە ئيديۆمە .

**زەغەل**

سەيدا دبێژيت : (زەغەل) ب مەعنا زەلامىٚ چەپ‌و چوير يان (مغشوش) ددەت ، لىٚ مەعنا (كسلان) تەمبەل ب دورستى دگەهينت ، مينا : رۆستەم زەغەلە ل خواندنىٚ .

**ئارەزو**

سەيداى ژ ژنكەكىٚ ئەڤ پەيڤ بىٚ بهستى وپرسيار ژىٚ كريە . كا چ مەعنا ددەت ، وژنكىٚ يا گۆتى مەعنا خەريب ددەت ، لىٚ ئەگەر پيرەژنێن مەژى رێزمان‌و رەهە پەيڤ ب دورستى زانيبانە ، ئەم ژى نەدكەڤتينە ڤىٚ كراسىٚ‌دە ، لىٚ پەيڤ يا بەلاڤە ، (ئارەزوو) مەعنا (هوايە) ددەت .

**گەلتە**

ئەڤ پەيڤە نڤيسينا وىٚ (گالتە) يە مينا كو دشێوەيا كرمانجيا ژێرى بكار دهێت ، ژبەركو دەڤەرا دهوكى گەلە جارا پيتا (ئا –A) دكەنە (ە –e) پشتىٚ وىٚ چەندىٚ ژى (گەلتە) ب‌وىٚ رەنگىٚ نڤيسينىٚ مەعنا (لگەلتە) ددەتەڤە .

**نەقلناڤ**

راستە (نەقلناڤ) نە (نازناڤە) و وەيە وەكو سەيدا دبێژيت ژبەركو (نازناڤ) مەعنا (اسم الدلع) ئانكو ناڤىٚ نازىٚ‌ىٚ دگەهينيت . وراستە (نەقلناڤ) (اسم الشهرة) ناڤىٚ پىٚ هاتيە نياسين دگەهينيت . بەلىٚ ئەگەر ل رەهەپەيڤا وىٚ ڤەكولين ، دبينين ياهاتى ژ (نەقل + ناڤ) . (نەقل) عەرەبى‌يەو ياراست (ناس ناڤە) بۆ (اسم الشهرة) ژبەركو ناڤىٚ پىٚ هاتيەنياسين دگەهينيت .

**ژێدەرو روهن كرن**

١ – هەزازە – فوضي ، هزازى – فوضوى .
٢ – جريدة الجمهورية ، ماجد السامرائي – الثقافة انتماء واللغة وطن – العدد (   ) ٢٣ حزيران ١٩٨٧ .
٣ – ژێدەرىٚ بەرىٚ .
٤ – پاارزنين – تصفية .
٥ – ناسوت – مادة .
٦ – زمانى كوردى‌و دابەشبوونى جوگرافيايى دياليكتەكانى – فؤاد حمه خورشيد و گێرانى بۆ كوردى – عثمان علي قادر لاپەرە ٤٢ .
٧ – هەمان سەرچاوە لاپەرە ٤٣ .
٨ – كاروان ژمارە ١٢
٩ – ئاواو دەستورا زمانىٚ كوردى ، جەگەرخوين لاپەرە ٧٠ .
١٠ – هۆزانڤانێت كورد ، صادق بهاء الدين لاپەرە٣٣٥ .
١١ – ديوانا مەلايىٚ جزيرى ، توێژاندنا صادق بهاء الدين لاپەرە ٤٢ .
١٢ – ژێدەرىٚ بەرىٚ لاپەرە ١٩٨ .
١٣ – فەرهەنگا كوردى (٢) جەگەرخوين لاپەرە ١٨٢ .
١٤ – كوردى‌و ئوريى ، بەرهەڤ كرن ئەمينىٚ ئۆسمان لاپەرە ٣٨ .
١٥ – دلستان ، سەبرى بۆتانى لاپەرە ١٤ .
١٦ – دلينى ، سەرفراز نقشبندى ، پێشەكى‌يا سەبرى بۆتانى .
١٧ – ئاواو دەستورا زمانىٚ كوردى ، جەگەرخوين لاپەرە ٦ .

حەمزە شوشی

# خان ئەبدالو صەبووری و دو هوزانێت نەبەلاڤ

بو جارا دووێ دێ بەرپەرێت وێ دەسنیڤیسا کەڤن و پەرتی و بێ سەروبن و بێ ناڤو نیشان ڤەکەین ، ئەوا بەری هەیامەکێ من سیناڤکەك لێ نەخشاندیو جنیکەك لێ ،ڤەکولای لسەر هوزانڤانێ کوردێ نەنیاس (سەودانی)و هوزانا وی یا نە بەلاڤ .

ئێدی لڤێرە من دڤێت ئەز هەلەکادی فەنەرەکێ لهنداڤ هلکەم بەلکو بکارین بەرهەمەکێ دیێ گرنك وپر بەها بەرچاڤکەین و کوژنەکێ تاری ژ دوبروکا ئەدەبێ کوردی رون بکەین . بوومە لڤێرێ دو هوزانێت نە بەلاڤو کەس نەدیتی بەرچاڤ دبن ، ئەڤ هەردو هوزانەژی یێت ڤان هەردو چەلەنگێت ژێرینەو تا نهوو بزرو نەنیاسن و کەسێ چ لسەر نە نەخشاندییە ، لێ مخابن ئەڤ ناڤو ئەڤ هوزانە ماینە بێ دەنگو لڤین دنیڤ کتێبێن کەڤنداو کەسێ مافێ خو وەرنەگرتییە لێ نە دویرەژی هێژ هەبن وەکی ڤان زاناو ژێهاتیا ناڤو نیشانو بەرهەمێت وا پەرتینەو مشلك و مارو مرك و مێریا هەر ئێکی ژ لایێ خوڤە باراخو تێکربیت ، ئانکو گەلە هوزانێت ڤان هوزانڤانا پوبچ و پەلاچە بین و کەسێ نە دیتبن . لێ سەد حەیف و مخابن بو وان کەسێت ئەڤ خزینە لبن دەستاو قەدرێ وان نەزانی ، بەلێ پا جهێ سوپاس و درو دیێە ژ بوو خودێ مەزن کو ئەڤ چەندە بوومە ساخکریە ڤەو ناڤێ هوزانڤان (صەبووری) میرێ هەکاریێو (میر ئەبدال) میرێ جزیرێ بهژمێرین لرێزا وان زاناو هنرمەندو خزمەتکارێت ڤی مللەتی ، هیڤیدارین ژ هەمی لاڤە بتەرخاندن و نڤیسینێ رابین و ببینە خزم و کەس و کارێت واو بەرەڤانی لێ بکەین پدژی وان پیس و چەپەل و نەزانێت پێن تێ هلداین و چ قەدر بوو نە گرتی و ئەڤ بەرهەمێ کو لبەر زێرا نەهێت کێشان ئاگر تێ بەرداین و بن ئاخ کرین .

ڤێجا بەری وان هەردو هوزانا بەرچاڤکەین پێتڤە ڤەکولینەکێ لسەر ڤان هەردو کەسا بکەین –کا ئەو کینەوچ لسەر هاتیە نڤیسین .

ئێدی دەمێ بێین و بەرپەرێت کەڤن وەرگێرین کا چ بە حسێ (صەبووری) کریە ئەم نا بینین ، .(١) دوی دەمێ کو دەست خەتێ لسەر هوزانێ هو دارێژتییە : «من کلام صبوری حاکم حکاری فرماید» لێرە دیارە کو صەبووری حوکم لدەڤەرا هەکارێ کریە ، ئەڤەژی جهێ گومان و ڤەکولینایە ، بەلێ سەیدا (عبد الرحمن مزوبری) دەمێ چەند هوزانێت (رمە زانێ بووتی) یان (رەمەزان ئاغاجزیری) بەلاڤکرین دگوڤارا (روشەنبیری نوێ)دا (٢) – ناڤێ وی ئینایە بـ (صەبووری یێ هەکاری) ژ ڤێ دیارە کوو صەبووری کەسانەکێ هەکاریەو چ حوکم لێ نەکریە ، دیسا چاخێ مروڤ دیوانا پەرتوویێ هەکاری تێکڤە ددەت – ئەوا سەیدایێ مەزن خودێ ژێ رازی (صادق بهاء الدین ئامێدی) چاپکری (٣) – ئەڤ ناڤێ هە ڤ بەرچاڤێت مە ناکەڤیت ، لێەز بخوژی نزانم چتوڤ مروڤ هو زوی بزر دبیت و چ ناڤو نیشان بو نامینن .

هەروە گاڤا مروڤ ئاڤرییەکێ بدەت جانێ (خان ئەبدالی) دێ دیمەنەکێ شێولی و پر گرێك و گومان ئاشکرابیت ، دەسنڤیسێ هو نەخشاندییە : «من کلام خان أبدال میر جزیر فرماید» ، ڤێجا دا بێین و کتێبا شەرەفنامێ ڤەکەین کا بوومە چ لسەر تومارکریە : (٤)

شەرفخانێ بدلیسی دو ناڤ وەك ئێك ئینایە دەمێ لسەر ئوبجاخا (عەزیزان) د ئاخڤیت ئەوێت میراتی لدەڤەرا جزیرێ کرین : یێ ئێکێ «میر ئەبدال کورێ بدر الدینی» یێ دووێ نەڤیێ وییە : «میر ئەبدال کورێ عزالدینی» ، بەلێ بێ گومانە کو ئەڤ هەردوکە نە ژ بابەتێ مەنە چونکی پشتی چەند بابەکا (ناصر بەگ کورێ شاه عەلی بەگ)ی (٥) کورەك هەبو ناڤێ وی (خان ئەبدال) بو ، بابێ وی حوکم لجزیرێ گێرایە لسەر دەمێ (سلطان سلیمانی) ئو د هەیاما وەزارەتا (رستم پاشا – الوزیر الأعظم) . ئێدی بەری ناصر بەگ روژێت خو بدیماهیك بینیت کورێ خو دانا جهێ خو ئو بەرێ ویدا (استانبولێ) بو کوچکا سلطان سلیم خانێ دووێ (٦) د جاخێ وەزارەتا (محمد پاشا الأعظم) تاکو فەرمانا میری وەربگریت بوو حوکمێ دەڤەرا جزیرێ ، بەلێ وەغەرا وی بجە نەهات و بکرێتی ژکوچکێ دەرێخست ، لسەر ڤێرا و پشتی چەند روژەکا فەرمانەك ژ (باب العالی) گەهشتە (خان ئەبدالی) – دەمێ دگەل چەند نەڤیێت میرێت بوتان دابو ئو پشتی ژ نڤێژا ئیڤاری دەرکەفتین د مزگەفتا (ادرنە) ، ئەو کەسێت حازرژی هەمی مان مەندەهووش و حێبەتی د کووکا ڤی پەیامێو ڤێ گازی کرنێدا . بەلێ ئێك ژ زەلامێت (خان ئەبدالی) ئەوژی (شێخێ شێخان) بو – پشتی هو دیتی – دەلیڤەك دیت و خەنجەراخو دناڤ ملێت (چاوش پاشی) – ئەوێ فەرمان ژێرە ئانی – دابرو کوژت ، پشتی ئەڤ چەندە بوی (خان ئەبدال)و هەڤالێت وی خو بەرزەکرن دناڤ بازێریدا بەلێ چ پێ نەچو هەمی گرتن و فەرمانا سولطانی بنەمانا وان دەرکەفت – ئەوژی نێزیکی سەد کەسان بون . (خان ئەبدالی) هەفت کور لپاشخو هێلان : میر ناصرو میر شەرەفو میر محمدو شاه عەلیو میر سیف الدینو میر عز الدین ومیر

ئەبدال .

هەتا ڤێری ژ ڤێ چیروکێ بوومە ئاشکرادبیت کوو (خان ئەبدالی) چ حوکم نەکریە لێ چێدبیت ئەو هەیاما پشتی بابێ‌وی چوی بەر دلوڤانیا خودێ حوکم تێدا گێرای ژبەر ڤێرێ ناڤێ وی چووبیت ب میرێ جزیرێ ، ئەڤ هەیاما هەژی ڕوژەك بییە یان سالەك بییە یان پتر بییە :
یا گرنك ئەوە کو : حوکم لدەڤەرا جزیرێ کریە .

بەلێ ئەڤ خەشەو ئەڤ چیروکە دێ مینیت ئالوزو شێلی چنکو سەدا سەد ئەم نکارین بێژین کوو ئەڤەیە یێ هوزانڤانو ئەڤ هوزانە ژێ گەهیە مە ، لێ نەدویرە نڤیسەڤانا ناڤێت وان خەلەت کربن‌و ئێك لشوینا ئێکی دانابیت نەخاسمە ناڤەکێ وەکی ناڤێ (خان ئەبدال) چنکو دیارە کو دووێت دی بەری وی چوینە بناڤێ (میر ئەبدال) ، دیسا (خان ئەبدالی) پاش‌بابەك بییەو ناڤ لێ دانایە (میر ئەبدال) .

ئومێدڤارم ژتەڤ ئەڤینداریێت پەیڤا کوردی‌و هوزانا ڕەسەن هەر ئێك ژ لای‌و هێزو ڤەژەناخو ڕێکا وان شاخێت بلندو بەفرێ گرتی خوش‌و پاکژ کەت بەلکو بکارین وان ناڤێت ستەم لێ هاتی‌کرن‌و کەسێ نەنیاسی – لسەر بەری بنکرنیینو پالڤەدەین بوو کاروانێ نڤیسەڤان‌و خزمەتکاریێت ملەتێ کورد .

ئەڤەژی دەڤا هوزانا صەبووری‌یە هەر وەکی دەسنڤیسێ دارێژتی :

**«من کلام صبوری حاکم حکاری فرماید»**

د عەجالێ خەملین گول تە نەدی باغێ خەبان
نەکو فەصلا غوزلانە گول‌و گولزاری نەمان
بلبلێ باغێ نشین شبهی خەفاشێ پێ خوەشە
لەو کو گولشەن بوونە شیلان‌و گول پاری نەمان
ئیرەم ئاسا خەملی بوون ژ چەمەن بادەیە تێك
طالعێمە ژ چەمەن سەبزەوو ڕەیحانی نەمان
چەندی وێرانە نشین شبهی هەماما ل هەوا
لەو کو وێرانە وێرانە کو دیواری نەمان
گەر کەسێ ژار کو لشاگردێ قەصابان مە وەدی
ئیرو شاهین کو لصەیدێ کو نە بشمقاری نەمان
نەبێ خەندان شەڤا بەخشن مەریضان چو مەسح
دێ چ موعجز بنمیتن کو تو بێماری نەمان
صەبرێ (صەبووری)یە سەرووەك چەمەنێ هاتی دەمەك
مە صەبر دێ بچ ببەت سەروو سپینداری نەمان

**ئەڤا بێتنژی هوزانا خان ئەبدالی‌یە :**

سەودایێ جوان دەر سەرێ پیران بنەمەك نیست
پیرانە صیغەت طەبعێ جوانان بنەمەك نیست
ئولفەت نەکونەند پاکێ بئالودەئێ ناپاك
ئەهلێ خەردو مەجلسێ مەستان بنەمەك نیست
دەر باغێ چرا نەغمەئێ زەند بلبلێ پڕ دل
پڕ شاهدێ گولڕەونەقێ بیستان بنەمەك نیست
گەر نە سەحەرێ وەقت بو د فەصلێ بوهاران
نالێدەن مورغان خوش ئەلحان بنەمەك نیست
ئان سینە کە پڕ عشق بو د سینگێ جەمادەست
پەی محبەتێ جانانە مەڕا جان بنەمەك نیست
تا ئەهلێ نەدانەد سوخەنێ حەق بحەقیقەت
دەر گووشێ بەدان گوفتنێ نیکان بنەمەك نیست
ئان کەس گەزەبان‌و دل ئەو نیستێ مووافق
صەوتێ مەلەك‌و سیرەتێ شەیطان بنەمەك نیست
ئەسرارێ محەببەت بڕەزهات‌و مگوید
وەر ...... ئان حالەتێ زیندان بنەمەك نیست
ئەز بەربکی نانێ کێمەش مننەتێ دووتان
نانەتێ چوو بو د مننەتێ دووتان بنەمەك نیست
ئەز نورێ بجیددەت چوو بو د دیدەئێ دل کوور
گەر شەپنێ نەهی موشەممەعێ شیتان بنەمەك نیست
بێمارێ عیشق سەر پەیهودەئێ بژارە
ئەوڕا چ کەن حیکمەتێ لوقمان بنەمەك نیست
خوویێ چ کەن ناکەس دو نڕاندی هەر سوود
بەخشەندی ئەگەر خیلعەت‌و ئیحسان بنەمەك نیست
سولطان‌و ئەمیری نەبود ڕاست گەل مەش
دەر دەستێ فەندێ مەلیکێ خوڕاسان بنەمەك نیست
هەم صوحبەتێ ناکەس کە خوڕاستی سەرەنجام
گەر بازەکەنێ هەمرە زاغان بنەمەك نیست
عاشقێ زولیێ یارو نەصیبەست‌و کرینە
(ئەبدال) بمن لەعلێ د بەخشان بنەمەك نیست

ژێدەر :

١) الشرفنامە تألیف الأمیر شرفخانە البدلیسی / مطبعة النجاح بغداد / ١٩٥٣ .
٢) گوڤارا «روشەنبیری نوێ» هژمارا (١٠٢) تیرمەها ١٩٨٤ ێ . سەیدایێ مزویری پێنج هوزانێت (ڕەمەزان ئاغا جزیری) تێدا بەلاڤکرینە ، منژێ چەند هوزان‌دانان‌بەرامبەر تەرازیا دەسنڤیسەکا کەڤن‌و پەرتی‌و یێ سەرو بن‌و دوبروك‌و یێ خودان . قەباراوێ ٢٠×١٥ سم ، د پەرتوخانا شێخ مەمدوحێ بریفکی (خودێ ژی ڕازیبیت) بەرچاڤێت من کەت .
٣) دیوانا پەرتوێ هەکاری . صادق بهاءالدین ئامێدی ، دار الحریة بغداد ١٩٧٨
٤) شەرەفنامە ، بەرپەرێ (١٥١) .
٥) شەرەفنامە ، بەرپەرێ (١٥٩) .
٦) سلطان سلیم خانێ دووێ کوڕێ (سلیمان القانوني)یە ، میراتی وەگرت ژ سالا ١٥٦٦ز هەتا ١٥٧٤ز .



# چەند پارچە شیعرێکی لەیادکراوی قانیع

•

ئومێدئاشنا

١٩٨٧

•

قانع – شیعری بلاّونەکراوەو پەڕاگەندەی زۆرە ..

بە هۆی ژیانی نالەبارو سەختی ڕۆژگارەکەیەوە، نەیپەرژاوە هەمووی کۆبکاتەوە. سالّی –١٩٧٩ –لە دەربەندیخان – خوالێخۆشبوو حاجی عەلی یاروەیس –، هەشت پارچە شیعری قانعی لەبەر خوێندەوەو هەر لەوێدا نوو سیمنەوە، کاتێ بەراووردم کرد شەش پارچەیان لە هیچ کام لە دیوانە چاپکراوەکاندا بلاّونەکراونەتەوە . لە لایەکی تریشەوە بە هۆی ڕۆژنامەکانی – ژیان – ١٩٣٩ – و – ژین–ی سالآنی – ١٩٤٥، ١٩٤٦، ١٩٥٢، ١٩٥٨ – ە– وە، نۆ شیعری کەی قانع–م دەست کەوتو دوای بەراورد لە گەلێ دیوانەکانیدا دەرکەوت ئەوانیش بلاّونەکراونەوە. ئەوا لێرەدا بە هۆی– گوڤاری کاروان– ە– وە ئەو پانزە پارچەیە بلاّو دەکەمەوە، هیوادارم لە دیوانی داهاتوی – قانع–دا چاپبکرێن.

–١–

عەزیزم، ڕەسمی سەرداری، بە قەسرو بارەگا نابێ
بە سەرفی دەولّەتو مالّە، بە مفتو مەرحەبا نابێ
نە هەرکەس عەقلێ خۆی تێکدا، ئەبیتە عاشقو مەجنون
کەشێتی بێ غەمی لەیلی، بەرووتیو بێ نەوا نابێ
نە هەرکەس پێبکەنی ئیتر گولّی گولێ خەندەرانێکە
هەناسەی عەتری گولێ خونچە بە بێ سروەی سەبا نابێ
نە هەرکەس پارە کوکاتۆ دروستە پێ بلّێی ئەشراف
کە – خواجە مووشی – بالوڕدبێ بە پیاوو کوێخا قەت نابێ
کەشیدەی پشتی مام حاجی کە داوە بۆ گەلی لادێ
بە ئەسبابی نەجاتی مەحشەرو ڕۆژی جەزا نابێ
بلّێمچی پیری عەقلم پێی وتم واچاکە بیزانیت .

که ریشی بیٚ.عەمەل هەرگیز لەبۆئیشی خوادا نابیٚ
لە ناو ئەم هۆزە بەد بەختە لە سەد حەفتای – فلاتوونە –[1]
کەچی ئەم – خۆرە خۆ خۆریە بە دەستی کەس دەوا نابیٚ
برام ، فەیلەسووفی، واثەزانن سەر نەتاشینە
ئەگەر تەرکی خەووخواردن نەبیٚ غاندی‌سەریٚ وەها نابیٚ
نە سایەی هیممەتی – ژین[2]–ە کە قانع ناوی وابەرزە
ئەگەر نا، ئەم خەیالاٚتەی لە لای کەس ئاشکرا نابیٚ
سالی–١٩٤٥

–٢–

## لەسەر گۆڕی فایەق زیوەر–[3]

١٩٥٢

ئەی دایکی ئەسکی، ئەی خاکی بیٚ دەنگ
ئەی مالی تاریك، پەردەی شەوەزەنگ
ئەم‌لاشە، لاشەی، کانی جەوهەرە
ئەمە سەرچاوەی دانەی گەوهەرە
هۆشت‌بیٚ دەخیل، ئەزیەتی نەکەی
بەبیٚ رەحمانە، ئازاری نەدەی
ئەی خاك، وەك ئەهلی زەمانە مەبە
دەرهەق بەم لاشە، بیٚگانە مەبە
مەلیٚ خۆ پایەی نزم‌و باریك‌بوو
رۆژی ژیانی شەوی تاریك‌بوو
قەسری سیٚ قاتی قەت بینانەکرد
هەناسە ساردبوو تا ئەو رۆژە مرد
رۆژیٚ دیٚتە پیٚش بۆی پەشیمان‌بی
لە من خراپتر بۆی پەریٚشان‌بی
پاش مەرگی زیٚوەر –فایەق –و– بیٚکەس–
کیٚ قەلەم بۆ تۆ، بگریٚتە ناو دەس
کیٚ بتلاویٚنیٚ، بە هۆنراوەی جوان
بتهیٚنیتە ریز، باقی هاوسەران
کیٚ – گۆیژەو ئەزمڕ– بخاتە ناوان
کیٚ– پیرەمەگرون– بباتە ئاسمان
کیٚ شیوەن بکا بۆ جیٚ مەئوای هۆز
کیٚ فیداکار بیٚ بۆ هۆزو بۆ کۆز
ئەی خاك لای ئیٚمە باوەشی تۆیە
هەر لە داوینت مەجلیسمان کۆیە
هەروا بە نۆبە دیٚینەوە بۆ لات
دایکی خۆشەویست دیٚینە خاك‌و پات
خوا تۆ بەرزکاو لە ئیٚمە خۆش‌بیٚ
–ستارالعیوب– بۆ مان عەیب پۆش‌بیٚ .

– ٣ –

باخەوانی باخی دولبەر خۆشترە نەك سەرووەری
سەیری بازاری زەمانە خۆشترە نەك قەیسەری
بۆ دلیٚکی بیٚ‌گریٚ یاخو دەروونی بیٚ خرۆش
هیچ نەکەی ئیللا تەماشای کردگاری داوەری
پیرەزالیٚکە زەمانە سەد هەزار میٚردی هەیە
رووسپی خوازبیٚنی ناویٚ خویٚ ئەچیٚ بۆ موشتەری
لاوی کوردم دەستەداویٚنی کەسی وەك من مەبە
بۆ خەیالی هیچ‌و پووچ‌و خوو رەوشتی سەرسەری
لاڤی مەردی لیٚ‌مەدە تا دەس لەدنیا بەر نەدەی
سەیری عیساکە بە رووتی کەوتە سەر پیٚغەمبەری
مالی دنیا دەوری داوی پیاوەتیت بۆ ناکریٚ
بەندی گژنیژەی جوانە مۆری ناو ئەنگشتەری .

–٤–

١٩٣٩

دیسان سەرچاوەی ژین ژیایەوە[4]
دەروازەی شادی کورد کرایەوە
ئافەرین بەهار هەزار ئافەرین
ئەیکەی بە بەهەشت ساراو سەر زەمین
بە قدومی تۆ تووتی کوردستان
هاتە گفتو گۆ وەك جاری جاران
بەهار تۆ بولبول دیٚنیتە خرۆش
بەهار تۆ شاعیر دیٚنیتە سەر جۆش

دەشتی پووشی وشك ئەكەیت بە گوڵزار
ئەبرێت كەوای سەوز بە باڵای چنار
گوڵان لە كوێستان هەڵئەدەن بەیداخ
ئاڵو واڵا بەرگ ئەكەنە بەر شاخ
من دەستە ملەی پەژارەو خەم بووم
گیرۆدەی حەلقەی بەندی ماتەم بووم
نوقتەی مەركەزی دائرەی دەرد بووم
لە خۆم خراپتر هەناسە سەرد بووم
ئافەرین بەهار مەسیحی دەوران
زیندوو كەرەوەی پۆلی مردوان
ئێستا لە سایەی هەوا سافەكەت
هاژەی بەفراوی شاخو تاڤگەكەت
ئەواو ساڕێژ بوو بەژوی زامانم
دێتەوە سەر هۆش - ژینو ژیان—م

—ە—

**لە دارۆخانەوە بۆ كچانی سلێمانی :—**

سوپاستان ئەكەم پۆلی چاو مەستان
خوشكی خۆشەویست زادەی كوردستان
عومرم نۆ ساڵەو پرشنگە ناوم
بە تیغی جەفا برا هەناوم
دراوم بەشوو بە پیرە پیاوێ
ڕیش پاژنەو كوڵكن عومر نەماوێ
تەئریخی عومری حەفتای تەواوە
خوێن لە لەشیدا تنۆك نەماوە
من باوكدارو خاوەندی برام
بەڵام بە پارە بە ئەسیر برام
كاكم كە شكڵی پارە ئەبینێ
ڕەحمو ئینسافی لەلا نامێنێ
هەرچەند هەوڵمدا چوومە لای قازی
لە جێی من قازی كرابوو ڕازی
خۆم خستە چاكی عەبای مەلاوە
عەبای نمونەی ئاڵی عەباوە

بە خەوی شەوان ئاگام لێ نەبوو
وەختێ كە ڕوانیم دراوم بە شوو
وتم هەی هاوار هەی دەفیل ئامان
زۆرم لێ بكەن ئەچمە سەر قورئان
ئەمە پێنج ساڵە ڕەفیقی پیرم
بەبێ جنایەت بەندی زنجیرم
تووكی سەرسنگی نەیجەیەو بەڵمە
سواغی دیواری ژوورسەرم چڵمە
بە كۆكەو لرخەو قرخەو جرتو فرت
ئاواتە خوازم بە عومرێكی كورت
جنێوی بەقەد قورئان ڕەوانە
ئەجری خزمەتم هەموو سندانە
باوكم وتویە پیر بۆ ژن تیرە
كەچی دەربارەی من ئەویش تیرە
ئەی جەمعیەتی حمایەی حەیوان
لێرە لە حەیوان كەمترە كچان
واوتمان حەیوان هەر باركێش ئەبێ
كچ بە ڕۆژو شەو ناوكەڕێش ئەبێ
بیستوومە ژنان ئێستە ئەخوێنن
خوا بیدا هەقی ئێمە ئەستێنن

**نەسرین-ی كچی - بەنگینە - جوابی پرشنگی قانع ئەنووسێ.**

جوابت بەمەوە خوشكی شیرینم
كچی - بەنگینە - م بە ناو نەسرینم
منیش نۆ ساڵم بەڵام لە شارم
لە دەوری عیلما زۆر بەختیارم
خوشكە گیانەكەم پرشنگ كچە كورد
هاوارو بانگت زۆر تەئسیری كرد
گریام بۆ بەختی شوومو شێوەشوو
وەك بێچوە پەری دەست عیفریت كەوتوو
لادێی بەوە نانیان براوە
كە قەدری ژنیان لەلا نەماوە
ئەوە گۆڕیان بێ كزو باركێش بن
لەژێر سوخرەدا هەر ناوكەڕێش بن

خوا پێداو بەرۆژ بیش چەوسێتەوە
شەو بەخۆشی ژن ئەحەسێتەوە
ژن کە هاوکوف بێ ئەو هاو دەردیەتی
رۆحی لەدەوری سەری مێردیەتی
دڵسۆزی مێردە ژن خەم رەوێنە
نەك موستەهەقی بەڵغەمو جوێنە
ئێستائەوانەی فێرن بە جنێو
لەناو گاگەلا ئەیان کەنە کێو
ژن بۆ تەشکیلی عائلە دێنن
کە ئەولادی چاك پێ بگەیەنن
بە ئەولادی چاك وەتەن سەر بەرزە
خدمەتی وەتەن لەلامان فەرزە
ئێمە شووکردن بە دەست خۆمانە
نە بەخەنجەرە نە بە گۆچانە
لە ناو ئێمەدا جاهل نەماوە
بە خوێندەواری کارمان تەواوە
بە تەوالێتو سەر بەسدارە
دەم بە پێکەنین بۆ ژن دڵدارە
بە حەفتا ساڵیش کچۆڵە دێنن
بە زمانی خۆش ئەیان خەملێنن
وا - دارۆخان - یش مەکتەب نشینە
مەکتەب بۆ عەرزی کچان پەرژینە

- ٦ -

-سلام علیك - گۆیژە مەشهووری
تاسەی تۆم کردوە زۆر بە زەرووری
ئەمە چەند ساڵە تۆ نزیك شاری
سەربەرزو ماقوڵ لە عالەم دیاری
ئەولادەکانت گشت خوێندەوارن
زرنگو دانا ژیرو هوشیارن
فەسیحو ناتق شاعرو عالم
بۆ بینای وەتەن دڵسۆزو سالم
لاپەرەی تەئریخ شاهدە بۆمان
هەر لە ئەمرۆوە هەتاکو بابان
من زۆر داماوبووم لە دەس نەخوێندن
بێزاربووم لەژین رازی بەمردن
ئەولادەکانم هەروەکو وەحشی
هیچیان نەزانی غەیرەز سەرکەشی
هەر وەکو پڵنگ درندەی بێباك
بە دایم سەرمەست بێ بەنگو ترباك
لە نەزەریانا چ رێوی چ شێر
هیچ فەرق نەبوو چ مێچکە چ نێر
لە خوێن رشتنا رۆژی تەنگانە
فەرقیان نەئەخست خوێشو بێگانە
ئێستا لە سایەی لوتفو عەدالەت
رووی کردە ئێمەیش چرای سەعادەت
بەیداخی خوێندن لامان هەڵکرا
مەکتەب بۆ ئێمەش ئەوا دانرا
ئنجا لاوانم چەندە بێعەیبن
دوبارە پیاون فرشتەی غەیبن
قەڵەم ئەندازو شمشێر ئەندازن
بەینی بین‌الله عەجەب شابازن
چەند خۆشەئەولاد زۆر چاك بخوێنێ
هەقی پاش کەوتی باوکی بسێنێ
ئیتر منو تۆ سەگرمەو کاژاو
پیرەمەگروونو کیوانی بێناو
هەموو داواکەین لە واحدی تاق
دایم سەربەرزبێ عەلەمی عراق

-٧-

١٩٤٦

خوشکی هاوخوێنم هاو گریەو زاری
گەورە تابچووك لە کوردەواری
لێرە تا ئەوێ سەلام بێ لێتان
سەلام لە خۆتان لە خاکی پێتان
خۆتان ئەزانن عەسری گەوهەرە
سەراسەر گێتی پڕ لە جەوهەرە
خوسووسەن وا ساڵ رووەو بەهارە
کاتی سەیرانی گوڵو گوڵزارە

دار ئەکا چرۆ چرۆ ئەکا گوڵ
گوڵ نەشئە ئەدا بە مێشکی بولبول
بولبول بە زیرەی بەری بەیانی
بانگ ئەکا لێمان بە میهرەبانی
ئەڵێ ڕاپەڕە چوادەی خەوە
بۆگێتی ڕۆژە بۆ تۆ بۆ شەوە
هەڵسە تێکۆشە بۆ ئیشی هۆزت
فیدا کاری کە بۆ بەرزی کۆزت
مەڵێ من کچم پەچە دائەدەم
واپیاوێ دیارە چاك خۆم لائەدەم
بۆ خزمەت کردن چە نێرو چە مێ
ئەبێ ئیشی هۆز بکات جێ بەجێ
بەڵکو ئەو پیاوە ئیشی زەرووربێ
نەخوێندەواربێ ڕێگەکەی دووربێ
نەزانێ چلۆن ئیش هەڵسوورێنێ
لە لای ئیش بە دەس چۆن خۆی بنوێنێ
ئامۆژگاری کە بە دڵێکی پاك
شارەزابێ کە وەك خوشکێکی چاك
تۆ خۆت داپۆشیو ئەویش بێچارە
خوشكو برابێ لە کوێ دیارە
ئیتر سەلامم بۆ زادەی سەلام(٦)
یەعنی – ناهیدە(٧)– نەوەی نیك نام

-٨-

١٩٥٨

برای خۆشەویست هاوبیر هاو خاکم(٨)
هاو دڵی رووناك هاو خوێنی پاکم
منو تۆ ڕۆڵەی یەك خاكو ئاوین
هەردوو وەکوو یەك زۆر لێ کراوین
ئێمەش پێویستە تۆوێ بچێنین
ریشەی ئیستعمار لە بن دەربێنین
ڕوو بکەینە یەك شێوەی ئاشنابێ
نەك ئاشنابێ تەواو برابێ
دەس بگرین بە یەك ڕوو بکەینە مەیدان
گەلمان هان بدەین بۆ خزمەت نیشتمان
هەر وەکوو بۆ تۆ هاوارم کردوە
پەنام بە نووکی پێنووس بردوە
تەنها پەنجەیەك هیچی پێ ناکرێ
کە کردت بە پێنج کێ بەرگەی ئەگرێ
مستەکۆڵ ئەبێو ناو دەم ئەشکێنێ
ڕەگی بناگوێی دوژمن دەردێنێ
من منو تۆ تۆ نەهێنینە کار
گوێ نەدەین بە قەول بەدی ڕۆژگار
ئەو ئیستعمارەی خوێن مژی بۆگەن
ئەوئیستعمارە ئیمەی خستە بەن
ئەو ئیستعمارە سەرمایەی بردین
لەژێر زنجیریا یەك یەك ئەمردین
ئێمەش وەکو شێر لەگەڵ سوپامان
خۆمان، منداڵمان، خزمو برامان
ئێستە کە شەیتان چاك دەرکراوە
دەستی لە بەهەشت عیراق براوە
نەیەڵین هەرگیز کە فرسەت بێنێ
هەر وەکوو جاران بمان خنکێنێ
هەر کەس بزانین خاینە بە خاکە
دەربارەی ئێمە پیسو ناپاکە
پارچە پارچەی کەین بەسووكو ئاسان
بینێرین بۆ لای کاك – عبدالشیطان –
ئیتر هەر بژی سوپای سەربەستی
وانەجاتی داین لە دیلو پەستی
ئیتر هەر بژی جەژنی دڵشادی
باهەر ڕووناكبێ ڕۆژی ئازادی

-٩-

١٩٤٥

ڕۆژ نامەکەی (ژین) کۆگای مەعریفەت
تاقانە خونچەی گوڵزاری میللەت
بڵێ بە موفتی توتنچی پێنجوین
مەلا عبداللە(٩)– هاودەمو هاودین

کاتێ لە لای ئەو هاتمە شارەزوور
تەماشا ئەکەم نزیك تا لە دوور
مسکێنی بە دڵ سەربەستو شادن
یەك لەیەك چاکتر لە خەم ئازادن
جوتیار بە حیلاو گاوان بە هۆرە
بۆ یەك ئەیانوت نۆرە بە نۆرە
تەماشات ئەکرد ئەتگوت ئەم دەشتە
سەوزو سورو زەرد باخچەی بەهەشتە
کاتێ تێ پەڕیم چوومە هەڵەبجە
دروستە بڵێم هەڵەبجە گەنجە
یادگارێکی میرو جافانە
شارێکی پڕ لە سینە سافانە
جێی مەحموود پاشاو وەسمان پاشایە
ماڵەکەی پاشا تاق کیسرایە
مزگەوت ئەرووخێ میحراب ئەمێنێ
ئەمرۆش حەسەن بەگ هیممەت ئەنوێنێ
لەهەڵەبجەوە هاتمە سلێمانی
ئەو سلێمانیەی کەخۆت ئەیزانی
موتەسەریفی مەعاریف پەروەر
وەك باڵی هوما سایەی خستمە سەر
لەو ساوە سایەی کەوتۆتە سەرم
سەرسەری لاچوو لەسەر دەفتەرم
خوا بۆ خاتری حەبیبی سەروەر
خۆی چۆنی ئەوێ وابیبانە سەر

-١٠-

**بەناوی - خەنجەری کوڕیەوە وتویە .**

جەژنتان پیرۆز یارانی گیانی
ێتان موبارەك بەشادمانی
ئەوا تەواوبوو ڕۆژی ڕەمەزان
نێو وشکیو زەردی گرۆی ئازیزان
پێویستە ئەمساڵ دوبارە سەیران
یەك جەژنی ڕۆژو یەك جەژنی جیهان
سترانی حەربو تەنگانەی ڕۆژوو
هەردوو بە جارێ لەسەرمان لاچوو
کوڕی قانع - م ناوم خەنجەرە
بۆ قەزای کوردان سەرم سوپەرە

-١١-

**گلەیی لە - ژین- ی خۆشەویستمان** (١٠)

١٩٤٦

بنچینەی کوردی جەریدەکەی ژین
بۆ بێ وەفاییت هەزار ئافەرین
پیرو موریدبوین منو تۆ چەند ساڵ
زەمانمان ڕابوارد سا بە هەر ئەحواڵ
تۆ باخچەی گوڵ بویت منیش وەك بولبوڵ
لە بولبول زیاتر دەروون پڕ لە کوڵ
منو تۆ چەند ساڵ براین ماڵەو ماڵ
بۆ محاکەمەی دائرەی ئیشغال
سەیری لاپەڕەو ژمارەی زوو کە
تەماشای - ژیان-ی دە ساڵ پێشوو کە
ئەزانی کێ بوو کڕیداری تۆ
کێ بوو دەروێشو خزمەتکاری تۆ
تۆ لەیلیو من قەیس نامرادی تۆ
تۆ شیرینی عام من فەرهادی تۆ
تۆ ئاوی حەیات من ئەسکەندەر بووم
دایم لە زوڵمات گێژو خەتەر بووم
منو تونتچی بە - موفتی - مەشهوور
فیداکاری تۆین نزیك تا لە دوور
بیستمان سەیرانێ زۆر جوانت کرد
دەعوەتی کۆمەڵ شاعرانت کرد
مەعلوم چونکە خۆت واجەوهەرداری
بۆ جەوهەرداری تۆ کڕیداری
ئێمە خۆ ناڵێین هاوڕێی ئەوانین
لەبەحری عەرووز - چاك مەلەوانین
بەڵام مەئیوسین لە حاڵی خۆمان
نەکەوتینەوە بیر خاڵی خۆمان

بۆ بژیت ئێمه بەندە فەرمانین
بۆ سەربەرزی تۆ ڕوو لە یەزدانین

-١٢-

**دەورەی ژیانم –**
منداڵ بووم ئەچووم بۆ قوتابخانە
بۆ لای مامۆستای پڕ لە ئەفسانە
هەتا دوازدە سالْ زەجرو لێدان‌بوو
منیش هەر پیشەم شین‌و گریان‌بوو
هەتا هەژدە سالْ بەم جۆرە ژیام
دوای نۆزدە ساڵی لە تەجنید ناسرام
تا بیست‌و پێنج سالْ ئەمە کارم‌بوو
بە شەوو بە ڕۆژ هەر هاوارم بوو
کە نەجاتم بوو نەدالك‌و نەباب
نەخزم‌و نەخوێش نەبراو ئەحباب
ئەی خودا نانێ لە کوێ پەیدا کەم
میوانی غەریب چلۆن ڕەها کەم
ئێستە ئەروانم واپیر بووم تەواو
دەستم ئەلەرزێت وەکو بی سەر ئاو
شازدە سەر خێزان دەورەیان داوم
منیش بۆ نانی شەوێ داماوم
ئێستا – جیاوك – هیممەت ئەنوێنێ
هەژارو فەقیرو لات ئەژێنێ
چونکو بەڕاستی میللەت پەروەرە
بۆ لیواکەمان وەك تاجی سەرە
ئیتر هەر بژی سێبەری خاکمان
موتەسەرڕیفی تەواو دلْ پاکمان

-١٣-

**بە ناوی وریای قانع–ەوە بۆ –بەختیار–ی کوڕی جیاوك –**
بەختیار سوپاس بۆ بەختیاریت
هەزار ئافەرین لە هوشیاریت
تازە خەلْفێکی داری بەرداری
گڕی وەجاخی کوردی ناوداری
باوکت شاعری ناو نیشتمانە
بۆهۆزی کوردان سایە پەخشانە
جاران ئەنووسرا وشەی سەعادەت
خۆشم ئەم خستە ڕیزی عیبارەت
چون عالم نەبووم لای بێ مەعنا بوو
مەعنای بەچەشنی تەیری عەنقا بوو
ئێستائەزانم سەعادەت چییە
کە ئەم واتەیە بێ مەعنا نییە
ڕاستی سەعادەت ڕووی کردە ناومان
بوو بە دەرمانی جەرگی سووتاومان
چەن هەق فەوتاو لە نوێ سەنراوە
مردووی بەش‌خوراو زیندوو کراوە
دلێك نابینم بە غەم زامار بێ
یاخو دەروونی کە بریندار بێ
ئاوی تانجەرۆو داری سەر چنار
بە زمانی حالْ کە دێتە گفتار
ئەلێن واگەینە ئەم ڕۆژە جوانە
جیاوك داینا ئەم ڕێ‌و دوکانە
تۆش کاتێ نۆبە هاتە دەورانت
لەفزی سەعادەت کەوتە سەرشانت
هۆشی فەقیرو هەژارانت بێ
پەروای نالێنی زامارانت بێ

-١٤-

**–من‌و بەختم –**
بەختە خەو تاکەی ڕاستۆبە لە خەو
بە ناهەق ڕۆژت بۆ کردوە بە شەو
چۆن‌وا خەوالْوی سەر لێ شێواوی
لەمە خراپتر هەر بەش خوراوی
ڕاستۆبە لە خەو بشۆرە چاوت
تۆیش وەکو خەلْکی بەرزکە ناوت
بۆچی بێ بادە مەست‌و مەخمووری
بۆچی بە تەنها زارو ڕەنجووری

ـەختە با بەس بێ دەی تەماشاکە
سەرێ بەرزۆکە سەیری دنیاکە
ءنەم بە دەماخ مەسرور وشادن
ـە بازیچەی خەم دەوران ئازادن
کەرتێ بە ئێشێ جارێ بە کارێ
دەستت نەگرتم بەردت لێ بارێ
کام ئیمام کوشت کام شێخم سووتان
کام ماڵی خودام بە ناهەق رووخان
کام قەباحەتم لە دەس قەوماوە
بۆچی ناوچاوم لای تۆ نەماوە
کام هاو ماڵی من وەك من بێ هۆشە
کام برادەرم وەك من. نەخوشە
بەختە بیرکەرۆ بۆ زەمانی زوو
غەیر خزمەتکاری من سووچم چی بوو

**جوابی بەخت!-**

قانع بە ناهەق گلەم لێ ئەکەیت
ئەمە زیاتر ئابرووی خۆت ئەبەیت
من لای یەکێکم کە خوێندەوارێ
هەر وەکو خەڵکی ژیرو هوشیارێ
نەفعی خسوسی بە هیچ نەزانێ
حامی زەعیف بێ هەتا ئەتوانێ
رەحمەت پێ ئەکەم کە نایەمە لات
تۆ کەی شایانی بۆ موچەو بەرات
تۆ کە جاهلی. لە ئیش تێ ناگەی
من نەبم خۆت تووش چەند زەرەر ئەکەی
هەتا کەمتر بێم بۆ تۆ زۆر چاکە
قانع جێگەی من ژووری ئەفلاکە

-١٥-

**سوپاسی مژدەی ژین.**

رۆژنامەکەی ژین چرای کوردستان
تۆ نوخشەی وتار بە کوردی زوانێ
تۆ سەرچۆپی کێش هەڵپەرکێی کوردی
گۆرانی بێژی ئیلهام ئاوردی
تۆ لە ئەوەڵجار هیممەتت نواند

لە بەفری نووسین تۆ رەچەت شکاند
تۆ سەر دەلیلەی قەتاری هۆزی
لە چاو بەدوور بێ لاوێکێ قۆزی
گەلاوێژ - خوشکی مناڵی تۆیە
خوشکی شۆین کەوتەی نەو ساڵی تۆیە
لە لاپەرەی سێ لە سێزدەی کانوون
مژدەی لێت دابوو بە دڵەی مەجنون
کە - دەنگی گێتی تازە-ی نازەنین
دەمو نەفەس پاك گفتوگۆ شیرین
خوشکی سێ یەمی ژینی کوردانە
تا بڵێی وتەی ئاودارو جوانە
بەڵام نازانین نیشانەی چۆنە
ئاخۆ گۆڕاوە یا چەشنی کۆنە
بۆمان بنووسە ناوونیشانی
ئابونەی ساڵی شوێن و مەکانی
تا بەسەرو ماڵ کریداری بین
بەهەموو جۆرێ تەڵەبکاری بین
ئیتر قانع-م بەم ئەندازەیە
ئاهەنگی - دەنگی گێتی تازە-یە.

**پەراوێزەکان:-**

١ فلاتوون -مەبەستی -ئیفلاتون-ە بۆ پێویستی شعرەکە وانووسراوە.
٢ مەبەستی لە رۆژنامەی ژینی پیرەمێرد-ە کە قانع ناوبەناو شیعرەکانی خۆی دەنارد بۆ پیرەمێردو ئەو بۆی بلاو دەکردەوە
٣ فایەق زێوەر یاخود بەختیار زێوەری شاعیر کە ساڵی ١٩٥٢ کۆچی دوایی کردوە.
٤ قانع ئەم شیعرەی بە بۆنەی سەر لە نوێ دەرچوونی ژین-ە- و ە- نووسیوە کە پێشتر ساڵی (١٩٣٨) مجید یەعقوبی دایخستبوو
٥ قانع ئەم شیعرەی بە ناوی - پرشنگی - کچیەوە بۆ نەسرینی کچی بەنگینەی شاعیر کردوە .بەنگینەش بەناوی کچی خۆیەوە وەڵامی داوەتەوە.
-٦-٧- بە مەبەست لە شێخ سەلام-ی شاعیرو ناهیدەی کچەیەتی
٨ ئەم شیعرەی لە بەرپابوونی شۆرشی تەموزی (١٩٥٨) دا وتوە
٩ مەلا عبداللە -مەبەست لە موفتی پێنجوێنی شاعیرو هاورێیەتی
١٠ پیرە مێرد ساڵی (١٩٤٦) لەئاهەنگی بیست ساڵەی ژینی کردبووەوە لە یادی چووبوو قانع بانگ بکات .

# چەنـــد ئامۆژگارییەك

**نووسەرانی بەڕێز :**
سڵاوێکی گەرم و پڕ میهرەبانی لەهەموو لایەکتان : بەڕێزان ئێمـــەی کارگــێڕو فەرمـــانبـــەران لە گۆڤـــاری کاروان ئەرکی سەرەکیمان یەك شتە ، ئەویش ڕاگەیاندنی بیروڕای نووسەران بە جەماوەری خوێنەرانە، بەشێوەیەکی تەواوو ڕێك وپێك.
جا ئەو بەرهـــەمانەی کە خوێنەر تام و چێژو سوودیان لێ وەردەگـــرێ بەهـــەمـــوو شانـــازیو دڵخـــۆشییەوە ئێمـــەش لە نووسەرانی ووشەی کوردیی شکۆمەند پێشوازی دەکەین و بە ئەمانەتێکی تەواو پێشکەشی خوێنەرانی دەکەین .
بە چاوێکی یەکســـانی و بەبێ جیـــاوازی تەمـــاشای ناوی هەموو نووسەرێك دەکەین . تەنها جیاوازی لەبەرهەم دایە، کە بە پێـــزو تام و سوود بوو بە زووتـــریـــن کات نۆرەی خۆی وەردەگـــرێ بۆ بڵاوبوونەوە، ئەو بەرهەمەش کە لەگەڵ ڕێبازی گۆڤارەکەماندا نەگونجێ ، ئەوا دیسان لەگەڵ سوپاس و ڕێزمان بۆ نووسەرەکەی دوا دەخرێ .
دوای ئەم پەیەك گەیشتنە کورتە تکاکرین نووسەرانی بەڕێز ئەم چەنـــد ئامـــۆژگـــارییـــەی خوارەوە ڕەچـــاو بکەن ، لەگەڵ سوپاسماندا بۆ هەموولایەك .

١ـ لەکـــاتی نووسینـــدا «ڕوونووسەکەت» دێر بپەڕێنە، بۆ ئەم مەبـــەستـــەش چاکتـــر وایـــە کاغـــەزی خەتـــداری قەبـــارەی «فولسکاب» بەکار بهێنیت .
٢ـ شاش بنـــووســـەو ووشەکان لەیەکتری جودا بکەرەوە واتە ماوەیەك بخەرە نێوانیانەوە .
٣ـ لەسەر یەك دیوی کاغەزەکە بنووسە .
٤ـ بەقەڵەمی پاندان «مەرەکەب» بنووسە نەك «جاف» .
٥ـ ناوی خۆت و باوك و باپیرت و، ئەدرەسی تەواوت بنووسە . خۆ ئەگـــەر ویستت نووسینەکەت تەنیا بەنازناویکەوە بڵاوببێتەوەو ناوەکـــەت ئاشکرا نەکرێ ، ئەوا لەم ڕووەوە تێبینییەکمان بۆ بنووسە، بەڵام دەبێ لەوە بەئاگابی کە هەر بابەتـــێك ئەم خاڵەی تیادا ڕەچاو نەکرێ پشت گوێ دەخرێ .
٦ـ نووسینـــەکـــەت بڵاوبکـــرێتـــەوە یا بڵاونـــەکـــرێتـــەوە ماف داواکردنەوەی دەستنووسەکەییت بەسەرمانەوە نییە .
٧ـ هەوڵ بدە لەگـــەڵ نووسینـــەکەتدا وێنەو نەخشەو تابلۆی پەیوەندیدار بەنووسینەکەوە بنێریت .
٨ـ هەرنـــووسینێکی بۆمـــانی دەنـــێری گەر بەخـــەتێکی خۆش نەنـــووسرابێتـــەوە پەسنـــد ناکرێ بۆ بڵاوکردنەوەو پشت گوێ دەخرێ .
٩ـ ئەو بابەتەی بۆمانی دەنێری «تقطیع»ی مەکەو، وەك خۆی بۆمانی بنێرە . چونکە ئێمە لای خ]مان بەم کارە هەڵدەستین .
١٠ـ ئەو نووسینەی بۆ ئێمەی دەنێریت، بۆ هیچ لایەکی تری مەنێرە تا ئەنجامەکەییت لەلا ئاشکرا دەبێ

## دیوانی کاروان

لە کانە بەردی نزیك شارەوە
کێل بێنە بۆ گۆڕ
هەڵی پەسێرە بە قەدی زبری
پیرە دارەوە.

**پێشکەشە :**
**بە گریانەکانی ئێوارەی شەشەم**

لێرە لە نێوان درکەزی خاکا
پەپوولە باڵی چەقیوەتە ناو قوڕاوێکی شل
چاوی هیلاکی بڕیوەتە دوور
مەرگی بەخشیوە بە قەد پاڵی ترس
ترسێ تاشە بەرد بێتە خوار بە تل
ئەو گڕەیە چۆن تەرەی بێشەیە
ئۆقرە لە چاویا بۆتە ئۆقیانووس
چۆن پشوو ئەدا لە گەرمە سێرا
بڕیار ئەداتە دەستی چارەنووس
لێرە شەوانە پێش کاتە خەوێك
تەمەن شرەی ژین ئەپێچێتەوە
لە بەرچی کەشتی نرخی خۆی نادا
بە ئاشنا بوونی شەقامی شارێ؟
تاوەکو شاریش تەرمەکەی کۆڵی
بۆ بازرگانی ـ نەدا بە بارێ.

* * *

بۆ سەری کاست وەها دائەخەی؟ . ڕت هەڵبڕە
دوایین نەفەسی دوکەڵی ئاخت قەت هەا مەڕێژە
لەپێی دەستی تەڕ.
بە نێو ڕوخساری یەزدانا بێنە
تەرمێ بسپێرەو تەرمێ بهێنەو دوانیش بنێژە
سەرت هەڵبڕە .
دوو دڵی لادە لەو تەنیاییە
لە چاوی هەوڕا گڕکانێکی داد بێنە خوارە

# ـــــۆ

سەیرێکی شەرمو جوانترین دیمەن لەگەڵ گریانا
یەك دوو گۆچانێك – شەقشەقەیەکیش بەسەر دارەوە

* * *

بۆچی هەسان خۆی لەشمشێر ئەسوێ
بەر دەستێ ئاگر ئەدا بە پوشێ
ئەگەر ئارەزوو هەوەسی نەبێ بۆ تاقە ماچێ
ستەمە ئاگر
بەر بێتە دنیای دارستانێك‌و
شمشێریش لق‌و پەلی هەڵپاچێ
گەر بەربەست دەمی نەکرابێتەوە
بۆ هەڵ لوشینی گەرای مەرگەموش
دەنا بۆ شەقام ئەبێتە کابوس
ئەبێتە خورەی تووڕەی دەریا لووش
جەربەزە دەمی پڕە لە ژەهرو
قاچی گوشراوی دەمی تەڵەیە
دەنا بۆ بەهار
بەچکە وەرزەکەی مەرگە پەڵەیە.

* * *

پریاسکەی سەر شان دەستێکی ئۆخەی
نەیهێنێتە خوارەناکرێتەوە
چاوی پڕ لە ژان
بە پەنجەی زبری ماندوو بوون نەبێ
فرمێسکە باران ناسڕێتەوە
بۆچی کزەبای ناو دەشتی خڕنوك وەها تووڕەیە
ئەشێ تانجەرۆ هەمووی ببیەستێ
تۆ بڵێی دەشتی پەراسوو شکاو
لە ڕاوی ڕەشا
چەند گۆڕی ون بووی تیا هەڵ نەبەستێ
ئەمە شارێکە ڕێی سەدان دەرگا لە سنگی دایە
دەرگا تا ئێستا هاوەڵی دەستی باران‌و بایە
بۆیە نازانرێ
نهێنی قیبلەی ئەم ڕەشە شارە وا لە کوێ دایە
ئەمە شارێکە
لەپڕا نەبێ لافاو ناتوانێ هەنگاو بنێتە شەقامەکانی
لە شەوا نەبێ
بارەش ناوێرێ پوشکە بخاتە ناو ماڵەکانی
ئەم شەو چ دەنگێ دۆستی بلوێرە
چ سۆزێ تێرە
بشێ لەمەودواش
وەرزی داهاتوو هەر بێ بە تەم
وەك چۆن بە دەیان
کۆڵانی گەورە بووە بە مەیتەم
ئای ئەم شەو چی‌یە؟
چەند نینۆك چەقۆی ڕومەت برینە
چەند کێل ئامادەی ناو لێ‌نووسینە
چەند دەرگا ترسی لە دزین نی‌یە
چەند مرۆڤ نووستوی سەر زەمین نی‌یە
ئەم شەو چەند خوڕیە
دێ بە ناو دڵی خەوتووی لاپەنا
ئەم شەو چەند مەلی فێ‌گرتووی لانە
سنگی خۆی ئەدا بە دارەبەنا
چەند مەل ڕاکردەی دوای هێلانەیە
چەند خەوتوو وون بووی ناو کولانەیە
ئەمە شار نی‌یە

كۆمەڵێ گڕی بەیەکا چووە
سنەوبەرێکە بۆ هەڵوەرینی
بەرەو بارەگای هەور هەڵچووە
ئەمە ئاوازە خاوەنی نی یە
ڕیزێ سەختی یە دەوەنی نی یە
ئەمە ئاوایی حەزرەتی غەمەو حەزرەت تەمەنە
پێش سەدەی ئادەم لەدایك بووە
ئەمە جادوە
لە گشت ڕوژێکا جارێك کوێر ئەبێ و
گەڕیش بە باڵای کاڵیا هەڵچووە
کێ پەنجەی ژانی تێ نەتەزیوە، پەنجە هەڵبڕێ؟
کێ بە ئێشەوە
نەچۆتە جێ ژووان بێتە پێشەوە؟
گەر ئەتانەوێ هیوا بەکتریا نەنێتە باوەش
بگەنە بەربەست
بگەنە خامەی گریاوو ماتی نێوان پەنجەو دەست
دە ئەمجارەیان کێ مردوو شۆرە سەری هەڵبڕێ؟
کێ یە ئێشکچی دەم ئاگردانی
ساردو کوژاوە ڕێگا هەڵـدڕێ ؟
تۆ ئەی شارەکەی ڕووت و بێ بەرگ
چۆن بوو وەرزەکان لە یەکتر تۆران ؟
لە کوێوە پەرکەم سنوری بڕی
کەڤی بە دەمی دوایەکا باران ؟
ئای ئەبێ ئێستا چەند گوڵە کێوی
دیداری بەرزی بیرچوو بێتەوە؟
چەند پاچ بە ناخی ئەرزا ڕۆ ئەچێ و؟
چەند دەستیش بە ئێش بەرز بێتەوە؟
هەتاکو سەیوان وەها برسی بێ
خوێن ئەتەزێتە چاوی ئەرخەوان
خۆڵی گۆڕ هەوا بێ هێنێ و بیبا
دەستێ نایسڕێ تۆزی ناو چەوان.

ئیسماعیل تاها شاهین

# دل و دلبەر

دلێ من! دلەك مە هەبوو
ئاگەە ژ تشتەکێ نەبوو
دەرگەهێ ئەشقێ لێ ڤەبوو
پیت و گوڕی لێ ڤەحەوا

بەربەر گوڕی بێ زێدەکر
کەسێ ئاڤەك پێدە نەکر
دلبەر ب خەملا خوە تە کر
ئەڤینێ ئاگر بت ڕەوا

ژ سەد ڕەنگان تە دا کاتە
من خوە ژ دین کر سەبا تە
بێ بەرامبەر من دل دا تە
بێ دلم دلبەرێ لەوا
دلبەر دلێ من تو ساکی
کەسێ وەك وی ب چاڤ ناکی
ب سەد ڕەنگان ئەڤرۆ باکی
دلبەر هەواری هەر ئەوە

ئەو ل سەر سۆزا بەرێ
ئەوە مزگەڤتا تە پەرێ!
ژ دین و دنیا دلبەرێ!
تەنێ ئەڤینە وی نەوا

پەیڤێن گران:
ڕەوا: جائز
سەبا تە: ژبەر تە
باکی: گازیکی
هەواری: ئەوا بێ د هەوارا یەکێ بچت
نەوا: نغمة

# دوو گۆتن پتنێ

زیاد نقیب بروراى

*١*

دبێژن :
ئەگەر کانی . . .
ژ بن تەحتو نزارا
ژ بن کەڤو زنارا
نە زێنو . .
بدەن رێ . .
نە بنە رویبار . .
سیپەلو پێل
ژوردا بێنو . .
تم سینگێ لوەغەرێ . . .
جوتیارێ ژار . .
هەر دێ مینیت
زێڤارو شاش
گازندو دالەهی یا تم . . .
ژ ئاڤێ کەتن . . !
دێ کەت گازیو هەوار . . ! !
هەی ئاش . . .
هەی ئاش . . .
بەرێ کوتەلێ
وەرگێرە . .
ناڤ وارێ من
دەراڤکەکی
ژ من را .
بکە دیاری
ب کە شاباش . . . ! !
ب کە شاباش . . . ! !

* * * *

*٢*

دگێرنو . .
دبێژنەڤە . . !
ئەگەر دلدارو ئەڤیندار . . .
لژێر سیبەرا . .
دار چنارا . .
لسەر لێڤێن رویبارا . .
بەژنا زراڤو رند . .
دبەر باکێ چیایێ بلند . .
دهەژینیتن . .
نوی ژەن نە کەن
سوزو ڤینێ . . .
هێڤ نە کەن داستانا مەمو زینێ . .
چ جار لژێنێ
نا بیت وەرار . .
بەستو بەیار
نا بنە ئاقار . . . ! !
نا بن دەرار . . . ! !

# سێ دڵۆپ ئەڵماسی سەوز

*محمد أمین پێنجوێنی*

بینایی چاوان

خونچە . . . نەپشکوتووەکان
شکۆفەی بەرۆکی چەپ . . !
ئەگێڕنەوە ئەبجوونەوە !
هەزاران ساڵ پێش ئێستاکە
لەم دەشتو کەژو لەم خاکە
ئەستێرەیەك برووسکەیەك
چەند دڵۆپێ ئەڵماسی سەوز
لە ناو جەرگەی تاریکستانی
ئاسمانا
لەگەڵ عیساو لەگەڵ موساو
پیاو چاکانا . . .
لە خزمەت بینای چاوانا
کاتێ گەردوون ئەیدا وەنەوز . . . !
بەرەو میان ، دوو ئاو . . . !
کشا . . .
شەبەق بەرجەرگی شەودا . .
لەسەر نەخشەی وڵاتێکدا
کە تخوبی کەژو کێوی
هێڵەکانی
بەدانی کوێرەمار کێشراو . . !
کەوتە خوارێ !

* . * . *

پەرژین ، لافاوی بورکانە
چیمەن ، سوژن ، ئەسرین پرژێن
ژنشك سەربڕی خەوی گیان
شەقام خەنجەری دەبانە
گوڵی لاولاوی تێ ئاڵاو . . !
بە تارمایی و بەخێو تەنراو . . .
جنۆکە زا ، دێو ترەکی . . . !
ئەو مرۆڤەی لەم زەوییەدا
هاتنە بوون ،
هەر لەو ساوە
سەراسیمە کەوتە تەکی . . !
فرمێسك و خوێنیان وەك ڕووبار
بە پڕتاوو بەتاو تکا . . !
هەزاران چرۆ پشکووتن
سەدان نەمام ڕەشماڵی خست

«بەو» سوێراوکە لێلو تەڵخە . . . !
پاراو بوون ئەگەشانەوە
بۆیە تامی «بەری» سوێرە . . !
گوڵیش هەندێکی بێ بۆنە . . .
ئەی روحیانەتی مردووان
ئەی لاشە تەرمی زیندووان . . . !
لەو چاخەوە ئەم بنارە
گورگ تیایا ئەمرخێنێ
ئێسقانی تەڕ ئەپروێنێ

. • . • .

## (٢) فیزی ئەسپە شێ

کێ.. ئەڵێ خاك قابلە
کە . . شەرمەزار بێ . . ! ؟
یان . . کێو ئەیەوێ
کە ملی خوار بێ ! ؟ . .
نەبووە . . . داری بەڕووکرنوش بیا .
بۆ . . گڤەو هاژەی ڕەشەبا . . . ؟ !
کەی ؟ بووە کەڵ ! . . .
پێشرەوی خۆی دابێ بە دەڵ . . . ؟
قەت.. بووە؟ پیرە هەڵۆ
لانەی بباتە لای نەوی..؟
کەی بووە خنجێر..؟
کالانی کەل بکاو لووتی نەوی؟
قەت بەبەستی پووش بووە ! ؟ . . .
ڕووی ڕووبار ڕوبە هەوراز وەرگەڕێ . . . ! ؟
کەی (بەور) چەشە کراوەو دەستەمۆ
«کەوی» ئەوێ . . ! ؟
کوا . . ؟ لە جێی سمکوڵو غوبابی ! . . .
فیزی ئەگرێ ! ئەسپە شێ . . . ؟ !

چۆن . . ؟ لە مزگەوت لێدرا ناقوسو نەی
کێ . . ؟ لە مەیخانەو خەرابات
«وانەی» خاچ فێر دەبێ . . ؟
کەی . . کەژاوەی کۆشی سۆزانی
بڵند گۆی نوێژە کەی ؟ ؟ ! . . .

. • . • .

## (٣) خوێن بێ فرمێسکە . . . سلێمانی . . . !

هۆ بووکەکەی تارا
لە خوێن هەڵکێشراوی
زاوا لە حەوتەدا گلاو !
سلێمانی
تۆی دایکە میهرەبانەکەی
مەمکەکانت شیرو شەکر
بە پرچی خۆ کوڕ خنکێنراو !
سلێمانی
باوکە پشت کۆماوەکەی
دەستی ڕوژگار
لەبەرچاوا جەرگ
لەسەر بەرماڵ ! براو . . !
سلێمانی
ئاسکۆڵەکەی شوان ، گورگی . . . !
دووجار
بەقوربانی کراو . . . !
سلێمانی . . .
ڕاوی مێژووی شکۆی تۆیە
چ بۆمبابێ چ دۆزەر چ لافاو . . !
سلێمانی .

. • . • .

# سەراب

جەمال غەمبار
١٩٨٧

«یەکەم»

بۆشەوانێك،
کەرێژوباری زەمەنی تۆ، رائەوەستێ ...
بۆ شەوانێك،
کە قەڵای درزبردووی گیانی تۆ،
داوای دڵۆپێ شیعر ئەکاو
ئەو شەقامانەش تاریکن،
تیابانا وشە، بێچراو، چراووگە..!
بۆ ئەو شەوە نەگریسانە ...
ئەو ساتو چرکە تەڵخانە ..
کە بێنانو،
بێ گیرفانو،
بێ ناسنامەو،
بێ ئافرەتی!
فرمێسکێ بکەرە سەرین
هیچ چاوێکی ئەم دنیایە، نەیرشتێ..
گەڵای زەردی هەناسەشت،
بۆ بارانێ، هەلوەرێنە
لە ژێر بەرگی ئەتمۆسفیری
ئەم زەوییە پڕ
تاوانەدا، نەباریێ!
دە، ئەی سەراب ...
ئەی پانتایی شینی رۆحم ..
بە باڵی قورسی تینوێتی
دوێنێی سپی و
ئەمرۆی رەش و
سبەینێی سووری تەمەنما،
بۆلات هاتم ..
یان تینوێتی، تەنها رۆژێکی ئەم رێیەم،
بخنکێنە ...
یاخود، هەموو جەستەی شینت،
وەکو خوێنی دوژمنەکەم،
لەپێکێکا، ئەخۆمەوە..!

* * * *

ئەی سەراب، ئەی چاوی دەریا ..
بەم سارایەدا، تێپەڕیم،
توێشووم، چەند وەنەوزێکی قورس بوون ..
دیدەکانم، رووناکیان لێ ئاوابوو...!
«زەنگی بیابان،
لە گوێمەوە، رژایە چاوەکانمەوەو
پێڵووەکانی پێ هەڵبڕیم ..»
چی ببینم؟!
لە دوورەوە، سەرابێك بووی، لەچاوانما ..
کاتێ گەیشتمە سەر سنگت،
ئەمجارەیان چیی ببینم؟!
نەك تەنیا، سەرابێك نەبووی ..
نەك هەر رەنگێکی درۆزن ..
نەك لێکدانی ئاسۆی شینو
لێواری خاك ..
«تۆ، دەریابووی ..
فێرە خنکاندت کردم» ..
ئەی دەریایەك،
وەك شارەکەم،

بەزاری بەفرو رەشەبا ئەدوێ..!
ئەی دەریایەك،
وەك پەلە چنارێکی سووتاو
پەلەوەرێ، بۆنت ناکاو،
دەنووك بۆ دلۆپێکت، ناهێنێ ..!
ئەی دەریایەك،
تووڕە بوونی شەپۆلە سەختەکانی خۆت،
بەرەو دەستی قلیشاوی،
خاکێ ئەبەیت
ئەتخواتەوە ..!
«.........!»
«.......!»
ئەی دەریایەك،
ئەگەر سامی دەریات نەبێ،
نازانم چی ترت ناونێم؟!

* * *

**«دووەم»**

هات، پالتۆیەکی پێ بەخشیم ..
کات، هێشتاکە
لەم دیو شاخی ئێوارانی ژوور سەرمەوە،
ڕێگەی ئەبڕی ...
جێگا، شەقامێکی تەڕبوو ..
ماچم‌کردو، جیا بووینەوە ..
بۆ بەیانیی،
دەنگی باران
شووشەی پەنجەرەکەی، بڕیم ..
هەواڵ گەیشتە ماڵەکەم،
-ئەمشەو پیاوێ، بۆنی مردنی کردووە..!
لە تابلۆی سەر دیواری
ژووره چۆڵەکەی خۆیەوە،
چۆتە چاوی« مریەمەوە» ..
«عیسای» بە منالی دیوه ..

ئەمشەو پیاوێ،
بۆتەوە بە، منالێك‌و
لە ناو باوەشی مریەمدا،
فرمێسکەکانی سڕیوە ..!

* * * *

هات، پالتۆیەکی پێ بەخشیم ..
لە ناو گیرفانی لای چەپیا،
جووتێ چاوی قاوەیی ڕەنگ،
زیتەیان دێ ..
ئەو چاوانەم،
لە ڕارەوی، شێداری شەوە رووتەکانەوە
بۆ هێناوی ..
بیاندوێنە،
نامەیەکیان هەڵگرتووە،
بیخوێنەوە،
[ هاوڕێم .. سەراب ..
ئەم کاتەت شاد ..
ئەم چاوانەم، لاشەکەمیان بەجێ هێشت‌و
بۆ وڵاتی دڵت هاتن ..
ئەو پالتۆیەش، ڕۆحی منە ..
بیکە بەرت ..
وا، بەم شەوە .. بۆنی مەرگم،
کاسی کردووم!
هەڵوەدام پەردووی جەستەکەم،
کۆکەمەوە!
ئەمشەو، ئەمرم ..
بەڵام هەرگیز، دووچاوی قاوەیی ڕەنگ‌و
پالتۆکەمت، لەبیر نەچێ!
ئەمشەو، ئەمرم ..
منیش لە سەفەری دووری، ئەمجارەما،
بۆ دنیای سپی زیندووەکان ..
ئاڵای شری، عەدەمێکی‌تر هەڵئەگرم ..
ئەمشەو،

ئەمرم ..!].

* * * *

هاورێم سەراب ..
ئێستا کڵپەی گڕی مردن،
شارای تەمەنی من ئەخواو
لە ئەشکەوتی بێهەناسەی ئەملاشمەوە،
وا لەشکری رەشی، تەتەر
بەربونەتە، وولاّتی جەستەی ئافرەتێ ..
ئەویش لەسەر،
پردی رووخاوی دوودڵی،
گومانی هەیە، نازانێ،
لە سێبەری هاوارێکا
ئارەقەی توورەیی بسرێ،
یان لەژێر قامچی لەزەتا،
چاوی خامۆشبوون، لێك نێ؟!
هاورێم سەراب،
من ئەمرمو، دووایەمین دێری نامەکەم،
تەواو ناکەم!

* * *

**«سێیەم»**

ئێستا، دوو پیاوو ئافرەتێ،
مەرگ، دەستی ماچ کردنو
منیش لە نێوان دوو چاوو پاڵتۆیەکا،
پاشایەکم، مەملەکەتەکەم گریانە ..!
چۆن رێ ئەدەم، بێ پەساپۆرت،
کەسێ بێتە سنوورمەوە،
هەتا ئێستاش، وابزانێ ..
لە ناو ئینجانەی گریانا،
گوڵی فرمێسك .. تەنها لە ژێر
سایەی برژانگی ئافرەتا، ئەروێ ..!

●

# ڕەنگێت مرۆڤا

— ١ —

سەعۆیێ
سەر کەچەل
چەتۆیێ
چاڤ تەبەل..
ئو لەزگوێ زك شەل
هەمی شۆب[1]
نیشانێت خودێنە.

— ٢ —

سەلمایا
جزیری،
سۆر گولا
ل ناڤ باغێ میری
ژتێهنا عشقا تە
مەلێ ژار ب پیری
هەر چاڤ، ل بورجێنە.

●

**بەیارباڤی**

**- دهوك -**

●

- ٣ -

بەهشتا
ب‌کانی، ئو رویبار
پڕی باغێن، پڕ سێڤ‌و هەنار
بۆ دیتنا دێمی‌ته
سەرێت هناهەرۆژ
هەڤدە جار.. لسوجدێنه.

- ٤ -

دەلالا
بەژن‌و بالا شەپال
کری‌یە بنستر
داخابیر
نەمینت بێ ناڤ‌و پر
هزار ساڵەو.. پتر
وێ رستك‌و مۆریك
ڕەق‌بەرێت بەستێنه[٢].

- ٥ -

ولجیهانەکا بێ ناڤ
سەد هزار کەلواشێت
بسەرو چاڤ
خوه ژبۆ بەگێو ئاغا
دکەن ئاخ‌و پێلاڤ
ئەو ژی مرۆڤن‌و...
ل‌چارخێ بیستینه!!

(١) شۆب: نەساخی، ئێش، دەرد.

(٢) بەرێت‌بەستێ: ئێت‌گوتن بۆبەرێت ئازاوب سەنگ

جیهانی چیرۆک



# تێکەڵبوونی دیمەنەکا

**حەسەن جاف**

ژیانیکی سەیرە، ساڵ لەچاوتروکانیکا دەڕوا، کاتێك ئاور دەدەیتەوە چارەکە سەدەیێك تێپەڕیوە. تا منداڵی خواخواتە ساڵ زوو بەسەر بچێ‌و سمێڵ بۆز بکەی‌و گوێزان بە ریشتدا بهێنی کە گەورەش دەبیت حیسابی مانگ‌و رۆژ دەکەیت‌و دەتەوێ بە سنگی سیحراوی ساڵەکان بە ناخی زەویدا داکوترێن‌و لە جێی خۆیان نەبزوێن، لە گەڵ ئەوەشدا هەر دەڕۆن، کەی بوو ئەم دیمەنت دیت، یادگارەکان لە ناخی مرۆڤدا خۆیان حەشار دەدەن‌و وا دەزانی هەموو شتێکت لە بیر چوەتەوەو زامە کۆنەکان سارێژ بوون تا لە پڕ شتێکی بچکۆلانە وەك رەشەبا دێت‌و هەموو شتێ بەسەر یەکدا دەداو قەتماغەی رابوردوو دەکرێنێ‌و سەر لەنوێ خوێنیان تێ دەزێنێتەوە.

کە ئەم بەیانیە بۆ یەکەم جار، دوای چارەکە سەدەیێك، پێت نایە کۆلیج، دەتوت گەنجە هەرزەکارەکەی پێش بیست‌و پێنج ساڵی، سامێکی سەیر دەروونتی گرتبوەوە، پێ یێکت دەبردو ئەوی دیت دەگێڕایە دوواوە، لە خۆت دەپرسی چی بکەم؟ چۆن دەس پێ‌بکەم؟ دوای بیست ساڵ مامۆستایەتی ئەم ترسە چیە؟

کە لە درگاکە چوویت بەو دیوا یەك دوو قوتابی سە راکێشایت، دوورە پەرێز، بە تەنیا وەستابوون، لە کاتێکدا ئەوانی د کوڕو کچ تێکەڵ ببوون‌و کۆڕی قسەو پێکەنینیان گەرم کردبوو. هە بوو، دووان دووان، سەریان نزیك یەك خستبوەوەو چپە چپیان ب

یەکەم رۆژ لە کەرکووکەوە خۆت‌و چەن برادەرێکت، سەرو جا گرت بە دەستەوەو بەرەو بەغدا، بە درێژایی رێگا خۆشی‌و تر دەروونتا لە مل ملانێدا بوون. زۆرت پێ‌خۆش بوو ئەم ئەزموونە ببینی‌و بچیتە جیهانە سیحراویەکەی بەغداوە کە لای تۆ شتێکی عاجباتی وابوو، چونکە بە درێژایی ئەو تەمەنە کورتیلەیەت لە کە دەرنەچووبوویت، دەشترسایت، دونیایێکی تازە بۆ هەرزەکارێکی ئەزموون، دەستت لە گیرفانت‌دا پێنج دینارە تاقانەکە وردکرابو هەشت پەنجایت لێ دابوو بە کرێ ترومبێل، دەبێ بە پاشماوەکەی م لە بەغدادا بەسەربەریت، بۆ خواردن‌و هات‌و چۆو هەموو شتێ

خەمی جێگەت نەبوو، هاوڕێیەکتان ژوورێکی گرتبوو ئێوەش هەرحەوتتان لە گەڵ ئەو دەتانکردە هەشت، لێکت دابووەوە چوارسەر فلست کرێ بەردەکەوت.

یەکەم بەیانی وەك کێچ ڕاپەڕیت، دەتویست پێش هەموان ئاودەس و دەس شۆرەکەت بەرکەوێ، هێشتا بە تەواوی ڕیشت نەتاشیبوو کە شەپۆلیان داو جیٚیان پێ لەق کردیت، لە پاسەکەشدا هەر بەو جۆرە بە تەکانو پاڵە پەستۆ نەبێ جێت بۆ ناکرێتەوە، ناشێ لە شیشەکە بچی بەو دیوا، ئەو شیشە نمرەیەکو نمرە دوو لەیەك جیا دەکاتەوە، ئەویان بە بیست فلسەو ئەمیان بە دە، دە فلسەکەی ترت بۆ ئەوسەر هەڵدەگرت. کە لە دەرگاکە خۆت کرد بەو دیوا، پۆل پۆل کوڕ وکچ دانیشتبوون، جلو بەرگی تازەو ڕەنگاو ڕەنگ، هەندێکیان وەستابوونو یەکی باوەشێ کتێبو دەفتەریان لە بن دەستابوو خەریکی قسەو پێکەنین بوون بازێکێشیان دووان دووان یان بە ڕێڕەوەکەدا دەهاتنو دەچوون یان لە سەر کورسیەکان دانیشتبوونو چپە چپیان بوو، نەتوێرا لە کەس بپرسی بەشی جوغرافیا لە کوێیە،

سووچێکت گرتو خۆت گرمۆڵە کردو لە ژێرەوە تەماشای قوتابیەکانت دەکردو دەستێکێشت بەسەر گیرفانەکەتەوە بوو، نەبادا پارەکەت لە گیرفانت دەرپەڕێو باڵ بگرێتەوە، کە بیرت لە پارەکەی گیرفانت دەکردەوە گشت چیا بڵندەکانی وولاتەکەت چۆکیان بەسەر سنگتدا دادەداو هەناسەیان سوار دەکردی، لە گەڵ ئەوەشا بەزەییت بە خۆتو بە پیرەژنەکەی نەنکتا وەهاتەوە، دوای بانگی خەوتنان پنەو ساجو تیرۆکی دەدا بە شانا بەرەو ئەوماڵەی نانی بۆ دەکردن، تا درەنگانێ هەویری دەشێلاو لە گەڵ مەلا بانگدانا ڕادەپەڕیو دەستی بە نان کردن دەکرد تا مەغریب، ئەوجا بە پشتی چەماوەوە دەهاتەوە، خواردنی بۆ دروست دەکردیو پارەی دەخستە مستەوەو خۆی بۆ گەشتێکی نوێ ئامادە دەکرد. پارەکەی گیرفانت ئاوا پەیدا دەکرێ، باکەمیش بێ هەر ئەوەندەی لەدەس دێ، دەستێکی دیکەت بە گیرفانتدا هێنایەوە، پاکەتەکەت لە گیرفانت دەرهێناو بەدەم رویشتنەوە جگەرەیێکت داگیرساند تا گەیشتیتە ژووری مامۆستایان، جانتاکەی دەستت داناو دانیشتی، خەیالەکانت سواری کۆڵت بوونو وازت لێ ناهێنن، کچو کوڕێك سەرنجیان ڕاکێشایت، قسەیێکی پی‌گوت، ڕوویان کردە باخچەکە، هەستایت تەماشات کردن.. زۆر لە مێژ بوو دەتویست قسەی لە گەڵدا بکەیت، تۆ لە پۆلی سێدا بوویت ئەو لە یەك، خۆشت نەتدەزانی چ شتێکی سەرنجی ڕاکێشاویت، دەتویست قسەی لە گەڵدا بکەیتو رازی دڵی خۆتی لابکەیتەوە، بەڵام چۆن... چۆن بەم هەورازە سەختەیا سەردەکەوی، کە لە گە- خۆتا بیرت لێ دەکردەوە لەشت نوقی ئارەق دەبوو، ئەی ئەگەر لە گەڵیا قسە بکەیت چیت لێ دێ، هاوڕێکانت زۆریان هان دەدایتو ورەیان بەرز دەکردیتەوە، هەر ئەمڕۆو سبەیت بوو، ڕۆژبوو بە هەفتە، هەفتە بە مانگ، ئەوە چیت کرد دەبیبڕەوە، بڕیتەوە بەڵام چۆن بڕینەوەیێك. دڵت تەپە تەپی بوو، ها ئیستا ها ساتێکی دی لە پەلە پەلیا یان دەتەقێ یان قەفەزی سنگت دەشکێنێو لێوەی دەردەپەڕێتە دەرەوە، هەر دوو لێوت وشك ببوەوەو هەر چەندت دەکرد بە یەك نەدەگەیشتن، هەر چەندە خۆت نەدەدی، بەڵام دەتزانی ڕەنگت هەڵبزرکابوو ئارەق بە ناو چەوانو لاملتا ڕێچکەی بەستبوو

– م... ن... دە... مە... وێ، ب... ت... ن... ا...س... م...

– من بۆ خوێندن هاتووم نەك بۆ خەڵك ناسین

ئیتر وەك بڵێیت دەرووی خێر بووو لێت کرایەوە، یە...سەر ڕووت وەرگێڕاو بە پەلە گەڕایتەوە دواوە، کە هەستت کرد دڵت ...اتوەتەوە سەر خۆیو ڕەنگت وەك جارانی لێ هاتەوەو کزەیێکی گوێزان ...سا ئارەقەکەتی وشك کردەوە، ئەوسا بە خۆتا چویتەوە، چۆن توانیم بڕ...م و قسەی لە گەڵدا بکەم، ئەی بۆ وام بەسەر هاتبوو، دەبێ ئیستە ...یم پێ بڵێ، ڕەنگە سەیرترین شت لای ئەو وەرچەرخانەکەم بووبێ، ...ۆشم نەمزانی بۆو چۆن وا یەکسەر بامدایەوە بەرەو دوا.... وەك بڵێیت ئەرکێکی جەرگ بڕ بووو هەر دەمویست بە چاك یا خراپ لە کۆڵم ببێتەوە ...وای دە ساڵ کە بینیتەوە هەر چەندت کرد لە ڕووت نەهات پرسیاری ئەو ڕۆژەی لێ بکەی، بۆ خۆشت نەتدەویست بەبیرتدا بێتەوە، چونکە گاڵتەو قسەو قسەلۆکی هاوڕێکانیشت بە بیر دەکەوتەوە، کەچی ئەمڕۆ کە بینیت کوڕەکە قسە دەکاو کچەش سەری بۆ دەلەقێنێ هەرچی نەستی ڕۆژانی خوێندنتە سەر ئاو کەوتەوە، ئەو لەمن ئازاترەو کچەش ل...ەکەی مەر خۆم ژیرترەکانی چوونە ناو پۆلت هات، وەك کۆڵێکی گرانت ...سەر شان بێ. هێدیو لە سەرخۆ دەڕۆیتو سەرت داخستوە تاگەی...یتە ژوری ژمارە چوارو خۆتت کرد بە ژوورا، قوتابیەکان هەندێکیان دانیش...وو...و هەندێکی دیکەشیان بۆ جێ دەگەڕا لە دڵەوە پێت ناخۆش بوو کە ...ه...تیان بەه...تنە ژوورەوەت نەکرد، گوێ مەدەرێ یەکەم دەرسە، ... دە...ێ. چاوەڕێت کرد تا هەموان دانیشتن، ئەوجا داوات لە یەکێکیان ...ر... ...رد... داخا، هێشتا هەر لە گەڵ خۆتا تاوتۆت دەکردو بیرت دەکردەوە چۆن دەس پێ بکەی کە یەکێ لە درگای‌دا

– فەرموو وەك دز بە ترس‌و شەرمەوە سەری کێشایە ژوورەوە
– مامۆستا رێم دەدەی بێمە ژوورەوە
– فەرموو بەڵام جارێکی دی دوا مەکەوە
– بەڵێ

قەدەری وەستاو لە ژێرەوە چاوی دەگێرا، کورسیەك لە ریزی پێشەوەو لە ناوەراست کچەکانا بەتاڵ بوو، لەوە دەچوو زات نەکا بچێ دانیشێ.
– برۆ ئەوێ دانیشە

کە دانیشت هەردوو دەستی خستە نێوان رانیەوەو سەری داخست‌و ئارەق زەنگوڵ زەنگوڵ بە ناوچەوانیەوە دەبریسکایەوە، بەخوا ئەمیش وەك منی لێ قەوماوە
– مامۆستا بێمە ژوورەوە
– فەرموو

چاوت گێرا، تەنها کورسیەك لە نێوان دوو کچدا بەتاڵ بوو، هەر چەندت کرد زاتت نەکرد دانیشی، چۆن بە نێوانیانا تێدەپەری بێ ئەوەی لێیان بکەوی، بیرێك وەك بروسکە بە مێشکتدا تێپەری، ئەگەر وابکەم لەوانەیە ئەم ژوورە بلەرێتەوە وەك بوومەلەرزەیێك رووی دابێ یا گڕکانێك تەقیبێتەوە، گەرایتەوە دوواوەو ویستت بچیتە دەرەوە

– بۆ کوێ؟
– مامۆستا ئەچم کورسیەك بێنم
– ئەی ئەوە کورسی‌نیە، بچۆ دانیشە
– ئەوەی لێی تۆقیبویت رووی‌دا، بە ئاستەم‌و لابەلا بە نێوانیانا تێپەریت‌و خواخوات بوو قاچت یا پانتۆڵەکەت بەریان نەکەوێ، کە دانیشتی هەستت کرد وەك هەورازێکی سەختت بڕیبێ، هەردوو دەستت خستە نێوان رانتەوەو ئارەق بە ناوچەوانو لاملتا رێچکەی بەست، هەموو هۆشت لە یەك خاڵدا کۆ ببوەوە، کەی وانەکە تەواو دەبێت‌و چۆن لەم قۆرتە رزگارت دەبێ، چی ئەبوو ئەگەر ئەمرۆ دەفلسم پێ بمایەو بە سواری پاس بهاتمایەو وەك جاران سووچەکەی خۆم لە دواوە بگرتایەو تووشی ئەم بەڵایە نەبومایە، دە فلس ئەم هەموو دەردە سەریەم بێنێتە رێ، ئەگەر دوێنێ شەو نەمدایە بە سەمون، ئەم بەیانیە دەمتوانی سواری پاس بم، نەك بە پێ بیکوتم‌و ئاوا دوا بکەوم... هۆشت لای دەرس‌و مامۆستا نەمابوو، نەتزانی چی‌ی ووت‌و قوتابیەکان چیبان نووسی، هەموو هەست‌و نەستت لە یەك خاڵدا کۆ ببوەوە، کەی وانەکە تەواو دەبێت! دەزانم ئیستە ئەویش هەر بیرلەوە دەکاتەوە، بەڵام بۆ ئەم وابێ؟ ئەی ئەم بیست‌و پێنج ساڵە چۆن بەسەر چووە؟ گوایا هیچ گۆرانێکی تێدا نەبوە؟ چۆن گۆران نەبووە. ئەی ئەوە نیە ئەمان هەموویان بەرگەکانیان وەك یەکە چاکەتێکی نیلی‌و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی، بەس نیە جلەکانیان وەك هینەکەی تۆی پێش چارەکە سەدەیێك زەنگی نابوتی‌و نەبوونیان بۆ لێ نادا. کەواتە گۆرانەکە هەر لە تونێکلدا بووە نەك ناوك، تونێکل ناوك، چیت‌داوە لەم مەسەلەیە دەرسەکەت بلێرەوە.

أە-.. بیرت کەوتەوە کە تۆ مامۆستایت‌و قوتابیەکانیش روویان تێکردویت‌و دەیانەوێ شتێك بڵێیت، تۆش لە دەریای ئەندێشەی دوورو نزیکدا نوقم بوویت‌و هەرچەن خۆت لە داوێك رزگار دەکەیت دە داوت تێوە دەئاڵێ‌و راپێچت دەکا، خۆزگە دەمتوانی وەك قوتابیەك بمێنمەوە، بزانم ئەمانیش هەمان شت لە گەڵ ئەم هاورێ‌یەیانا دەکەن وەك ئەوان لە گەڵمندا کردیان. مامۆستا پەرەو کتێب‌و دەفتەرەکەی کۆ کردەوەو خستیە جانتاکەیەوەو هەستا... تۆش لە ژێرەوە چاوت تێ‌بڕیبو، دەتویست بە زووترین کات بچێتە دەرەوە بیکە لەراهی خوا زووکە، ئەوە بۆ ئەڵێ‌ی ئیفلیجی، دەزووکە شتەکانت کۆ بکەرەوەو بچۆرە دەرەوە، ئۆخەی وا رۆیی، دەی با منیش بۆی دەرپەرم.

هەستایت، نەتزانی چۆن خۆت لە نێوانیانەوە راپێچاو هەستایت‌و بێ سێ‌و دو بەرەو درگای پۆلەکە تێت تەقاند، بەڵام لەجێ‌ی خۆتدا چەپەسایت‌و چاوت ئەبڵەق بوو، کچێك خۆی دابوە بەر درگاکەو یەکێکیشیان توند قۆڵی گرتی‌و وتی.
– ئەرێ ئەوە تۆ چیتە، ئەمە مانگێکە دەوام دەکەین، نەقسە لە گەڵ یەکێکمانا ئەکەی، نە رۆژباشێکمان لێ دەکەی، بۆ...؟ ئێمە دێوین، جبۆکەین، دەتخۆین پێش ئەوەی بێیتەوە هۆش خۆت، ئەوەی پشتی دابوو بە درگاکەوە ووتی.
– ئێمە هەموو خوشك‌و براو دۆست‌و هاورێ‌ی یەکترین، دوای ئەوە مەسەلەکە رۆژو دوو رۆژ نیە، چوار ساڵە لەو رۆژە بەدواوە، وا ئەزانم هەندێکیان ئاواتیان بەوە دەخواست کە ئەو مۆتەکەیەیان نەشکاندباو ترسەکەیان نەرەواندایەتەوە بێ ئەوەی هەست بکەیت زەردە خەنەیێك نیشتە سەر روخسارت، دەبێ ئەمان چی لەو هاورێ‌یەیان بکەن، کە تەماشای کانژمێرەکەی دەستت کرد، خۆت کۆ کردەوە بچیتە دەرەوە، تا درگاکەشت کردەوە سەرنجی قوتابیەکانت دەدا، کەس لە جێ‌ی خۆی نەبزوا، ئەویش وەك خۆی دانیشتبوو، تۆ بڵێیت وای لە گەڵدا بکەن؟ نازانم... خۆزگە دەمزانی‌و... چویتە دەرەوە.

# کاڵەک و سەعات

-عومەری عەلی ئەمین-

– لە جیاتی جارێك سەد جار پیرۆزت بێت هاوڕێ‌گیان! . سەعاتێکی دیوار دەبێ چی بێت .

– سوپاست دەکەم کاکە سوپاست دەکەم، منیش شتی جوانم بۆ تۆ دەوێت .

– زۆرم حەز دەکرد وەرت‌گرتایە.... یان بەم بۆنەیەوە من لە دەمێکەوە پرسیارێك لەسەر زمانمەو دڵم نایە دەریبڕم .

– ئەوا بە سوپاسێکی گەرمەوە –سەعاتەکەم لێ‌وەرگرتیت‌و ئەوا پێشکەشیشم کردەوە بەخۆت . بۆ پرسیارەکەشت ، فەرمو سەر ئەم چاوانە

– هاوڕێ! هەموو جارێك کە دەبیتە میوانمان‌و چاوت بەم سەعاتی دیوارە دەکەوێت، هەست پێ‌دەکەم دەکەیتە سەرەنجدانی‌و، بیرو هۆشت بەم لاولادا وێڵ دەبێت‌و هەتا جاری‌واش هەیە قسە خۆشەکانیشت بچڕ بچڕ دەبن، جا ئەگەر لەبەرت گران نەبوایە خۆزگەی ئەوە دەخوازم بمزانیایە چیە کە دەتخاتە ئەو ئەندێشەیەوە .

کە وام ووت، هاوڕێکەم جۆرە سەیرکردنێك لە چاوەکانیەوە هەڵقوڵا هەرچەندەم کردو کۆشا، کەم تا زۆر هیچی لێ تێ نەگەیشتم . ئەنجا سەیرێکی‌تری سەعاتەکەی کردەوە کە بە دیوارەکەی بەرانبەریدا هەڵواسرابوو هێندێکی‌تر تێ‌ڕاماو ، بینیم چاوەکانی لەگەڵ جۆلانەی قەپانی سەعاتەکەدا، ڕاست‌و چەپ دەهات‌و دەچوو جۆلانەی دەکرد، هەر سەرەنجی‌داو هەر سەرەنجی‌داو، وەك بڵێیت ڕۆحیانەتەکەی فڕی بێت‌و ژوورەکەی بەجێ‌هێشتبێو ڕۆیشتبێت... بەلأم دووای ماوەیەك کە هاتەوە هۆش خۆی وەکو کۆڵێکی بەنرخی لەگەڵ خۆی هینابێت رووی تێ‌کردم‌و جێگە دانیشتنەکەی خۆی خۆش‌کردو وەك بیەوێت کۆڵەکەی بکاتەوەو چی تێدایە نیشانم بدات دەستی پێکردو وتی:

لە دامێنێکی دێ یەکەدا بەتەنشت دەرگای قشڵەکەوە کەپرو ساباتێکی لێ‌بوو وا دیاربوو پۆلیسەکان کە ژمارەیان لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێنەدەپەڕی بۆ حەوانەوەی هاوینی خۆیان دروستیان کردبوو، کە دەشتەکانی دەوروبەریشی تا بناری چیاکانی دەوران دەور جێ‌جێ پەنە خاکێکی قاوەیی نەبێت کە بەدەرەوەبوو ئیتر لە دڕکەزە ردەدا زەردی دەکردەوە .

ژێر ساباتەکە بەچوار دەوردا سەکۆی نزم ڕۆنرابوو کە نیوەڕوان ئاورشێن دەکرا، بۆن‌و بەرامەی ئاورشێنەکە کە جاروبار تێکەڵ بە شنەی شەماڵێك دەبوو دەت ووت تۆ لە دەشتی گردەبۆر دانەنیشتوویت بەڵکو ئەوە تایت بە لاپاڵ چیای پیرەمەگرونەوە، جا لەبەر ئەوە پۆلیسەکان ناهەقیان نەبوو کە دەمەدەمی نیوەڕوان گەرما تاوی دەسەند، بیکەن بەپیشەو لە ژێر ساباتەکەدا قایش‌و قرزش لە خۆیان بکەنەوەو قۆپچەی چاکەتەکانیان بترازێنن‌و بە دەرپێی سپی درێژەوە هەتا عەسرێکی درەنگ بۆ خۆیان بە دەم قسەکردنەوە لێ ڕابکشێن‌و بنوون .

جا هاوڕێم ئەمەی کە من ئێستا بۆت دەگێڕمەوە هی پەنجا ساڵ لەمەوپێشە، پەنجا ساڵ زۆرتر نەك کەمتر . ئەمەی ئێستا لە منی دەبیستی پەنجا ساڵە لە پریاسکەی ڕۆژگاردا خۆی حەشارداوەو ئەمە یەکەم جاریشە کە دەکرێتەوە . بەو بۆنەیەشەوە نایگێڕمەوە کە نیوەڕۆ خەوی ژێر ساباتی هاوین، شیرینە، یان بە تان‌و پۆی بیرتێژیی منداڵدا هەڵبدەم.. نەخێر، بەڵکو بۆیە بۆت دەگێڕمەوەچونکە لە ژێر ئەو کەپرو ساباتەدا بەسەرهاتێك روویدا .

ئەوا گەرمای نیوەڕۆیەو پۆلیسەکانیش لە ژێر ساباتە فێنکەکەدا بەکەماڵی ئیسراحەت لێی‌ڕاکشاون‌و خەریکی دەمەتەقێن‌و هێندێکشیان کەوتوونەتە خەوەنووچکێ..

منێکی منداڵی هەشت نۆ ساڵانەش کە ئەو نیوەڕۆیە لەوێ بووم، تومەز فریشتەی چیرۆك لە ماڵەوە بانگی کردبووم بۆ لای باوکم کە یەکێك بوو لە پۆلیسەکان بۆ ئەوەی کە دووای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ، ئەم بەسەرهاتە بگێڕمەوە کە لە ژێر ئەو کەپرو ساباتەدا روویدا .

ئای لە زەمانە کە چەندە بەئارامەو چەندە بەپشووە! ئای لە ڕۆژگار کە چەند بە شێنەیی‌و لەسەرخۆیەو چۆن شتە شاراوە بەستراوەکانی ناو توێیەکانی ؛ خۆیان پێ ڕاناگیرێ‌و هەر سەر هەڵدەدەن‌و هەر دەردەکەون‌و خۆیان نیشان دەدەن..

بەڵێ هاوڕێی ئازیز! لەو کاتەدا کە شنەی شەماڵی ژێر کەپرەکە یاری لەگەڵ وەنەوزەخەوی پاڵکەوتووەکاندا دەکردو منیش بە نووکە چەقۆیەکی کولی پێ‌دەسکەوە بۆ خۆخلافاندن لەسەر کۆڵەکەیەکی ساباتەکە بەپێ

..ەنگی خرمەخرم خەریکی هەڵکەندنی ژمارەی (١٩٣٧) بووم، دەنگێگی نزم بە هەچە هەچە خامۆشیی ئەو ناوەی شڵەقاند یەکەم کەس لە پۆلیسەکان کە سەری هەڵبڕیو ڕووەو دەنگەکە ڕووانی، بینی وا پیاوێکی کەواو سەڵتە لەبەر گوێدرێژێکی بەبارەوە داوەتە پێش خۆیو بە ڕێگای لای قشڵەکەدا بەرەو دێیەکەی پشتەوە بەپەلە لێدەخورێت .

–بارەکەت چیە کابرا؟

کابراش وەك بە زۆری زۆردارەکی بیهێنە وەلأم دەنگێکی لێوەهات گەیشتە کەپرەکەو نەگەیشت... من تێنەگەیشتم وتی چی، بەلأم باش‌چاوەش وادیاربوو گوێچکەی بۆ ئەو جۆرە دەنگانە زۆر سووك بوو، بۆیە وەك کێچ لە خەوەکەی ڕاپەڕیو وتی:

– کاڵەك!!؟ جا لەو وەختەدا کێ خوا کاڵەءکی دەداتێ؟

شت لەوە چاکتر دەبێت؟ ئادەی بانگی کە بۆ ئێرە، خۆ ئەو سەگبابە سەلامیشی نەکرد!

لەم کاتەدا کە منیش‌سەرەنجی باش‌چاوەشم دەدا ؛ ڕووخساری لەبەر چاوم تەواوی گۆڕانێکی بەسەردا هات بەڵکو لەو کاتەدا ڕووخسارو دەمو چاوی کوتو مت وەك کاڵەکێکی فاتەبۆرەی دەنواند . ئەنجا پێش ئەوەش قسەکەی تەواو بکات یەکێکی ترپان خوڕیە پیاوەکە:

– بیهێنە بۆ ئێرە کابرا! بارەکەت بێنە بۆ ئێرە !

ئیتر پۆلیسەکان هەموو ملەتاتکێیان پێکەوتوو کابرایان دایە بەر لێزمەی تێروانینی خۆیان . پیاوەی تاینیش هەر وەك بەتەڵەیەکەوە بوو‌بێتو ڕزگاربوونی نەبێت . دووای تێرامانێك بە ناچاری ملی گوێدرێژەکەی وەرچەرخاندو بە نابەدڵیەوە بەرەو کەپرەکە هاتو زمانی حاڵیشی دەینالأند: بریا ملم بشکایەو بۆ ئەم دێیە نەهاتمایە .

کە هاتە پێشەوە پیاوێکی دەستەی کەمێك ناوشان پانی لەڕ، گەنم ڕەنگێگی خۆر بردووی ناوچەوان پان. تاڵە تاڵە مووی سپی کەوتبوە سەرو ڕیشو سمێڵە نەتاشراوەکەیەوە. چاوەکانی لە ناو ئەو ڕەشاییەدا دەیان ڕوانیو پانایی سنگە رووتەکەشی بە تووکێکی ڕەشی شاش داپۆشرابوو. پارچەچامانەیەکی‌شڕی بێکڵاوی وەك بووکە بەبارانێی بەسەرەوە ئاڵاندبوو. پەنجەکانی قاچی یەك‌یەكو دوودوو لە کونی کلاشە بن لاستیکەکانی پێیەوە لەگەڵ دەرەوەدا چاوشارکێیان دەکرد. کراسو دەپێیەکەی ژێر کەواو سەڵتە شڕەکەی بەریشی. لە چڵکنیدا هاواریان دەکرد باوەڕبکەن خاوەنیان مشەمایین..

گوێدرێژەکەشی لە ژێر قورسایی هۆڕەکاندا بە ئەبڵەق دەیڕوانیە پۆلیسەکان. لەوە دەچوو بڵێ: ئەو دەستانەتان ماچ دەکەم زوو فریام‌کەونو ئەم بارەم لە کۆڵ بکەنەوە .

پیاوە بە ناچاری سلاوێکی فڕێدایە ژێر کەپرەکەوەو ئەنجا پرسی: دەیکڕن؟ پۆلیسەکان هەرکەسە لە جێگەی خۆی ڕاست‌بوەوەو هێندێکیان لە ژێر لێوەوە سلاوەکەیان سەندەوەو وتیان:

– ئەی لە تۆ وایە بۆچی بانگمان کردوویت؟

– ئەی پێت ناخۆشە لێت بکڕین؟

– ئەگەر پێت ناخۆشە لێت بکڕینو بە دیاری بۆت هێناوین ئەوەیان شتێکی ترە.

دووای ئەم وتو وێژە من هەر ئەوەندەم لە بیر ماوە بینیم بارە کاڵەك ڕێکراوەو کۆمەڵ کۆمەڵ بە پێی ژمارەی پۆلیسەکان جیاکراوەتەوەو زەردو سوورو سەوز وەکو فۆسفۆر لەو ژێر کەپرەدا دەدرەوشێنەوەو بۆنو بەرامەیەکیشی بڵاوکردۆتەوە مرۆڤ مەست دەکات، وادیاربوو دەیان ویست لە ناو خۆیاندا بۆ دابەشکردنەکەی پشکی بخەن... خوا ڕاستەو ڕاستی لاخۆشە لەوەش نەدەچوو کە لێیان زەوت کردبێت، بەلأم لەسەر نرخەکەی ڕێك‌کەوتبوون یان ڕێك نەکەوتبوون ؛ ئەوەیان شتێکی‌تر بوو، چونکە لە ئەنجامدا کە هاتنە سەر ئەوەی یەکجاری نرخەکەی ببڕێننەوە، لەوە دەچوو خاوەن کاڵەك بەو نرخە قایل نەبێت .

ئەمەیانم زۆر چاك‌لەبیرەو هەروا دەزانم ئێستایە لە ژێر ساباتەکەدام، باش‌چاوەش لەوسەری کەپرەکەوە دانیشتبوو، پیاوەکەش لەم سەرەوە بەسنگە رووتە پانە تووکنەکەیەوە بە چیچکانەوە بوو جا هەر کە هاتنە سەر ئەوەی نرخەکەی ببڕێننەوەو خاوەن کاڵەك بەو نرخە قایل نەبوو، هەر ئەوەندەی خۆش‌بوو ناوچەوانی گرژکرد، جەنابی باش‌چاوەش ئاگر گرتیو پری لێدایە کاڵەکێکی دەستەی پێگەیشتوو، بە هەموو هێزێکیەوە تێی‌گرتو نەڕاندی:

– ئەی سەگی سەگباب خۆ نیازت نیە کاڵەکەکە باربکەیتەوە!

کاڵەکەی کێشا بەسەر سنگی پیاوەداو زرمەیەکی لێوە هات. کاڵەکە بە سنگەڕووتەکەیدا تەپێ بووبە دووسێ لە تەوەو کەوتە خوارەوە، بەلأم زوربەی ئاوو تۆوەکەی ڕژا بە سنگە رووتەکەیداو بە تووکەکانیدا چۆڕاوگەی بەستە خوارەوە.. کە ئەمەم دی بینایم توند توند بەو سنگەیەوە چەسب بوو، بە دەست خۆم نەبوو نەم دەتوانی چاوی لێبتروکێنم، هەتا لەناو ئەو دیمەنەدا شتێکی سەیرتر زۆرتر سەرەنجمی ڕاکێشا ئەویش ئەوە بوو بینیم: دەنکە کاڵەکێکی قەڵەوی خڕیلانە بە لینجاوی کاڵەکەکەوە بە تاڵێك مووی سنگیەوە شۆڕبوەتەوەو بەڕاستو چەپدا دێتو دەچێتو هەر جۆلانە دەکاتو جۆلانە دەکات، پیاوەی داماویش لە تاو بێدەستەلاتی خۆی هەر چاوێکی دڵۆپێك فرمێسکی تێزاوەو لەگەڵ هەر جووڵەیەکیشدا جۆلانەی دەنکە کاڵەکەکەی سنگی بە گوڕژمتر دەبوو .

دەنکە کاڵەك هەموو هەستو نەستێکی منی بە توندی گرتە باوەشی خۆیو لەگەڵ جۆلانەکردنەکەیدا گوڕژمی پێدەدا.. هەر سەیرم دەکردو

هەر سەیرم دەکرد هەتا دەنکە کاڵەکو دیمەنی پیاوەو بن ساباتەکەش هەمووی بەرەبەرە لەبەر چاوم لێڵبوو..

لێڵبوو ونبوو.. تاریکاییەك بەسەر بینایمدا هات، ئیتر هیچ دیار نەما. کە دەستم بردو چاوم سری، دووسێ میسڵك لە چاوی منیشدا قەتیس مابوون کە بەرابی چاومی گرتبوو .

بەڵام ئەو فرمێسکانەش خۆ وانەبێ دەرەقەتی ئەوە هاتبن کە ئەو دیمەنە بە جۆرێکی ئەوتۆ لەبەرچاوم بسڕنەوە کە ئیتر جارێکی تر نەی بینمەوە... نەخێر. ئەو رۆژەش، ئەو شەوەش، سبەینێکەش تا عەسر، تا عەسریش ئەو دەنکە کاڵەکە لەبەر چاوم بە تاڵە مووەکەی سنگیەوە هەر جۆلانەی دەکردو جۆلانەی دەکرد. سبەینێکەش عەسرەکەی کەماڵەکەمان باری کردبوو دەهاتینەوە بۆ سلێمانی، بەرێگاوە لە ئوتومبیلەکەدا زوو زوو دەنکە کاڵەکەکە بە تاڵە مووەکەی سنگی پیاوەکەوە لەبەر چاوم هەر جۆلانەی دەکردو هەر جۆلانەی دەکرد، کەوا دیاربوو لەو داراتەمدا باوکم هەر سەیری کردوومو کە دیوێتی وا من لە ئەندێشەیەکی قووڵدا نوقوم بووم بۆیە دەنگەکەی وریای کردمەوە کە وتی:

—وادیارە دوێنێ زۆر حەزت لە کاڵەکەکە کرد ؛ بۆیە هەر بیری لێدەکەیتەوە... کورە باشەکەم من خۆم نەمویست لەو کاڵەکەتان بۆ بهێنمەوە، کە چووینەوە شار کاڵەکتان بۆ دەکڕم .

جا بۆ ئەوەی زۆرتریش دڵخۆشیم بداتەوە وتی:

—لەگەڵ کاڵەکەکەدا سەعاتەکەیشت بۆ دەکڕم .

باوکم کە وتی سەعاتەکە ؛ مەبەستی بەڵێنەکەی خۆی بوو، پاداشی بەکەمینی ئەو ساڵەم بۆ پۆلی چواری سەرەتایی .

جا لە شار لەسەر گفتەکەی خۆی ؛ بنە گوێیەك کاڵەکی زەردو سووری جوانی لە بازار هێنایەوەو کە هەڵی ڕشت هەیوانەکەی کرد بە بێستانێك، قوتویەکی مقەبای گەورەشی پێبوو وتی: ورە سەیرکە . کە هەڵیپچری شتێکی گەورە کاغەزێکی تەنکی تێوەپێچرابوو لەناو قوتوەکەدا راکشابوو، کە دەری هێناو کاغەزەکەی لێکردەوە، وتی: ئەمەش سەعاتەکەت . ئیتر دایکمو خوشکان هەموو لێی کۆبووینەوە، ئەنجا بزمارێکی بە دیوارەکەدا داکوتاو سەعاتەکەی پێدا هەڵواسیو قورمیشی کردو لەبەشی خوارەوەی شتێکی زەردی خری پێدا شۆڕ بووەوە پەنجەیەکی تێوەژەند، شتەکە کەوتە جۆلانەکردنو، چك.. چك.. چك.. چك.. سەعاتە کەوتە گەڕ .

من چونکە ئەوە یەکەم جارم بوو سەعاتی چاڵمە ببینم دەبوایە بکەوتمایە سەرەنجدانی گشت لەشی ئەو سەعاتە، کەچی وانەبوو، لەجیاتی ئەوە بەبێ ئەوەش بە خۆم بزانم چاوم بڕیوەتە یەکشت چاوم بڕیوەتە یەك جۆلانەکردنی قەپانی سەعاتەکەو جۆلانەکەیم لێبووە بە جۆلانەی دەنکە کاڵەکە شۆڕەوە بووەکەی سنگی پیاوەکەو ناو بەناوێکیش گوێم لە باوکمە دەڵێت:

—ئەنجا بۆیە ئەم ساعەتە گەورەیەشم بۆ کڕیت بۆ ماڵەکە بۆ هەمووتان بێت... جا ئەمە دەرویێ دەقیشم پێداوە ...وەکو دەڵێن سەعاتەکەی سەعاتی چاکە.... ئەو نووسینەش کە بە ئنگلیزی لێی نووسراوە، دەڵێن نووسراوە ئەمە کاری ژاپۆنە .

ئەوا باوکم قسە دەکاتو منیش وەك لە خەودابم یان بڵێیت هەر وەك لەژێر کەپرەکەدا بم و هەموو هەستو نەستێکیشم لە جۆلانەی دەنکە کاڵەکەکە، بڵێم لە جۆلانەی قەپانی سەعاتەکە ناتروکێنم... بەڵام سەعاتی چی؟ هەر کە سەیرم دەکرد ئەو شتە زەردە خرە جۆلانەی دەکرد، من سەعاتەکەم نەدەبینی، چونکە دەمو ودەست لێم دەبوو بە جۆلانەی دەنکە کاڵەکەکە کە بە تاڵە مووەکەی سنگی پیاوەکەوە شۆڕببووەوە .

دە ئەوا پەنجا ساڵ زیاترە نەك کەمتر، هەتا کاتی گێڕانەوەی ئەم رووداوەش کە ساڵی (١٩٨٧)هـ ئەو سەعاتە لە ماڵی ئێمەدا بە دیوارەکەوە هەر گورەی داوێنێ دێتو بەبێ راوەستان هەر جۆلانە دەکاتو جۆلانە دەکات . جارێکیش نەبوو کە سەیری بکەم، دەمو دەست زرمەی سنگی پیاوەکەم لە گوێچکەدا نەزرنگێتەوەوە و جۆلانەکەیم لێنەبێت بە جۆلانەی دەنکە کاڵەکەکەی تاڵە مووەکەی سنگی پیاوەی ژێر کەپرو ساباتەکە .

نەك هەر ئەو سەعاتەش بەڵکو هەر سەعاتێکی چاڵمەی تریش دەبینم قەپانەکەی جۆلانە دەکات، زرمەیەك لە گوێچکەمدا دەزرنگێتەوەو جۆلانەکەیم لێدەبێت بە جۆلانەی دەنکە کاڵەکەکەی تاڵە مووەکەی سنگی پیاوەی ژێر کەپرو ساباتەکە .

جا هاورێ گیان ئەم سەعاتەی ئێوەش چاڵمەیەو قەپانەکەی جۆلانە دەکات.

ئیتر هاورێکەم لێرەدا کە بۆ جاری لە ژمارە نەهاتوو سەیرێکی تری سەعاتی دیوارەکەی کردەوە ؛ هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

—مادام سەعاتەکان قەپانەکانیان لە جۆلانەکردن راناوەستن کارەکە لەوە دەچێت مەرگ نەبێت کۆتایی بەم یادخستنەوەیە نایەنێت .

ئەنجا وەکو لەجێگایەکی دوورەوە گەیشتبێتە جێو بیەوێت پشوویەك بدات، پاڵی لێدایەوەو دووای بێدەنگییە وەك هەست بە حەسانەوەیەکی دەروونی بکات وتی:

—هاورێگیان لە ناخەوە سوپاس بۆ خۆتو پرسیارەکەت!

چونکە ئێستا کە ئەم بەسەرهاتەم بۆ گێڕایتەوە، هەست بە جۆرە شادمانییەك دەکەم... خۆزگە بە خۆزگایی خوا بۆ چیرۆکێك دەشیاو. تۆش ئەو دەستو قەڵەمەی خۆتت لێدەخستە کارو بڵاوت دەکردەوە

○



# پیر وەیس

عبد الله حمەسور

بەوانەی تا تەمەنیان دروشت‌تر بێت
لە تەك هاوسەریان‌دا تینی ورەی ئەوینداری‌یان تاو دەستێنێت.

بۆیە باوکە پی‌ی لە کوڕ داگرتبوو. لە نیو سەدە پتر لە تەك خانوو بەرەکەیدا ئاشنا بوو بوو، مۆرکی دەست ڕەنگینی تاف لاوێتی خۆی‌و خۆشەویستەکەی بە بەژن‌و تەوێڵی پیرە خانوەوە دیار بوو. هێشتا بن‌کەشی جێگا دەستەکانی بە کەفماڵی گەچی دیواری ناو تاقەکانەوە دەبینی. هێندەی نەمابوو بە سەریاندا بتەپی. نیرگەو کۆڵەکەکان لە تاو بارگرانیان پشتیان چەمابوونەوەو کۆم بووبوون. ساڵ بە ساڵ تا بهاتایە پتر ڕۆ دەچوون. دەستەڵو دیرەگی هەیوان‌و پشتەیوانەکە لە تاو ڕاکشانی چەندین ساڵەیان لەسەر گازەرای پشت لە تەك ئارام‌دا دەقیان گرتبوو. بەدەم پیش خواردنەوەی ساڵەهای ساڵەوە وەك شەقەدار ژێر سکیان قڵیشابوون. هێندەیان نەمابوو لێك بینەوەو بترازێن. سپی‌داری دارە ڕای بنمیچی کەلەگی‌و گەنجینە ئەوەندە پێکەوە شان بە شانی یەك ڕاکشابوون لە سنووری ئارام دەرچووبوون بۆیە دەمیان لە یەك کردبوەوە. دوای هەڵپاچینیان یەکسەر لە زەمینەی پەڵە چناری دایکیان بزر بووبوون. مام وەیس فەرمانی بەندی تا هەتای بە سێ چارەکە سەدە دابوون خزاندبوونیە ژێر ئەستوری ئەژنۆیەك گڵەبانی سەربانی خانووەکەوە تا ڕۆژگاری چەرخی زەمانە درێژەی بکێشایە ئەمان لە تەك تەمەنی مام وەیس‌دا بەساڵا دەچوون. سرکیان لە گیان‌دا نەمابوو. لەبەر چارە ڕەشی خۆیان زستانان بەدەم پشت‌و سەرو گوێلاك کوتان‌و بانگێرانەوە دەلەرێنەوەو دەهاتنە لەرزین، گەر ڕەنگی خاوەنەکەیان نەگرتبێ خوویان گرتبوو. لاسایی بەرۆکی پیروەیسیان دەکردەوەو بە ختوکەی بانگردێنەکە سنگیان لێك دەترازاندو درزیان دەبرد. برێنکیشیان دەپووکایەوەو دائەنەوین. ئاکاری وەیسە پیر لەگەڵ خامۆشی‌دا نەدەگونجا. دژ بە یەك بوون. ژیانی سەرتاپا بریتی بوو لە جهان. بۆیە هەر کە سەری سپارێکی بە نەوی ئەدی خەریك بوو چاوانی دابێت‌و هەستی بۆی دەجوڵا. سەر نەوی لافرە لەنگ بوو. بێ سێ‌و دوو دەچوو بەهانایەوە. گڵی گوێسوانەکەی لادەبرد. جەمسەری دارەڕای لای دەستەڵو سپی‌دارەکان لە کاتی خۆی‌دا زۆری دابوون بە دەمەوە. ڕایەڵی دارەکەی بستێك دەکشاند بۆ سەر دیوار. چەند گورگەو تەڵەزمە تەختەیەکی وەك پواز دەکردە

سەرێی ژێر سەریان، سەری سپی دارەکەی بەرز دەکردەوە، جا بە پێخەفی قایش‌و ڕەف‌و گلەبان دای دەپۆشین‌و گەرم ڕای دەهێنان.. بە دڵ ئارامی‌یەوە لە ژێریا پشووی ئەداو ئەمەوایەوە.

وەیسە پیر جێ پێ‌یەکی خانوەکەی بە تەلارێکی قەشەنگ نەدەگۆڕی‌یەوە، هەرکە دەی‌زانی کوڕەکەی دەم‌هەڵ‌دەهێنێتەوە، بێ تێ‌ڕامان وەك بەڕووی ناو ئێلەموی پشکۆی دار بەڕوو بەڕووی‌دا دەتەقیەوەو دەم‌و دەست دەی‌نەڕاند بە سەریا: خۆت‌و ژنەکەت بڕۆن خواتان لەگەڵ، خانووی نوێ پیرۆز بەخۆتان بێ، لە خوام دەوێ ئێوە بڕۆن، من گەرەك بەجێ ناهێڵم، بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە، ئەوەندەم بەبەرەوە نەماوە، تەمەنم ئاشنابوونی جۆرە کەسانێکی نەماوە کە وا دەزانن لە ئاسمانەوە بەربونەتە خوارێ، ڕیزی تەمەن درشتێکی وەك منیان لا سووکە، هێشتا بە خۆمدا رادەپەرموم، بە پەلە کوتێش بێ خزمەتی خۆم پێ دەکرێ، کە من بەم کولانە دارزیوە قایل بم ئیدی تۆ چیت گەرەکە ... دەزانم بووکێ لەگەڵ مندا دانووی ناکوڵێ، هەڕۆن بەلای کاری خۆتانەوەو من تەنگەتاو مەکەن.

کوڕەش ساتە نا ساتێ قوڕمیشی قسەکانی خۆی دەکردەوە، وڕکی لێ گرتبوو، پێ‌ی لە باوکە پیرەی کردبووە کەوش، هەرگیز بێ تۆ ناگوێزینەوە، من بەو مەرجە خاڵۆزای خۆم هێناوە کە دەبێت تۆوی نۆماڵی بووك‌و زاوایەتی لە وەردی خانووی نوێ‌دا بڕوێنین، بەڵێنێکە داومەو هەڵ ناگێڕێتەوە، ناش‌کرێت دووره پەرێز بین لە تۆوەو بێ تۆ نازین، خەڵکی لۆمەمان دەکەن، ئەوەتا ژوورێکی خنجیلانەی بەدڵی خۆشتم لە خانووە تازەکەدا بۆ تەرخان کردوویت، دیوارەکانی دەڵێ‌ی کافورن، جوان‌و ڕازاوەیە، ئیدی بابە تۆ کاڵەك خوری یان بێستان ڕن...

باوکە زۆر ستەمە لەکەڵی بیرو ڕای خۆی بێتە خوارێ، قاڵبووی ئەشکەنجەی ناو بۆتەی ژیان هەڵس‌و کەوتی دەروونی وا باداوە چاو لە دووی تەنانەت تاکانە کوڕەکەی خۆشی پێ لەنگە.

کوڕەش لەتاو دووری خۆشەویستەکەی ئاڵۆزی باری نالەباری ئەم تەگەرەیەی باوکی باری کەوتبوو، سەری دنیای لێ هاتبووەوە یەك، سەرەتاو بنەتای چوار وەرزە سوورێکی پڕیان بە دەوری خەرمانەی خۆردا خواردبوو، لە گرێ‌ی بەستنی دووا چرکەی پایانی نیوەی شەوی زستاندا وەرزەکان سەر لە نوێ ئاوێتەی ڕۆژێکی نوێ‌ی بەهاری شاد دەبوونەوە، ساڵ وەچەرخاوەتەوە بەسەر خوازبێنی‌و مارە بڕین‌دا هێشتا دوو دەستگیرانە پەردەی بووك‌و زاوایەتی ژیانی نوێ‌یان بۆ نەڕازێنراوەتەوە، دڵیان لە دوور بۆ یەك لێ‌ئەدا، نیشانی خۆشەویستیان لە خانووبەرەی نوێ‌دا لەسەر چاوان‌و نێوان دڵان ڕەگ دادەکوتێ، دوواکەوتنی گواستنەوەی ژن کارێکی نابەجێ‌یە، دەست بەرداربوونی باوکیشی گەلەك دژوارو جێ‌ی لۆمەیە، پیر وەیس زادە گینگەڵەی خواردوە بە دەست داری‌کەوە هەردوو سەری پۆخڵە، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ خەوو خۆراکی لە پیرە باوك بێزارو تاڵ کردبوو، ووتەکانی پێشووی بووبوونە قەوانێکی سواو، هێند پەرێشان بوو لەوانە بوو سەر بەکۆشی دوژمن‌دا کات تا بە دادی‌یەوە بێت، ناچار قەوانەکەی بە ئاوەژوولی با ئەدا، دیوەگێری ئەم جارەی وا لێ کردبوو چیرۆکێکی ڕۆمان بۆ باوکە پیرەی دابنێ‌و بیکاتە پاڵەوانێکی دڵداری دوای بەسەربردنی نزیکەی حەوت گرێ‌ی تەمەن.

بە ڕای هەزرە لاو دەرەتانێکی پەربڵاوی بۆ بیرو مەبەستی خۆی ڕەخساندوە.
شەوێك لە شەوان پێشوازی لە برێك هاوڕێ‌یانی باوکی کرد، کۆڕی دیدەنی بە باسی لاوێتیان گەرم کرا، ناشێ کوڕە ئەم هەلە لە دەست بدات، هەندێ باسی سەرسامی ئاوێتەی گفت‌و وێژەیانی کرد، چەکەرەی ئاخافتنەکەی لە زەوی‌یە بەیارێکی ڕەقانەوە سەری دەرهێنا سەدان نیشانەی پرسیار لەبن چڵ‌و چەوێڵی چقڵی دڕکەزیەوە بۆی هاتنە سەما دەزانن باوکم دەیەوێ هەرزەیی خۆی دەمە زەرد کاتەوە.. نازانم چۆن دڵی بڕوای دێ دووای دایکم تازە ژن بێنێتەوە... خۆ هێشتا کفنەکەی زەرد نەبوە.. ئەی ناپرسن چ شیرینیەکی چوە بەم خانووە داڕوخاوەدا. وا خەریکە بێتە کەلاوە.. گەر پەنا ناباتە بەر مەرامی ژن هێنان، ئەی بۆچی وڕکی لێم داگرتووەو ڕێ داناگرێت بۆ هەواری تازە تا ئێمەش بەچاو خزمەتی بکەین‌و کووڕی ژیانی پێوە دیار نەبێ.

لێ‌ڕوانینی لاتریسکەی چاوی میوانان لە تەك یەك‌دا ئەبڵەق بوو، نووکی هێڵی تیشکی مارەو دوورێی چاوەکانی بە چەشنی دڕکە زەردە دەرزی ئاژەنی چاوە کزۆڵەکانی مامە وەیسیان دەکرد، چپە چپیان دەئاخنیە گوێ‌ی یەکتری‌یەوە، لە ناوەندی ورتە ورتەکان‌دا دەنگێکی قەبەو قوڵا لە دەم میوانە کەتە زلەکەیانەوە وەك تاوێری لێژی هەڕووتەی چیا بە گرمە گرم تلازا، خۆی تێ هەڵ‌قورتاند، گرمەی دەنگە قەبەکە لە ناو مۆخی مامە پیرەی خانە خوێ‌دا دەنگدانەوەی بۆمبایەکی چەقاند.. جا کەواتە بێ ئەم سەرو ئەو سەر بۆ نای‌نێیتە مشتی کوڕە تاکانەکەتەوە، ئەم پێ لێ‌داگرتنەت لەچی.. ڕێك‌و ڕەوان بێژە منیش ژنم دەوێ‌و ژن دەهێنم.. ئیدی بۆ وا مانت لێ گرتوە؟.

وەیسە پیر سەرێکی بۆ سینەو بەرۆکی خۆی شۆڕ کردەوە، هاڵاوێکی بەتینی لە ئاهی بێخی دەروونی پژاند، هەناسەیەکی قووڵی هەزارو یەك واتای هەڵ‌کێشا، ئەوەی لە دڵی‌دا پیشی خواردبووەوە بە چرکەیەك زۆر ستەمە هەڵی ڕێژێ، هەنسکی پەژارەیی لە ناو وڕاقی سك‌و قوڕگیا ئەوق کرد، هەر چیەك بڵێ بێ سوودە.

بۆڵەی میوانەکەی دیکەیان دڕی بە تاس‌و خامۆشی وەیسەدا سەرە لەقێ‌ی خستە ناو کڕی کۆڕەوە، هاتە سەر چۆك‌و دەرەی لە ووتەکانی واڵا کردەوە: جا ئەم بڕو بیانووەی بۆچی‌یە.. کەس لاری لەوە نیە پیر وەیس ژن بێنێ.. ڕای ئێمەش‌و (دڵشاد)ی کوڕیشت لەوەدا یەك دەگرێتەوە، هەر ژنیش دەهێنی، بە ساڵاچوویەکی هاوتەمەنی خۆت بێنە کە پێت قابل بێت.. ئیدی خۆ بەڵگەی ئەوەت بە لاوە نامێنێ لە تەك کاك دڵشاددا ڕێ دانەگریت.. باوك‌و فرزەند لە یەك نابێت بام پێکەوە بن باشترە، لایەکیش لە کوڕە دەکەیتەوەو ئەویش دڵی بە تۆ دەکرێتەوەو دەبنە هاودەنگی یەك.. ئەوسا بۆ پارسەنگی قسەی هەوڵاان دەلاقەی کەلێنی جێ لۆمەی خەڵکی بە تاشەبەرد هەڵ دەچنیت‌و نابیتە جێ‌ی توانج‌و تەشەر. ئەوا ئێمەش ئامادەین بۆ باربووی کاری خێری‌و کۆمەکیتان دەکەین.

دیسان هێندەی دی پیر وەیس زەینی نوقومی بن داوی دەلێن‌و دەریای خەیاڵ بوو، دەمارەکانی مێشکی لە ئاستی لە خۆ بەرگری کردن خۆ گردکردنەوەی ژاکاو ئاڵۆزتر بوون.. فلیمی چەرخی ڕۆژگار بە تیژ ڕەوی لە نێو کاسەی سەری‌دا گێژ دەخوات‌و دەچەرخێت، چاوی لە ڕاستیا ڕێشکەو پێشکەی دەکرد. زاڵ نەبوو لە

جودا کردنەوەیان.. کێ لە مەرامی کێ تێ دەگات. ئاش لە خەیاڵی‌و ئاشەوان لە خەیاڵی، ڕەگی بڕوای پیرەویس وا چەسپی بوو بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە، بەختەوەری جگەرگۆشەکەی لەوەدا بەدی دەکرد ژن گواستنەوەی‌و ماڵ گواستنەوەی لە یەك کات‌دا لێك دانەبڕێت، باوکە خۆش گوزەرانی خۆی لە بۆ کامەرانی کوڕو بووکی بەخت دەکرد، لە خۆی دەبورد، هەمیشە لەبەر خۆیەوە دەی ووت: من باکم نی‌یە دەتوانم بۆ خۆم بە ڕێوە بچم.. بەڵام با دڵەو ژنەکەی بڕۆن بە لای کاری خۆشی خۆیانەوە.. چۆن دەتوانم پێ بەو پشکۆیەدا بنێم هەر لە ئێستاوە منیان لا بیمە سپلی لاورگ، هەر هیچ نەبێ دووای یەك دوو ساڵ گواستنەوەیان ئەوسا دەبمە ئەندامێکی هاوبەشی خێزانەکەیان، هەرگیز من نامەوێ لە سەرەتای ژیانی هاوسەری‌یاندا دەست بێنمە ڕێ‌ی هەڵس‌و کەوتیان‌و دارو باریان لار بکەم.. ئەوان وەك من نین ئاسمانی تەمەنی ژنیان هێدی هێدی لێ بێتەوە یەك، بەری دنیا بەربڵاوە، تا یێت خۆشەویستیان پێکەوە لە مەودای ژیانیاندا دوور لە من پتر گەشە دەسێنێ.

پیرەویس مەلەوانێکی بەڵەد بوو، شارەزای لوول‌دان‌و ڕۆچونی ناو گێژاوی ناهەموار بوو بوو، بە گورجی لێ‌ی دەتەکیەوەو بەرەو مەنگی دەکشا، خۆی لە هێرشی ڕك‌و کینەی لافاوی زۆر ڕوباری هەڵچووی بەگڕ ژیانی‌دا قوتار کردوە.. ڕێ پێ‌ی لە بواری تەنکاوەکاندا هەڵگرتوە، بە کارامەیی خۆی گەیاندۆتە کەناری هێمن‌و بە پێزو بەفەڕ.. بە هەوای شان بە هەورازی قەدپاڵ‌و تیرەشان‌دا هەڵگەڕاوە، بە ئارامی گەیشتۆتە سەر لوتکەی چیا ئێستەش چۆن دۆش دائەمێنێ‌و خۆی مەلاس ئەدا لە بن کەورگی ئاوی چەمە شێتەی نەهامەتی، خۆ گێژاوی دەریا لوولی نەداوەو هەڵی لوشێتە ژێر بارستایی قورسی ئاوی تاڵ‌و سوێرەوە، لە مەودای بۆچوونی بۆژۆو بێ سەرو پێ سڵ ناکاتەوەو مەزنەی لە خشتە نابات، پەی بە مەلەوانی بگرە ئاوی گەلەك قوڵتریش بردوە.. بە باوەڕێکی بایی‌یەوە دەتوانێ خۆی لە ژێرەو ژووری ڕای کوڕەکەی‌دا دەرباز کات، بە هەزار نووکە سوژنی دڵشادی کوڕی هێندەی دەمە گاشێکی پیر وەیس لە گۆشتە زەوی ناکێڵێت.

پیرەویس توێشوی بۆ سەرنجی خۆی لە پشت ناوەو بیری زۆر دوور بڕ دەکات.. تا تاسێ‌و تا پەشۆکی، بێ هەناسە بڕکێ ئەوەتا لە کەناری بەندەری فەرمایشتی میوانەکانی‌دا وا خەریکە لەنگەر دەهاوێ، قسەی دروست بێ بڵندگۆ پەردەی گوێ‌ی گوێگران دەلەرێنێتەوەو ویژدانیان دەهەژێنێ.. دوای ژنەفتی ووتوویژی میوانەکان، مامەپیرە خۆی لەناو حەشاری مەڵاس‌دانی ئاخافتن‌دا بزواند، سەرێکی بڵند کردەوە – کوڕەکەی ڕاچڵەکی‌و بە چۆکەوە وەك کۆڵەکەی ژێر ڕایەڵی سپارەکان لە بەردەمی باوکیا ڕووا – بە قامکە گەورەکانی چاوانی گڵۆفت دەستێکی کارامەیی لە ئەوێلی‌یەوە بۆ سەر ڕیش‌و تا پایانی چەناگەی هێنا، گەردی حەپەساوی لە سەود سیمای خۆی سڕی‌و تەکاند.. لە تەك بسکەی سمێڵی‌دا درزی دەروازەی زاری خستە سەر پشت، بزەی خەندەیەکی پڕ پتر لە هەزاران واتای ژیرێ ئاڵاندە کۆڕی دیدەنی، دەستێکی سۆزی هێنا بە سەرو پۆتەڵاکی لاوە جگەرگۆشەکەیدا، بە ڕیزەوە ڕستە سوپاسی بێ‌پایانی لەبەردەم پێشوازی فەرمودەی میوانە هاوڕێ‌کانیدا گرێ‌چن کرد قوتوە جگەرەکەی بەر باخەڵی دەرهێنا، سەرو جگەرەی بۆنداری کەی پێشکەش کردن.. ئاماژەی برۆ هەڵتەکانێکی گرتە دڵشادو دەم‌و دەست جگەرەی بۆ

داگیرساندن، بە دەم دەردانەوەی هاڵاوی هەناسەوە چەند هەنسکێکی درێژکۆڵەی هەڵکێشا، کۆتایی ڕیزی هەنسکان لە سەرەتای گێڕانەوەی ڕووداوێکی کۆن‌دا لە چاو وون بوون‌و توانەوە.. ئێوە چۆن لە من گەیشتوون..! ئەزمونی خۆشەویستی بووك‌و زاوا، ماڵ‌و ژنە، یا ژن‌و ماڵ...؟

ڕۆژێك بوە ماڵم بە کۆڵمەوە بووە، تازە (هەمین)ی خوا لێ خوشبووم خواستبوو، لەبەر بێ بژێوی ڕوومان کردبوە شانی خوارووی ناوچەی (زەڵم)ەوە، کونێکمان لە گردەکەی (قورتاس) وەك کەورگ هەڵ دریبوو، شەوان تیایدا جووت دەبووین، هەر لە تاریك‌و لێڵی بەربەیانەوە لەتەك هەمین‌دا دەستمان دەکرد بە سەعلەم هەڵ‌کەندن، ئەو ناوە زۆنگاو بوو، گژو گیاو گەڵا گایەمەو گەون باڵا پیاوێك لەناو ئەو شەخەڵەدا بەرز دەبوونەوە..

لەبەر ئاوی زەلکاوەکە پێڵاومان بۆ لەپێ نەدەکرا، هەفتەی سێ چوار وەقە سەعلەم‌مان هەڵدەکەند، چەرچی‌یەکان بە دە پانزە ڕۆپیێ مامەڵەیان دارو لەلە دەکردو لێ‌یان دەکڕین، دەیان برد بۆ شار، جارێکیان بەری‌کەوت بێ‌ئاگا پێم نا بە سەری مارێك‌دا، ڕەش مار لەتاو ئازارو ئەندێشەی گیانی خۆی قەف‌و کلکی ئاڵاندە قاچ‌و قول‌و بەرپشتێن‌و تا ژوور سنگمەوە، جەستەی جەڕاندم‌و لە مەنگەنەی‌دا، پەراسووەکانمی بە سەرە کللك وەك گەڵاکوتك دەکوتا، لە ترساندا نەم دەوێرا فزە بکەم، لە شوێنی خۆم ڕەق بوو بووم، دەت ووت بە گوریسێکی ئەستوری دوو بادی مووی کرژ بە دارێکەوە شەتەك دراوم‌و چاوەڕێ‌ی گیان‌لەبەر بڕان دەکەم، گیان لە شوێنێکی سەختایەو دەرناچێت.. دان‌گرتن بە خۆدا لە ناکاو ورەی پەتی خامۆشی پساند، هاوارم دەگەیشتە کەشکەشانی فەلەك، هەمین نەی‌کردە نامەردی بە پەلە وەك تیسکەی تفەنگ بە هانامەوە ڕای‌کرد، نەپەشۆکا، بە هەڵە داوان قیژاندی بە سەرما نەکەی بجولێیت.. چرکە نەکەیت.. پێت زۆر داگرە، خۆت زیاتر قورس بکە لەسەر تەوقە سەری مارەکە، بە بێڵەکان لە تەنیشتی پاژنەی پێمەوە پەیتا پەیتا سەری مارەی کوتا، بەوەدا زانیم گیانی لەبەر بڕیوە کە وەك پەپکەی تۆپەڵە گوریسێك قەفی لە لەشم بەربووەوەو خزایە خوارێ، لنگە لەرزێم پێ‌کەوتبوو، لەشم دەهاژاو کەوتمە دڵە کوتێ، ڕەنگم پەڕی‌و بوو بە زەردە چەوە، هەمین هاتە ژێر باڵم، بە لۆژە لۆژ ڕای‌کێشام بەرەو گردەکە، شلکەی ڕانی کردە سەرین‌و هەر ئەوەندەی پێ‌دەکرا قوم قوم ئاو بکات بە دەممەوەو بڵێ سەری مار نەکوتیت سەرت دەخوات.. لەناو پەژارەیی خۆم بەزەیم بە هەمین‌دا ئەهاتەوە کە زۆر بە پەرۆش بوو بۆم، لکی دەستماڵەکەی تەڕ کردو تاوو تووی لاجان‌و ناوچاوانی فێنك کردمەوە.. سۆزمان لە ناو بریسکەی چاوانی یەکدی‌دا ئاوتای یەك بوون، بزەی لێوی خۆشەویستیم ئاوێتەی ڕوشنایی ڕووی هەمین بوو، سەرم بڵندکردەوە بۆ نێو باسکی، تا چرکەی کاژێری ساتی ئارامیم لە نێوباوەشی هەمین‌دا هەڵ بکشایە زیاتر هەناوم تێ‌دەزایەوە، بوومە منالێکی بەرمەمکانەی ئەوین‌و هەر دوو قۆڵم ئەڵقاو ئەلق لە گەردنی تێك ئاڵاند، ئەمجارەیان هەستم بۆ سەرفرازی هاتە هەژان، دوواندن واق وڕماو چاو کەوتە سکاڵاو سوپاس، لەتەك ختوکەی سینەو هاڵاوی دەم‌و لێو هەستی بزواو هورووژا، بە پەلە پروزێ کۆڵوانەو پێچی سەری داماڵی‌و لە ژێر تارای ڕەشماڵی سرکەیی‌دا ئاوادامان خۆمان پێکەوە داپۆشی،

بەرەو خەونی دڵ ئارامی.

پیر وەیس یادی یەکەم مانگی هاوسەری بە گێڕانەوەی ئەو رووداوە پێچایەوە، بە دەم چا خواردنەوەوە قوتوە جگەرەکەی خستەوە بەردەم میوانەکان، دوو توێی مافوری بیرەوەری ساڵێکی دیکەی راخست، ئێوە دەفەرموون چی.. لەبەر بێ گوزەرانیو کەم بژێوی خۆمو هەمینو تەورەکەم روومان کردە ناوچەی قەرەداغ، کۆپی خۆت بگرە وا دەکەوینە گیانی دار بەرووەکانتەوە، تەورم دەمەزەرد کردبووەوە تیژ بە هەسان سووم بۆ دەستەك برین، بەر لە هەتاو کەوتن هێشتا چایی یەکەی هەمین دەمی نەکێشابوو دوو سێ دەستەکێ دار بەرووم لاڵو پاڵ لێ ئەدا بە زەوی‌دا، رۆژێکیان کاتی بەرچایی دوو بیچوە بەراز دایکیان بزر کردبوو، هەمین پشتێنەکەی منی بۆ کردنە تەوقو بە دارە گەورەی شەخسەکەوە بەستی‌یەوە، دووا دڵۆپی چای قۆری‌یەکەم هەڵچۆڕاند.. بەرەو نشێوی شەخەڵی کەنار چەمەکە بۆ پێویستی ئاو رۆ چووم، لەناو کپی توولە رێی خەیاڵەکانما لەپڕ هاوارێك گوێ قوڵاغی کردم، هەر ئەوەندەم خۆش بوو زانیم هەمینە.. لەتاو قیژە قیژی لەوانەبوو گەڵای دەوەنەکان کەر بنو بوەرێن: کوڕە وەیسە، وەیسە فریا کەوە، ئەوە بەرازەکەیە، بەراز...!! نەرەی هەمین واتی‌ی دەخوریم نانەژاوی لەسك بریمو زەوی نەی‌گرتمە خۆی، لەتاو دەڵە بەراز بەهەڵەداوان هەنگاوێکم بەرەو هەمین من دەڵێم کردە سەد، تۆ بڵێ هەزار.. دەنگ دانەوەی بۆڕەو مرقەی دەڵە بەراز لەو بەری کۆپی‌یە درەختەکانی دەلەرزاندو گڵی ژێر ریشەیان هارەیان دەکردە خوارەوە، روانیم بەرازە بەلووشە لووش لمۆزی لە توونەڵەکانی دەسوێت، ئاگری جگەر وای هەڵگرتبوو لە یەکانە درتر شانو ملی لە پیرە دار دەخشاند، هەمین لە ترسی دایکە بەراز وەك سمۆرە بە دارەکەدا هەڵ گەڕاوەو خۆی لە نێوان سێ پەلەکەیدا مت کردبوو، بەگورجی هاوارێکی لێ کردم: کوڕە نەخەڵەتێیت بێتە پێشەوە وەیسە، بە شفرەیەك ورگت هەڵ دەدڕێت.. مەترسە تەورەکەشم پێ‌یە، ها، بەماتەمات پاشەکشێ‌یەکم بەرەو پێ‌خەفەکان کرد، پەلاماری خەنجەرەکەمدا، لە تاو خۆشەویستی هەمین تینی ورەم تاوی ساند، لا نەنیشتی درەختەکەی ئەو دیوم لێ‌گرت، چاوێکم لە بەرازەو چاوێك لە ژنەکەم، چاویان لێ ناترووکێنم، دەڕوانم هەمین دەمو دەست تەورەی بەرز کردەوەو حاو حویەکی بۆکردو بە هەموو هێزو توانایەکیەوە کە کردگار پێی بەخشیبوو دای‌وەشاندە سەرملی بەراز، دەمە تەور لە گازەرەی ملی چەقی، دەسکی تەورەکەی پێ رانەگیراو لە گەردە ملی بەراز بۆی دەرنەهاتەوەو لە دەستی دەرچوو، بە سەر پشتی دێڵە بەرازەدا لەپەو روو کەوتە خوارێ، بە پڕتاو شاڵاوم بردو پەلاماری بەرازەم دا.. لەتاو مل کورتی خۆی نەی دەتوانی یەکسەر وەربچەرخێت، دەشم زانی گەر ئاوڕ بداتەوە ئەوا تیرەی پشتی دەپچڕێتو قوتار دەبین؛ بۆیەکا خواوراستان هاتمە دەستو لەو دیوەوە خەنجەرم لە بەر بینی چەقاند، بەدەم تێ‌رامالینو راوەشاندنی بەژنی خەنجەرەکەوە لە بەر بینو قوڕ قوڕاگەی، مشتووەکەی بەدەستمەوە شکا، قەڵەم بازدێکم دایە پشت بەرازەو پرم دایە کەمەری هەمین دام بە شانما، رووەو ئەودیو دار چڕەکان تێم تەقاندو بۆی هەڵاتم هەمینم حەشارداو، لە نێو قەدی دەوەنەکانەوە جا بۆی هاتمە پێشێ، کە روانیم دێڵە بەرازە لەناو ئەو چاڵەی بە چەپۆکو شفرە بە دەوران دەوری خۆی‌دا هەڵی دڕیوە لە خوێناوی خۆی‌دا گەوزاوەو وا لنگە فرتێ‌یەتی، هەمین

بانگی کردمەوە دوواوە، خۆی هاویشتە ناو باوەشمو باسکی لە گەردنمەوە ئاڵاند.. روەو شوێنی بەرچاییو پشووی دڵ ئارامی هەنگاوم نا، وەك منداڵێك لە ناو باوەشما هەڵ بلۆقی‌یەوەو خۆی فڕێ‌دایە سەر پێ‌خەفەکان، بەدەم تریقانەوەی سەر فرازی‌یەوە هەستایەوەو هەر دوو باسکی ئاڵاندە ملم، برێك خۆی لە زەوی بەرزکردەوەو بە بەرۆکما هەڵ زنا، سۆزی خۆشەویستی تینی خۆڕاگرتنی لەبەر بریمو مورەغەی پشتمی بەرەو هەمین چەمانەوە، دوای ساتێکی دی دڵ‌نەوایی ئەم جارەی بەوە دامەوە کە بە نازەوە ووتی: جووتە توتەڵە بەرازەکە دەبەینەوە بۆ ناو ئاوایی سەگیان تێ بەر ئەدەین، جا بزانە دەبێتە چ قارەو قیرەو بەزمو رەزمێك، ئەهاە، لە وانەیە سەگ خاوەنی خۆی نەناسێتەوە..

هۆشو ژنەفتی میوانەکان رووابوە دەمو دووی پیر وەیس، هێندە تامەزرۆی بەدەستەوەدانی ئەنجامی سەرگوروشتەی رووداوەکانی بووبوون، لە تاوانتا بێ‌ئاگا لابەلایی دەستیان بۆ قاشە ترۆزی‌یە چەمیلەکەی دەست دڵشاد رادەکێشا کە بۆی پاك دەکردن.. پیرە تازە شان لەسەر سەرین‌دا ئەدا، بینی ناوەتە بەر هەورازی یادکردنەوەی داستانەکانی رۆژگاری رابووردوویەوە، دووکەڵی لە دووا جگەرە هەڵسان، هۆشو هەستو بێخی دڵو دەروونی تێکەڵ بە باس‌خوازی هەمین کردبوو، وەك تارمایی هاوسەرەکەی بێتەوە بەرچاو بە نەرێکەوە لەژێر لێوەوە لەدەمی ترازا: ئادەی هەمین قولێك جگەرەی کە لەو توتنە بۆندارە بێکە، هێندەی نەمابوو بسکەی سمێڵی میوانان بێتە جوڵە، بە پڕتاو دڵشاد ترۆزی‌و کاسە خوێ‌ی لەبەردەم دانانو گورج ووتەکەی لە دەم باوکی بەیەك دوو بەڵێ بەڵێ‌ی بان یەك قۆستەوە. باشە وا قوتوەکە پڕ دەکەمەوە لەجگەرە. پیرە زیاتر پاڵی لێ دایەوەو دەستێکی کردە نیرگەی ژێر شەویلگو چەنەی بە لۆمەیەکی سەرزەنشت‌کاری مەیلەو کرۆزاندنەوەوە هاتە گفتو ووتی: ئەی.. ئا ئەو هەمینەیە دایکی تۆ کوڕم.. ئێستەش تۆ پێم دەڵێیت کاڵەك خۆری یان بیسان ڕن..! نەخێر کاڵەك خۆر نیم.. بیستان ڕنم..!.

قاقای پێکەنینی میوانەکان پەتی خەیاڵی مام وەیسی نەپساند شانێکی باداو ملی جەڕاند، سەرینی لە پاڵ پشتی خۆیەوە کەمێك بزواند، روو بە رووی میوانان هاتە سەر چۆكو هەڵوێستەیەکی بۆ کرد.. قایل نەبوو لە ناوقەدی هەورازی بیرەوەری‌یەکانیا پشوو بە خۆی بدات، بە نیمچە تەکانێك بستێك ئەژنۆکانی بە تەریبی بەرەو پێشەوە خشاند، دەیەوێت بگاتە لوتکەی مەرامی مەبەست... هەمدیسان بەدەم پێشکەش کردنی جگەرەی توتنە بۆندارەکەوە لە دووریانی گێڕانەوەی داستانەکەی‌دا بێ خۆ گیر کردن هەڵوێستەیەکی تری بۆکردو جا هەنگاوی بەرەو پێ‌دەشتی مەر ژیانی ئەوین‌داری دوو بە دووی خۆی‌و هەمین هەڵ‌گرتو کەوتە رەو:

چەرمەسەری‌ی گوزەران وای پێ رابینی بووم چەند ساڵێکیش دوای دارو دەستەك برین، کێشەی راگوزاری بە کاروان لە تەك تیرەشانی رۆژهەڵاتی چیای گڵەزەردەدا بەرمە سەر، ساڵێکیان هێشتا دووا هەناسەی هاوین تازە خەریك بوو هاڵاو لە سەرو ملی وەرزی پایز بپرژێنێو دەستو مووچی بەرێوەکردنو پێشوازی لە یەکتر بکەن، رەوتی رۆژگار لەتاو تەمەن کورتی هێندەی لوشکە لوشکی کەرە زەرێك چاوی بە خۆردا دەخشاند... جارێکیان لەو کاتەوە زەردە چاوشارکێ‌ی سەرو شێوەی خۆی پەڕاندە ئەو دیو دەم کەلی خۆرئاواو رۆشنایی تاڵە زێڕینە لاوازە

بەجێماوەکانی لەژێر باڵی تاریکی شێوان‌دا نەوی‌و توایەوە، ئا لەو دەمەوە کاروانی گەچ کێشان لە دامێنی کەنار شارەوە کەوتە ڕێ بەرەو دێی (ڕەبەتە)ی ئەم دیو (تلەزەیت)ەوە... نزیك بێستانەکەی ئەو بەر (زرگوێز) بوینەوە بۆ شەو بەکێوی وڵاخەکان لامان‌داو سەرخەوێکمان شکاند، هەر ئەوەندەی کاروان کوژە یەك دوو سەرە تاتکێی ئاوقەدی باڵی چیاکان کرد، کاروان لە بنارەوە بۆی کەوتە جمان.. هێشتا ڕوونی بەربەیان دری بە دەیجوور نەدابوو، پێشەنگی قافڵە بارە گەچیان لێواو لێوی شەڵتەکان دار ماڵ ئاخنی بوو، کاروان ڕووی بەرەو شار وەرچەرخاندو بەرەو دووا ڕێگایان دایە بەر.. ئێسترە بۆزی مەڕ ئێمەش هێندە لە هەڵەت‌و پلەکان‌دا سەرسم‌و نووچێ دابوو، پەی زەن‌و شەلی ئێسترە ماڵ وێران منی کردبوە دووا کەوتەی پێشکەوتووان.. سەرەتای کاروان نزیك شار تۆزی دەکرد، کۆتایی‌یەکەی بە ئێمەی جێماو لای بێستانی خاوەن دوو گەماڵە بازەو بۆرەوە گرێ کوێرە دابوو، هەر ئەوەندەم زانی خاوەن بێستان وەك کارچلك هەڵ تۆقی‌و تێی خوڕیم: ئەرێ گەماڵ باوك ئەوە ئێوە بوون،ئەم شەو بێستانەکەمتان ڕنی؟. براو کوڕانی لێم دەرپەڕین، بە گەماڵەکانەوە ئەوان نیو دەستەو من تەنیا باڵ، سوێند نەما بە ئاسمان‌و لەسەر زەوی کە من نەبووم‌و بێ‌بەریم لەوانەی بێستانیان ڕنیوە دەستم بەر کاڵەکتان نەکەوتووەو تامیم نەچێشتوە، نازانم تامی ئاوە، شیرینە، مزرە، زرگن، گەیون، کرمۆڵن چی... لاڵانەوەو پاڕانەوە دادی نەبوو، پەیتا پەیتا بارە گەچەکانیان دەرشت، کابرای کەتەو براکەی بە نیازی خراپ لێم هاتنە پێشێ، کوڕانیش پتر بازەو بۆرەیان لێ تیژکردم، لەناو لاق گرتن لە شوێنی خۆم هەڵ دەپەڕیم‌و کەوتبومە هەڵەکە سەما، گۆچانەکەم بەهەر چوار لادا لێ ڕادەوەشاندن‌و بە دەوری خۆما سوورم دەخوارد، شەلم کوێرم ناپارێزم کەوتمە بابە خولێ‌و دەیان جوغزی بەرگریم کردە پەرژینی خۆم، سەرە گێژی زێنی بۆ هێنام خستمیە ڕەت‌دان، هێندە بەم لاو بەولادا ڕەتم ئەداو دەکەوتم‌و هەڵ‌دەستامەوە خەریك بوو لەتاو قەپی گەماڵان قەڵەمی ئەژنۆم بشکێ‌و بتاسێم، سەربارەی ئەم بەزمەی لەتەك گەماڵان‌دا پێیان گێڕام، کردمیانە سەماکەری خۆیان، بە پاڵ لەم‌لا دەیان بردم بۆ ئەو لاو لەولاش ئاوەژوو پاشەوپاش دەیان هێنامەوە.. هەر ئەوەندەم خۆش بوو دەست هەڵ‌بێنمەوەو یەك دوو گاڵۆکی مزریان تێ بسرەوێنم، گاڵۆکیان لە دەست گرتم‌و بە ئەژنۆ شکاندیان – ئاخ دەستی شکاوم بۆ خەنجەرەی مشتو شکاو – وەك بە کڵاو بم‌گرن کەوتمە بەردەستیان، مەشکە ژەندێ‌یەکی چاکیان پێ‌کردم، گەر فرێیان نەدامایە نێوان پەپکێ تەپە گەچە ڕۆکراوەکانەوە لەوانە بوو هەر چوار پەلم بپسێنن‌و لە بن‌دا دەری بێنن، هێندەیان شەق بۆ داهێنامەوە نافەکی شرواڵیان پچڕاندم‌و خۆشم نەم دەزانی ڕاست‌و چەپم کوێ‌یە.. شل‌کوت‌و بێزاری عەمریان کردم، شڕو شیتاڵیان بە بەرەوە نەهێشتم، هەموو گیانم تێك‌شکاو لە پەل‌و پۆ کەوتم، وەك کەلاك لەو ناوەدا تووڕیان دام، وەلا کەوتن لێم، بە نیوە مردوویی مامەوە تا دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ، بە کولە مەرگێ هەرچۆنێك بوو وڵاخەکانم هەوسار کردو بە سەر شکاوی‌و ئانیشك‌و سەرچۆك دڕاوی‌یەوە بە باری بەتاڵ ڕێی شکستەم بە بەزیوی گرتەبەر، پاشەکشێم کردو بەرەو ماڵ ملم نا، لەشی وڵاخەکان لەتاو خاوەنی دووا کەوتەیان داهێزرابوو، بزماری ناڵی ژێر سمیان لە ئاستی ڕێگاکەدا سوابوو، بە تەکە تەك نیوەشەو خۆم کرد بە ژووردا، حاڵ‌و حیکایەت لەمە ئافرەت، هەمین لە دە دوانزە لاوە لەشمی بەنیوە نمەك پینەو پەڕۆ کرد، کراس‌و دەرپێی درێژی بلوری بۆ درو بووم، پۆشتەی کردمەوە، سەرو بنی ڕاوێژێ بەوە دەرەوانەوە ئەمجارەیان لەگەڵ کاروان‌دا نەکەومە ڕێ، تا تووشی چەرمە سەرێ نەبم، خۆ بەخۆ بە تەنیا بچم بۆ گەچ کێشان، دووای دوو سێ شەو سەر لەنوێ خۆم‌و وڵاخ ساز بووین، کەوتمە گەشتی تەنیا، زەردە هێندەی کلکە بێلێکی ماوە لە ئاسۆی دەم‌کەلەوە دابکشێ، زوو کەوتمە ڕێ، بێ شەو بەکێو، هێشتا کەڵەشێر تەپە تەپی باڵی بۆ یەکەم قوقەی خەوتنانی لێك نەدابوو، بەر لەوەی بگەمە شوێن شەرگەی لای بێستانی کابرای کەتە بۆرەوە، دەروانم تارمایی زەلامێکە لە دوواوە خێرا پێ هەڵ دەگرێ‌و هەنگاوەکانی بە گورجی ڕێگەی نێوانمانی دەپێچایەوە، وڵاخەکانم لێ ڕاگرت‌و بەرایی ڕێگەم لێ بەست.. گاوەخانە جووتێکی مابوو بێتە بەرەوە بەدەم خۆڕەتاندنی ڕەوتە لۆقەوە بە هەنسکە برکێ هاواری کرد: مەڕۆ وەیسە..!. هێشتا پەردەی گوێم لە لەرینەوەی بیستنی مەڕۆ وەیسەی دەنگی هەمین نەکەوتبوو، ئاگر بەربووە جگەرم‌و بە پەلەپروزێ بەرەو پیری ڕام کردو توند گرتمە باوەش، چی بووەو چی قەوماوە بۆ وا بەم شەوە ڕەدووم کەوتووی، تاوێك خۆی لە باوەشم‌دا گیرداو کپی پشووەکەی بە سۆزی نازێکەوە ڕەواندەوە کە ووتی: منت لەبیر چوو بوو، ئەوا بە پێی خۆم پێت ڕاگەیشتم‌و هاتم بۆ لات، حەزم نەکرد ئەم سەفەرەت بە تەنیا ڕێگە بگریتە بەر، وا ئەو دوو گەزە بلوری‌یە ماوەی کراس‌و دەرپێکەشتم هێناوە نەبادا خوانەخواستە ئەمجارەش شڕو شیتاڵمان لەبەر ببڕن.

بە تەگبیری هەمین وڵاخەکانمان لە پەنا پەرژینی باخەکەدا مۆڵ دا، دامێنمان گرت‌و بە لاڕێ‌دا هەڵکشاین، هەوارگەی پیلانمان لە گوێ ئەستێڵەکەی بەر کارێزەکەدا لێ خشپەو چرپە خست، خۆم لێ ڕووت کردەوەو بەکراس‌و دەرپێی درێژی سپی‌یەوە لە نزیك بناوانی ئەستێڵەوە چیچکەیەکم بۆ کرد، سەرپۆشەکەی هەمینم کردە لەچك‌و دەماخم هەڵبەست، هەمینیش بلوری‌یە سپی‌یەکەی ئاو دامان لە خۆیەوە پیچا. بووینە دوو مردووی کفن سپی، لە سەرەو ژێرەی بەر ئەستێڵەوە بەرەو کەپری بێستانەوان خۆم تلۆر کردەوە، بازەو بۆرە لە خشەو خشپەی تل بوونەوەکەم کەوتنە حەپە حەپ، باخەوانان لە شیرین خەودا کت‌وپڕ ڕاچڵەکین، هەمینم هەمین تا خوا هێزی پێ دابوو یەك دوو خرتکە بەردی گەورەی بە توند هاویشتە ناو گۆم‌و شڵپ‌و هوڕی لە ئاو هەڵساند، لە کەنار بارستایی جۆگەلەکەوە بە هەنگڵە شەلی بە بەرگی کفنی سپی‌یەوە دووا بە دووای من خۆی کێش کرد بەرەو کەپرە، نەرەیەکی بە سەردا کردن‌و قیژاندی: ئێمەین خێوی ئەم کارێزە، ئەمە کانی‌یە خێوەیە کانی‌یە خێوە. چ ڕایەکتان دەکەوێ خاوەن کارێزو بەزاوو بێستان بن.. هەڵبەتە مام وەیسی بێ‌کەس نە نەبەدی دێوو درنج‌و خێوی نیە.. هەر لەتەك قیژەی هەمین‌دا خۆم گرمۆڵە کردو برێك تەپاو تل‌و چەپۆکانم لەسەر پێ‌خەفی ژێر ساباتەکەیاندا بە ناویاندا کرد، بازەو بۆرە بە قروسکە قروسك لە ترساندا قوچاندیان، وەك تیسکەی تفەنگ بۆی دەرچوون‌و سەرەو لێژ لەقەیان لە ئەستێرە ئەداو هەر لۆقێکیان کردە هەزار.. برێکی دی هەمین نە کەپرەکە نزیك بووەوە، هەر لەگەڵ نەرەیەکی کەی کرد بە سەریانداو تێی خوڕین – بێ وێژدان ئێوە چۆن گەلە کۆمەکی لە کابرایەکی وەك وەیسەی گەچ کێشی بەستە زمان دەکەن – لەرزی بۆ هەمویان بری‌و زارە ترەك بوون، کەتە زلەی باخەوان حەپەساو

هیمو روو لی ی کەوت بە زەوی‌داو بورایەوە. برای خاوەن بێستان‌و کورانی چۆقە جۆقی ددانیان دەهات، زەوی نەی دەگرتنە خۆی. دووا بە دووای گەماڵان بۆی هەڵتن. ئاسك بە تۆزی پی‌یاندا را ناگات، کەس نەیزانی ها لێرە ملیان شکاوە یا هوی.. هەمین قەڵەم برەکەی لی وەرگرتم، پڕ بەپڕی مشتی پری دایە نافەکی شروالی کابرو لەناو دەستیان لوولی دا، دەوران دەور لە دوواوە بۆ ئەتك لەبن‌دا بۆی قرتاند، پارچە دراوەکەشی بۆ ئاخنیە ناو سەرینەکەیەوە.. لاپی‌یەکم لەژێر سەری کابرای کەتەوە تی‌وەژەند دەت ووت بە دەلاقەی زلی شروالی دراوەوە ماوێتی لە حەوت ساڵن راست بێتەوە... بێ تەماکاری لە دوو کاڵەك زیدەتر نەشیا بۆمان لە بێستانی کەینەوەو زیانیان لی بدەین، هەمین تەپکە گەچە رژاوەکانی ئەو ناوەی راماڵی‌و خڕکردەوە، دوو باری لی پێك‌هێنان، روەو شار رێگەمان گرتەوە بەر، پەیجور جەرگی نوتەکی شەوی هێشتا شەق نەکردبوو خۆمان کرد بە ماڵ‌داو هەمینم دەرگای خڕ داخست.. بەدەم خەندەیەکی لە خۆ بایی‌بوونەوە بە ئۆخەیەکی پڕ بەدڵ زوخاوی ناو جەرگ‌و سینەی بە با داو ووتی: گەر ئاوەها بۆی نەچوینایە پەرێزی ترسیان بە هیچ جۆرێك ترست دەر نە ئەچوو، ئیدی گەر ترس لێمان‌نەترسایە هەرگیز تەسکینی بە دڵما نەدەهات..

دەی تا دەمەو چێشت هەنگاوێکی درەنگ سەر خەوێکی باشی بۆ بشکێنەو دووای تاقەت کردنی ووڵاخەکان ئامادەی کاروانی نوێ بە لە تەك هەواڵان .

پیر وەیس هەروەك بیەوێ تەزووی ئەژنۆ سڕبووەکانی هاتنە سەرچۆکی دەربکات لە شوێنی خۆی هەستایە سەر پی‌و سێ چوار جار دەستی بەسەر ران‌و کەشکە ئەژنۆی‌دا خشاند بۆ قوله پی‌ڕ راست بوەوەو دەستێکی درێژکرد، بۆ قولێنەی ناو تاقەکەی پشت سەری میوانەکان .. قولێنەی لە بەر دەمیان‌دا قوت کردەوەو بە نووکی قەڵەم‌بڕ کەوتە گیانی گوێزی توێکڵ تەنك. دووا سەرنجی یادی رووداوەکانی بە دەم گوێز شکاندنەوە کاکڵەی پوختی پێشکەش بە هاورێکانی کرد :

دڵشاد بە دەم ئاو گێڕانەوە لووتە پی‌یەکی لە کەنار لبادی راخەری ژێر میوانان گیراو هەڵ نووتی‌و جامە ئاوەی لە دەست رژار پیرەی باوکی پەستی کورەی بەوە داپۆشی کە زەدەخەنەیەکی سەرزەنشتی ئاراستەی بەرۆك‌و سیمای میوانان کردو هاتە گوتن : زویر مەبن ئاو روناکی‌یە .. دیسانەوە تکای ئەوەشم لە بەرێزتانە کە زویر نەبوین نە ئەبوایە روو بە رووتان بم‌ووتایە نەخێر بێستان رنم چونکە ئەو چەند بە سەرهاتەی من‌و هەمینی دایکی کاکە دڵەم بۆ گێڕانەوە مشتێ بوو لە نموونەی خەرواری ژیانی گوزەشتەم .. سەد هەزار جار رووسپی بۆ گیانی خۆت‌و گۆڕت هەمین، ئەم خانوبەرە کۆنەم دەبینن هەمووی کۆی دەست رەنگینی هەمینە هەر لە سەرەتای ژیانی هاوسەری‌مانەوە وردە وردە پاشەکەوتی پارەی لە سەعلەم هەڵکەندن‌دا دابین کرد دەستەك‌و نیرگەی دارەڕای خانوومان وەدەست کەون .. گەچی دیوارو ناو تاق‌و رەفەو گڵ گەچی هەیوان‌و بەرهەیوانمان وەدەست هێنا لە هویەك موویەکی دەکردەوە تا ئەم کولانەیەی بۆ پێکەوە نام، تەمەنێکی دوورو درێژمان پێکەوە تیا گوزەران کرد .. ئێستەش سەر هەڵ دەبرم کەف ماڵ‌و جێگا دەستەکانی ئەوم دێتەوە پەرچاو .. ئیدی تۆ دڵشاد چۆن هەڵم دەفریوێنی‌و لە خشتەم دەبەیت، خۆشتان زۆر باش دەیزانن تازە من لە ریزەی ئەوەدا نەماوم دڵم بۆ ژن لێدا، بە تایبەتی دووای خوالێ خۆشبووی هاوسەرێکی وەك هەمینێ .. گاکە پیر بوو هەوجاری لە نەرمانیش‌دا بۆ راناکێشرێت .. گاسنی کول‌و سواو ناتوانێ نەك زەوی بەیار تەنانەت وەردیش دوو گاسنە بکات ..

ئێستەش بۆ وا دڵشاد ئۆقرەی لەبەر براوە، تەنگە تاوی چیم دەکات، پێم وابێ پێوەری خۆشەویستی ئەوان بێ خانوو بەرەی نوێ هەرگیز سەقامگیر نابن، دابڕینی منیش لێتان هیچ کووڕی‌یەك بە هەل‌و مەرجتان ناگەیەنێت .. کەواتە لە منەوە پشت ئەستوربەو تا زووە کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ‌و دەبڕۆ بە خوام سپاردن بووکی خۆت بگۆیزەرەوە سەرەو فەر بن .

هەڵ هاتنی تاڵ تاڵ لە گزنگی خۆری بەربەیانی بەسەر – هاتەکانی تەمەنی پان‌و پۆری باوە پیر وەیس، بریسکەو درەوشانەوەی ئەستێرە داکشاوەکانی بیرو خەیاڵی دڵشادی کوڕی ڕەوانەوەو لە چاو بزر بوون.

هەزاران جریوەو تروسکەی ئەستێرە گەشەی ئاسمانی شەوان لەتاو دەرکەوتنی سەرە تاڵێکی رۆشنایی شەفەق ورە بەر ئە، دن‌و تەنانەت تارماییشیان لە ئاستی چاو دایەت‌و ئەتوێتەوە.

کارەساتی ساڵەها پیر وەیس بۆتە فەرشێکی کۆن‌و تووك هەڵداوو رایەڵ دەرکەوتوور شاش‌و تەنك‌و بێ بایەخە، ناگونجێ لە هەوارگەی نوێی بووك‌و زاوایەتیدا دڵشاد رای بخات‌و میوانەکان هاورێ‌و هاوسێی تاف لاوێتی‌و تەمەن پیری مام وەیس بوون، لە مێژەوە مافوریان دوای چنینی بە سفتی دیبوو .. لەوەوبەر گەلەك جار لە تەك وەیسەدا میواندری یەکتریان بە دڵ پێشوازو بەرێ کردبوور دڵ لە دڵ ئەڕوانێ. دۆستایەتی تەمەن بەرین خۆشەویستر دوای پەفش بوونی خۆرەتاوی کارەساتەکانی ژیانی درێژەمانی پیر وەیس بە سەر زەمینەی کۆڕی دیدەنی‌و میوانداریێتی‌دار پەر لەوەی زۆر لە پێشوازی کردن‌و بە پیرەوە چوونیان، بە گەرم‌تر بەرێیان بکات‌و بە یەزدانیان بسپێرێ‌ر رای هەموان سەرجەم لەوەدا یەکانگیر بوەوە کە گرفتی خۆبەخۆی خۆیانیان دایە دەست دروشمی کارامەیی‌و ریش چەرمووی پیرو ەیس‌و هەرگیزاو هەرگیز باوك‌و فرزەند لە یەك نابن ..

لە تەك هەستانی میوانەکاندا پیر وەیس دەستێکی بەناو رەفە بەرزەکەی ژوور تاقەکانەوە گێڕاو پریاسکەیەکی گەرد لێ نیشتووی دۆزیەوە، بە دەم رۆشتنی میوانانەوە بەرەو هەیوان پریاسکەی بەسەر لەپە دەستیا تەکاندو قوڵفی گرێکەی ترازاندو کوژەکە شینەکەی ناوی دەرهێناو ماچێکی بەکوڵی کرد .. هێندەیان نەمابوو بگەنە بەر دەرگای حەوشە، مام وەیس دڵی پڕ بوو، گەر ددانی بەخۆی‌دا نەگرتایە لەوانەبوو بە دەم گریانەوە بڵێ : ئا ئەم کوژەکە شینە چاوەزارەیە هەموو مەرامی هەمینێ بوو، لەوەتەی دووای لە مەمك برینەوەو کەچەڵە بوونی دڵشاد بە هەمودو ئاواتێکیەوە هەڵی گرتۆتەوە بۆ کوڕی دڵشاد .. وا منیش ئومێدو هیوای هەمینە لەوەدا دەبەمە سەر، خوا حەزکات لە دوای ساڵێکی دیکە لەبری نەنکە هەمینێ ئەم کوژەکە چاوەزارەی بکەم بە بەرۆکی کورەزاکەم‌دا جا ئەوسا لێیان دانابڕێم‌و لاناکەوم. تەنیایی تەمەن پیریو ئەوینی رابوردووم بە دەم گڕوگاڵ‌و شنەو خەندەی سەر لێوی نۆبەرەی نەوڕەزی دڵشادەوە تەسکینی دڵی خۆم ئەدەمەوە .

محمد تیمور

# دەروازەیەکی رەخنەیی درامای نوێی کورد

بەشی یەکەم

بەرکولێکی پێویست.

گەر بمانەوێ لە دراما بکۆڵینەوەو، رەوتەکەی هەڵبسەنگێنین پێویستە لە ئەرکە دیاریکراوەکانی بگەین، کە بە چۆنێتی پێکهاتنی ئابووری – کۆمەڵایەتی – یەوە بەندە؛ نەك بەرواڵەتو چۆنێتی پیشاندانو هونەرە ئیختیارییەکان، هەر چەندە پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی دراماو شانۆ بە هونەرەکانی دیکە مایەی گەشەسەندنی درامای نوێی کوردە، کە لە ماوەی بەشی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا چەمکێکی نوێی گرتۆتەبەر ، بە هۆی پەرەسەندنی رۆشنبیری نوێی کورد لە هەر دوو بواری ئەدەبو هونەری نووسراوو، نەنوسراودا، ئەگەرچی هەندێ رای جیهانیو خۆماڵی لە نرخی سەرچاوەکانی ئەدەبو هونەری میللی کەم دەکەنەوەو، بە دێراوەکانی درامای نازانن، هەر لەبەر ئەوەی وەك بەرهەمی نوێ لە چاپ نەدراونو، خاوەنەکانیشیان بە ناو نەناسراونو، باوەریش بەهەوڵو کۆششی داهێنەرەکانیان ناکەن، کە رۆڵەکانی جەماوەری جووتیارو رەشو رووتی کوردنو، بە شێوەیەکی ووشکە ئەکادیمیانەو چاولێکەری ئاستەکانی فۆلکلۆر دەگۆرنو مەرجە هونەرییەکانی لێدادەبڕن تا بە نیازو ویستی ئایدیۆلۆژیای خۆیان شیی بکەنەوەو، تەوژمەکانی سایکلۆژیو ئایدیۆلۆژی فۆلکلۆر بگۆرنو هێناو ئەرکە مێژوویی یەکانی بشێوێنن، بە بۆچوونی بۆرژواکان فۆلکلۆر موڵکی هەموو کەسێکە تا دەستکاری کردنەکانیان بە رەواڵە قەڵەمبدرێو، بیرتەسکی چینایەتی بەسەردا بسەپێنرێو سنووری چینایەتی گشتی بشکێنرێو ئەندێشەی میللیو یادو بیرکردنەوەو دووبارە کردنەوەی میللی شوون بزر بکرێن.

## جیهانی فۆلکلۆر

ئەوەی دیارو باوە، یەدیت لە تایبەتییە گونجاوو، هەرە گرنگەکانی جیهانی فۆلکلۆر، بوونی پەیوەندییەکی زەرووریی ئاشکراوو روونە لە نێوان بەرهەمە زارەکیو ئیرتجالییەکانو هونەرەکانی دیکەدا، فۆلکلۆری کوردیش لە هەردوو لایەنی ئەدەبو هونەردا بوونی خۆی سەلماندووە وەك:–

## ١ – هونەری دراماو شانۆ:–

نەك هەر لەبەر ئەوەی لە چوار چێوەیەکی لاساییکردنەوەو خۆگۆڕینو پانتۆمایمدا، بەڵکو لە دیاردەیەکی میلیو کۆمەڵایەتیو شارستانێتیدا لە باو بووەو. لە ئاهەنگە شانۆییەکانی نەورۆزو، مەدرەسەی مزگەوتو، لە دیوەخانو، خانو. چایخانەو، سەیرانگاو، میهرەجانەکانی مێرەدیو شارەکاندا دیتراوەو، گشت پێداویستەکانی هونەری دراماییان (کار + ناساند + لاسایی کردنەوە – گۆران)[1] لیّ بە دی کراوەو، لە زۆر پیشاندانی ئاهەنگو بۆنەو خۆپیشاندانە مۆرك درامایی یەکانیشدا پێشکەش دەکران، لە ژن هێنانو تەقسی خۆشیو ناخۆشی – جەنازەو سەردوولکەو شیوەنو، کۆتەڵ، تەنانەت هەندێ کەس وا نیّدەگەن تراژیدیای کۆتەڵ لە «عاشوورا»دا نوێنراوە، یا لە «عاشوورا»دا دابراوە، ئەوەی راستی بێت زۆر لە پسپۆرانی دراماو مێژوو سەلماندوویانە کە کردە سەرەکییەکەی «عاشوورا» لە کۆتەڵی کورد وەرگیراوە، هەر بۆیەش زۆر لە زانا ئاینییەکانی ئیسلام کەی سەرهەڵدانی (عاشوورا) بە گومانەوە سەیریان کردووەو، ئەڵبەتە کۆتەڵیش سەر بە ناوچەیەکی تایبەتیی کوردەواری نەبووە، ئەوەتا لە داستانی مەمی ئالاندا باسی هاتووە، کە (مەم) مردووە بە کۆتەڵ شاردراوەتەوەو، کۆتەڵ لە سەردەمی میدییەکانو، گوتییەکانو، سۆمەرییەکانیشدا وەك تەقسێکی درامایی هەر هەبووەو، پاشاکانیان بە کۆتەڵ شاردراونەتەوەو، لە پاشدا کۆتەڵ لەو تایبەتییەی خۆی دابڕاوەو. لە ناو خەڵکیدا وەك درامایەکی تەقسی لە رێگای تیپو پسپۆرانی تایبەت بەخۆی لە شێوەی کۆرسو سەرەك کۆرسو نواندن دووبارە دەکرایەوە. هەروەها چەند جۆرە پیشاندانو درامای تەقسیی کشتوکاڵو کۆمەڵایەتی بە خۆپیشاندانەکانی گەلکاریو دروێنەو ساوار کوتانو دیاردەی (قوربانی) کوشتنەوەو. گۆرانیی تاكو بە کۆمەڵدا، رەنگیداوەتەوە، ئەوەی شایانی باسیشە ئەو باسو بەسەر هاتو ووتوویژو ئەفسانەو داستانو چیرۆکانەیش دەگرێتەوە کەوا لەم بۆنە جۆراوجۆرانەدا پێشکەش دەکرانو بە لاساییکردنەوەی تاكو تێکرایی لە لایەن

کۆرس‌و سترانبێژو، چیرۆك بێژو، سازڤانی ئافرەت، یا تاکە پیاو، یا بە دوو سیٚ قۆڵی ـەوو ئافرەتان، زووربەی ئەمانەیش گەنجینەی میتولۆژیاو تەمسیلن‌و لە لای هەر میمەتێکیشدا یا لە هەر قۆناغێکی مێژوویی‌دا، دیاردەکانی ئاینی یەکسەر بەبێ هۆیەکانی دیکەی کۆمەلأیەتی بنەمای درامایان پێك نەهێناوە، بەڵکو مەیل‌و حەزو ئ‌رەزووی کۆمەلأیەتی‌و گردبوونەوەی تێکراپی کۆمەل‌و نیشتەجیٚ‌بوون‌و سەرهەڵدانی ت‌حمەکانی مانیفکتۆرەو پیشەی‌کارگەیی‌و پیشاندانە کۆمیدیانەو بەزم‌و رەزمی میللی‌ی میرەجان‌و ئاهەنگەکانی ئاینی‌و دونیایی دەبنە بنەمای دراماو شێوەیەك لە شێوەکانی دەربرینی شانۆیی ئاسایی سەرپیٚ‌یی – Lnprovition –و زارەکی‌و ئینجا لایەنی نەدەبی‌ی نووسراوی لیٚ چەکەرە کردووەو بە هۆی مەرج‌وپێداویستەکانی قۆناغ نووسراوەتەوە، هەروەك شانۆی نویٚ‌ی کورد، ئەم حاڵەتەش هیچ لە واقیعی چۆنێتی دراماو شانۆ کەم ناکاتەوە، چونکە زادەی چۆنێتی واقیعی نەتەوەی . . . کوردەو هیچ جۆرە جیاوازی‌یەکیش لە نێوان پیشاندانی ئیرتجالی‌و دەق نووسراودا نی‌یە، وا هەندیٚ تەوژمی شانۆیی هاوچەرخ بە ئیرتجالی بەرهەمەکانیان پێشکەش دەکەن‌و دەق نووسراویش هەر دەم بە تەواوی مۆرکی سەردەمی خۆی پێوە دیار نابیٚ شانۆی ئەسیناو رۆمان‌و ئەوروپاش پێشتر ئیرتجالی بوون‌و، دیاردەی سەر هەڵدانی درامای رۆمانی‌یەکان بە دیاردەکانی ئەسینا نەدەچووو، لە چەرخی راپەریندا سەرهەڵدانی دراما بە چەشنێکی‌تر بووو، لە پاش کەوتنی «ئەستانبول»ی بیزەنتی ئەوروپایی‌یەکان سوودیان لە دەقەکانی شانۆی ئەسیناو رۆمان وەگرت‌و دەقەکانی ئیرتجالیش کۆکرانەوەو لە چاپدران...

**٢ – هونەری شێوەکاری:–**

لە ئەشکەوت‌و پەرستگاو کێوو. خانوو بەرەکانی دێرین‌و لە زۆر سەرچاوەی مێژوویشدا بە چەشنێك لە چەشنەکان دەدۆزرێتەوەو، ئەمانەیش دراماو توخمی درامایی‌و تەقسی درامایی‌یان تێدایە، کە ئەم لایەنانە دەگرێتەوە:–

نەخش‌و پەیکەرو، نیگارو، رەسم‌و کۆڵین لە دارو بەردو ئاسن‌و زێرو، کانەکانی‌دیکەو قاپ‌و قاجاغ‌و چەك، کە جۆرەها کەرەستەی خاوو رەنگ‌و دەرمانات‌و ئامێری هونەریی‌و قالب‌و پێداویستەکانی ئەندازیاری‌و هونەریی بۆ رەخسێنراوە، هەروەها لە بواری رێك‌خستنی دیکۆرو، دێوجامەو کلێشەو مۆرو شەقل‌و کێل‌و رازانەوەو، ماکیاج‌و چنین‌و، برینی جل‌و بەرگی سەیرو کەول‌کردن‌و کەلێوس‌و ماسکی گیسك‌و نێری‌و پلنگ‌و وورچ‌و گاو ئاسك‌و بەراز داهێنان، کە باوك و باپیرانی کورد لە راوو چەند جۆرە پیشاندانی درامایی وەك (کۆسە بەبە)و (پیرو گورکی رەش)و (حوشترو گا)دا لە بەریان کردوون‌و پەرستگاکانیشیان لە شێوەی ئەوتەمەکانیاندا بووو. دەیان ساڵ بەر لە زایین[٣] گوتی‌یەکان ماسکی سەلکەبەرانیان لە سەر دەکردو، تیپی شەکەرەو کۆچەرە کە بەکەرو بارو گالیسکەو خیوەتەکانیان دەگەران ماسکی لە پێست‌و قوماش‌و لاستیکیان بەکار دەهێنا[٤]...

**٣ – هونەری گەمەو سەما:–**

گەمەو یاری‌یٚ سەیرو هەڵپەرکیٚ‌ی منداڵ‌و پیاوو ئافرەتان‌و رەشبەڵەك دەگرێتەوە، کە لە کۆنەوە. پەیوەندی‌یە کۆمەلأیەتی‌یەکانیان رۆژ لە دووای رۆژ لە رواڵەت‌و ناوەرۆکدا نویٚ‌یانی‌کردۆتەوە. جا لە بارەی هونەری چۆنێتی رێکخستنی یا سازدانیانەوە بێت، کە هەندێکیان لە سەردەمێکدا دراما بوون‌و بەرەبەرە هەندیٚ لە توخمەکانی بینای درامایی‌یان لەدەست داوە، یا پێشتر بە کۆمەڵ پێشکەش‌دەکران. ئێستاکەش مەوداکانیان تەسك بۆتەوەو، زووربەیشیان لە ئۆلۆمپیادی کۆنی کورد لە سەردەمی هوری‌و میتانی‌و میدی‌یەکان دەنوێنران‌و لە دامێنی شاخی (دەماوەند)ی هەورین‌و تەماوی ئۆلۆمپیادو مەشخەڵی ئۆلۆمپیادو بەسەر شاخ کەوتن‌و ستایش نانەوەش رێك دەخرا، هەروەکو مێژوویی گوزیدەو (ابن حوقل)و گراب باسیان‌کردووە،[٥] یا بەشێکیان جۆرە تەقسێکی درامایی کۆن بوون لەوانە:– سەمەنی‌و، سیانزدە بەدەرو سەماو زەمین‌و کۆسە بەبەو بووکە بە بارانەو[٦] گەمەی کەرو پاشا هەڵبژاردن‌و ئیشکەرەن، کەچی لە پاش ئاینی ئیسلام‌و لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە جۆرە تەقسێکی دیکەدا خۆیان دۆزی‌یەوەو لە بۆنەو میهرەجانەکانی بەهاراندا بە ئاهەنگە شانۆیی دەنوێنران...

بەڵیٚ باس‌و شی‌کردنەوەکانی نویٚ سەلماندوویانە کە هۆزەبانەو گەمەی راوە کێوی‌و قوربانی کوشتنەوەو شایی‌و رەشبەڵەك‌و هەڵبژاردنی باوکۆو بە بووك چوونی دایکۆو زبارەو بارەبوو سەر بە بۆنەو جەژنەکانی تێکراپی کۆمەڵ‌بوون‌و هەر لەم دیاردە تەقسی‌یانەش جۆرەها پیشاندانی درامایی‌یانەو دراماو شانۆ هاتووتەکایەوەو تواناو مەوداکانی دراماو زۆر جۆرە کۆمەڵەو تیپی هونەریی‌و کۆرسی تەقسی ئاینی‌و ئاسایی پەیدابوون‌و تەشەنەیان کردووە، هەر وەکو جۆرج تومسن‌و پسپۆرانی دراما سەلماندوویانەو بۆنەو جەژنەکانیش بە «مردن»و «زیندووبوونەوە» ناسراون‌و زانراون کە پاشخانی دوو جەژنی «لینا»و «دیاناسیس»ن هەر وەکو دوو جەژنەکەی کورد بە ناوی «خەزان»و «نەورۆز» کە لە ئەنادۆل‌و لە رۆژهەلأتی ئەنادۆڵدا بە «دیاناموس»و «دیناموس» ناسراوەو لە سەرەنووکی بوونی ژیانی ئادەمیزاد ئەم دوو جەژنە لە کوردستانیشدا هەر هەبووەو مەقدۆنی‌یەکان زۆر هەوڵی تێکدانیان‌داوە بەلأم بۆیان نەکراوەو لە سەردەمی سلووقی‌یەکانیش هەر لە باو بوون‌و، لە شاری (ئەگباتان – هەمەدان)دا کە پایتەختی ئەسکەندەریش بووە، شانۆ هەبووەو لە ساڵی «٥٣»ی پێش زایین‌و بە قسەی ستراپۆن‌و بلۆرتارخ کوردو ئەرمەنەکان شانۆیان هەبووەو لە شاری (سەقز) یا «ئاراتاکیسیا» شانۆیی «باکشیدز»[٧] یا –کچە رەبەنەکانی باخۆس‌ی یورپیدس – یان بە هاوبەشی پێشکەش کردووەو لێرەدا خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە کە پێویستە بیزانین، ئەویش بوونی شانۆی کوردستانی‌یە لە سەدەی تۆهەم‌و هەشتەمداو، لە سەزدەمی فەرمانرەوایی ئۆرارتۆیی‌یەکاندا، کەواتە بوونی شانۆی کوردستانی بەر لەٚ زایین بە مەقدۆنی‌و رۆمانەکان نابەسرێتەوە، ئەگەرچی مەقدۆنی‌یەکان لە زۆر شاری وەك ئەسکەندەرۆنەو بابل‌و ئەگباتان‌دا شانۆو کۆمەڵەی «دیاناسیس» ،و ئۆلۆمپیادیان دامەزراندبووو، بی‌گومان فەرمانرەوایی چەند سەد ساڵەیان بووە هۆی ئەوەی کوردو مەقدۆنی‌یەکان سوود لەیەکتر وەرگرن‌و پێکەوە بەشداری لە جۆرەها جموجۆلی کۆمەلأیەتی‌و درامایی‌بکەن. سەرەرای ئەمەش خۆپیشاندانە درامایی‌یانەی نەورۆز لە سەردەمی مەقدۆنی‌و سلوقی‌و سەلجووقی‌و دەیلەمی‌یەکانیش بەردەوام بووەو[٨] لە ساڵی ١٨١٢ی ز «مۆریر»ی مێژوو نووسی فەرەنسایی لە پاش دیتن باسی خۆپیشاندانە درامایی‌یانەی جەژنی نەورۆزی



خەڵکی [دەماوەند]ی کردووە کە باوك و باپیرانی خۆیان بە کورد دەزانن..

**٤ - هونەری موسیقا:-**

تریەو نزم و ئاوازەکانی کورد، جۆرەها زانستی‌ی مۆسیقای لێ هەڵدەهێنجری، کە ڕەنگدانەوەی جموجۆڵەکانی ژیانن، یا کارتێکردنی سروشت، یا هەردووکیان بەیەکەوەو بە هۆی دەنگی ئاسایی ئادەمیزاد، یا بە دوو دەست و دووپا، یا ئامێری دارین و ئاسنین و، ئیقاعی و فودارو ژێداریان، بۆ مەبەسەرکراوەو کەم و زۆر بەشێکیان دۆزراونەتەوەو لەسەر چاوەکاندا دەبینرێن.. [٩]..

لێرەشدا زاراوەی مۆسیقای کوردیی ڕۆژ ئاوایی، یا ئیقاعی مۆسیقای کوردو ئیقاعی شانۆگەری‌یەکان ناگونجێن!! یا ووت و وێژی نێو بابەتە فۆلکلۆری‌یەکانمان گەرچی دیالۆگن، بەڵام دراماین نین و، لە گریکەکانەوە بۆمان ماونەتەوە!! یا ئەو کەسانەی دەڵێن با جارێ سوود لە دەقە جیهانی‌یەکانەوە وەبگرین، تا فێرە توانای دراماین دەبین!! چەند بۆچوونێکی خۆماندوو نەکردن و خۆ - گوازتنەوەیە لە واقیعی هەمە جۆری کەلەپووری کوردی و، مەیلی ئەم جۆرە بۆچوونانەش لە پێناس کردنی شانۆی کوردەواری‌دا وورد بین نی‌یە، گەرچی جەماوەری کورد بەتێکرایی دراماو شانۆو زاراوەکانیان دەخوڵقێنن ، بەڵام گەر جەماوەری کوردو شانۆ خۆیان لەیەکتر نەدۆزی‌یەوە، ئەوە زانیاری‌یەکانی دراماو دەروازەی دراما دەبنە قسەی سەر زارەکی..

**دراماو جۆرەکانی - Drama -**

دراما یاری‌یەکی گەپێنەری پێناس کراوە، پشت بە کارو، ناساندن و لاسایی کردنەوە - Memisis - دەبەستێ، دراما، تەمسیلە - Acting - هەروەکو پێشینان ناویان لێناوە، دراما لاسایی کردنەوەیەکی هونەریی واقیعێکە، یا ڕووداوێك، کە لە کردەیەك، یا لە چەند کردە پێك‌هاتی‌و، جەوهەری هەر چەشنە درامایەکی کۆن و نوێ فەلسەفەکەیەتی‌و، بە شێوەیەکی گشتیش دراما سێ جۆرە [١٠] :-

**جۆری یەکەم:-**

درامای یەك‌مەودا ، وەك درامای بیستن ئەوەتا کورد لەو کاتەی ئێستگەی ادبۆی کوردی لە ساڵی ١٩٣٩دا دامەزراوە، بۆتە خاوەنی ئەم جۆرە درامایە کە ەبیستری‌و هەستی‌پی‌دەکرێت و نابینرێت و بینەری بۆ کۆمەڵ‌نابێت و بەرادیۆو یکۆرد رادەگەیەنری‌و درامای بیستن لە چەرخی نوێ‌دا جێگەی لاسایی کردنەوەی فسانەو داستان و حیکایەت و چیرۆك بێژی بەرتاگردانی کوردەواری‌و دیوەخانەکانی گرتۆتەوە..

**جۆری دووەم:-**

درامای سینەماو تەلەفزیۆنەو دەبینری‌و دەبیستری‌و مەودای ڕووداوی گشتی‌ زیندوو نی‌یەو، لە شێوەی وێنە هاتووچۆ دەکات، ئەو بەرهەمە کوردی‌یانەیش کە سینەماو تەلەفزیۆن ئامادە، یا تۆمارکراون، دەچنە ڕیزی ئەم جۆرە درامایە، زۆریش پێویستە نووسەرانی بەرێز هەوڵی نووسینی ئەم جۆرە درامایە بدەن و بلاوی‌بکەنەوەو هەر بۆ پیشاندان بەرهەم نەنووسن [١١]، سەبارەت بەم جۆرەش فیلمی سینەما بەرهەمێکی یەك ئەڵقەیی تەلەفزیۆن جێگەی چیرۆکێکی درێژی یەك شەوی چیرۆك‌بێژی گرتۆتەوەو ئەڵقە زۆرەکانی تەلەفزیۆنیش دەبنە حیکایەتە زۆر درێژەکان کە بە شەوێك کۆتایی‌یان نەدەهات و هەفتەیەك یا مانگێك و زیاتریان دەخایاند..

**جۆری سێهەم:-**

شانۆیە ، کە سێ مەودای سەرەکی‌و زیندووی هەیە (دەق + شانۆ پێویستی‌یەکانی سەر شانۆ + ئامادە بوونی بینەران لە مەکۆی پیشاندان)دا شانۆی نوێش جێگەی درامای میهرەجان و دیوەخان و مزگەوت و چایخانەو تیپە گەڕۆك و جێ‌نشینەکانی گرتۆتەوە..

**شانۆی کوردی**

شانۆیی ، بزوتنەوەیەکی دیارو هەست‌پێ‌کراوی ڕووداوی گشتی‌یە، سەرەتاو ناوەندو ئەنجامی هەیە، مەرج نی‌یە ئێوان ئەم بەشانەی حسێبێکی زەمەنی بۆکرابێ. بەڵکو بەك جەستەو بەتێکرایی لە زەمەنێکی شانۆیی‌دا پیشان دەدرێ، ماوەی پیشاندانیش یاسایەکی تایبەتی‌ی بۆنی‌یەو، درامانووس ئارەزووی‌خۆیەتی شانۆگەری کورت دەنووسێ یا درێژ، کورت و درێژی دراماش نایێتە پارسەنگی لێکۆڵینەوەو بایەخ‌دان وەك کورتە چیرۆك و ڕۆمان!! جا چ کورتە شانۆیی بێت، یا درێژ. لە یاساکانی گشتی‌ی دراما‌دا بەدەر نابن، چەندێتی ماوەی شانۆیی‌پەیوەندیی بە چۆنێتی ڕشتەو ڕێبازگەو ژمارەی کارەکتەرەکانەوە نی‌یە، لێرەدا چۆنێتی ڕووداوەکە خۆی دەبێتە سەرپشك و، زۆریش ئاسایی‌یە کورتە شانۆیی‌یەك لە شانۆگەری‌یەکی دوورو درێژدا مەسەلەیەکی مەزنترو، شوێن و کارەکتەری زۆرتری هەبێت، هەر وەك (مەمی ئالان)ی عبد الرحیم رەحمی هەکاری ساڵی ١٩١٩و (محاورەی ئیقتصادی)یە فێرکردە رامیاری‌یەکەی ئەمر أحمد حمدی صاحبقران کە لە ساڵی ١٩٢٢دا بلاوکراوەتەوە، یا شانۆیی (هەڤند)ی جلادت عالی بدرخان کە لە ساڵی ١٩٣٣دا نە چاپ‌دراوەو، وا بزانم تا ئێستا کە بێجگە لە ئێمە هیچ کەسێك نەیزانیوە کە ئەم دەقە شانۆیی‌یەو، شانۆگەریی (هەڤند - Havend)ی یەك پەردەیی لە (١٧) حەڤدە (چڤانۆك = دیمەن)[١٢] و لە (١٠) دە کارەکتەر پێك‌هاتووەو، بە (تماشا) ناوبراوە. یا، (قەڵای دەمدم)ی پێنج پەردەیی مامۆستا موریس عیسی ملاك، کە بە زمانی عەرەبی ئامادەی کردبووو، لە ڕۆژی هەژدەی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٣٨دا گردبوونەوەیەکی ڕۆشنبیرانی کوردو ئەندامانی تیپی (روابی)ی ئاسووری لە شاری (حسکە = حەسەکە)ی سوری‌دا پێشکەشیان‌کردو، مامۆستا مۆریس عیسی ملاك خۆی کارەکتەری (خانی لپ زێرین)ی ناساندو، بەڕێز (یعقوب ابراهیم) یش دەوری

حتى سى. یا وەك شانۆیی (مەلیك)ی سەدەی نۆزدەهەمو شانۆیی (کاوەی ئـــسگەر)ی ئاهەنگە شانۆی نەورۆز لە بەهارانی هەموو سالێكدا...

ـە هەر درامایەکدا دەتوانرێ لایەنێکی ژیان، یا هەمووی، یا کارەکتەرەکان لە ــ ی‌یەوە. پیشان بدرین، تا گەورە بوونیان، جا بگەن بە ئامانج یا نەگەن، یا ـ ـەتو ململانێی هەمە جۆری تێ بئاخنری، گرنگ ئەوەیە چنینێکی رێكوپێکی لێ نەرچێتو بینەر خۆی تێدا بدۆزێتەوە، هەروەك:- (هڤند)ی جلادت عالی ـرحن لە سالی ١٩٣٣داو، (دلداریو پەیمان پەروەری)ی نەمر ئەبو بکر هەوری،[13] ـ (ئیـــسان ئەوەی ئەچینێ، ئەوە ئەدوورێتەوە)ی سالێ ١٩٣٠و (کچی کوردستان)ی سالی ١٩٣١و) سالی ١٩٣٢، [*] یا ئەم درامانە کە لە کەلەپوور وەگێراونو ئامادەکراون:- (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە)ی طلعت سامانو هەردوو (حەجو سیامەند)ی فؤاد مجیدو، ناظم دلبەندو، (بووکی بەفر)ی مهدی ئومێدو (لاسو خەزال)ی ناظم دلبەندو، (مەمی ئالان)ی باییز عمر، بەمەش بیر لە کورتە چیرۆكو چیرۆکی درێژو رۆمان ناکرێتەوە، ئەلبەتە چیرۆكو شیعرو گۆرانیش هیچ کاتێ نەبوونەتە، پێشرەوی دراماو، ئەدەبی دراماش هەر درامایەو بەسەر خۆیدا دابەش دەکرێت، ئەگینا رشتەو قۆناعەکانی سەرهەلدانی جۆرەکانی هونەرو ئەدەب بە گشتی تێك دەشکانو، مەوداکانیان تێك دەچوون، شانۆگەریی بۆ خوێندنەوەش، کە هەندێ لە رۆشنبیران بایەخی پێ‌دەدەن رەنگدانەوەی بێ توانایی نووسەرەکانیانەو، رەخنە گرەکان ئەم زاراوەیان هێناوتەدیو ئەو دەقانەیان پێ‌ناساندووە، کە لە سەر شانۆدا سەرنەکەوتوونو، دەستکاریش کراون، لە هەمان کاتدا زۆر نووسەری بە ناو بانگ لە جۆرەکانی دیکەی ئەدەبو هونەر سەرکەوتنیان وەدەستهێناوە کەچی نەیانتوانیوە دراما بنووسن لەوانە:- شیلیو، کونرادو، جۆرج مۆرو، هاردیو، هنری جیمسو بروانج، [15] چونکە زاخی دراما تەنیا دیالۆگ نی‌یە، بۆ پیشاندانو نواندنە نەك بۆ خوێندنەوە، بەلکو گەیاندنو رووداندو بزووتنەوەیەو، زاراوەی چیرۆکە

**شانـــۆو چیـــرۆك بۆ شانـــۆو رۆمـــانـــە شانـــۆگـــەری هەرشانۆ نامەو**

شانۆییو شانۆگەریین، ئەلبەتە لکاندنی ئەم جۆرە زاراوە کۆنانەش لە نرخی شانۆگەری‌یەکە، کەمو زیاد ناکەنو خەوشە هونەری‌یەکانی دەقە بێ تواناو ساکارەکانیش چارەسەرناکەنو نابنە دراماو سوودێکی ئەوتۆش بە خەونە سەوزەکانی شانۆی کورد نابەخشنو هەموو چەشنە ئەدەبو هونەرێکیش لە خەرمانەی زاراوەی درامادا شوێنیان نابێتەوەو، درامای شیعرییو پەخشانە شیعرو گۆرانیو پەخشان هەن، بەلکو دەتوانرێ هەر هەموویان پێکەوە شانۆگەری‌یەك بێننەکایەوە، تا رادەیەك (مەمی ئالان)ی ١٩١٩و «هڤند»ی جلادت عالی بدرخانو «دلداریو پەیمان پەروەری»یو (لە پێناوی ئەوین)دای زەکی أحمد هەنارییی لە سالی ١٩٦٥داو[*] (راپۆرت)ی فؤاد مجید میسری ئەم دیاردەیان لێ دیارە...

بە شێوەیەکی گشتیی، درامای کوردی پێشکەوتنخوازەو مۆرکی ئارەزووی گۆرانکاریی پێوە دیارەو، هەولی سەلماندنی کەسێتیو گەواهی خۆمالیو هەستی نەتەوایەتیو چینایەتی خۆی دەداو، هونەرمەندو شانۆی کورد لە سالی ١٩٧٠وە سەرکەوتوانە توانیویانە زیاتر سوود لە تەوژمو قوتابخانەکانی هاوچەرخ وەربگرنو، زۆر بەرهەمی جیهانی تاقی بکەنەوەو، بازنەی شارو مەلبەندی ناوچەیی بشکێننو، هەر لەم ماوەیەدا چەند تیپێکی شانۆیی **ونیقابەی هونەرمەندان** لە شارو قەزاکاند سەریان هەلداو شان بە شانی

تیپەکانی عیراق لە میهرەجانەکانی گشتی‌دا بەشداربوونو یا میهرەجانی تایبەت بە شانۆی کوردیان رێكخستووەو کۆری سەر بە ئەدەبو رەخنەی شانۆییان سازداوەو. پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە سلێمانیو موصلدا ئاسۆی قۆناغێکی نوێ یان لە رووی هونەری کورد کردۆتەوە لە پاش لێکۆلینەوەی زۆر دەقی دەستنووسو لە چاپدراو دوو چەشنە درامای کوردیمان بەدی‌کردووە لە بواری بینای رووداوی‌گشتی‌دا.

**چەشنی یەکەم:-**

«شانۆیی ئاوێتە»یی‌یە، کە رووداوەگشتی‌یەکەی زیاتر لە مەسەلەیەکی سەرەکیو چەند ووردە باسی‌دیکە پێك‌هاتووە، ئینجا مەسەلەکان لەگەلێ یەکتردا بگونجێن. یا نەگونجێن، بگەن بەئەنجام، یا نەگەن بە ئەنجام، ئامانجی‌هەموویان دەولەمەندکردنی گێتی‌ی هێلی سەرەکی‌ی دراماکەیەو، جەوهەری دراماکەش ئەم دیوو ئەو دیویان پێ‌دەکات، وەك کۆمیدیای «مەلیك»ی ئاهەنگە شانۆی میهرەجانەکانی سەدەی نۆزدەهەمو «دلداریوپەیمانپەروەری» وهەردوو «مەموزین»ی پیرەمێردو هونەرمەند جواد رسول ناجی‌ی نەمرو «زێرین»ی ئەمین میرزا کریمو «هاوارێکی تاساو»ی جلیل زەنگەنەو «سورمێ خان»ی محمد عبد اللهو «محمدو سێوێ»و «قەلای دمدم»ی سعدون یونسو «قەلای دمدم»و «خانزادێکی‌تر»ی طلعت‌سامانو «لاسو خەزال»و هەر دوو «خەجو سیامەند»و «تەنەکە»ی فؤاد مجید میسری..

چەشنی دووەم:-

شانۆیی سادەیە، کە رووداوە-گشتی‌یەکەی لەسەر یەك هێلی سەرەکی‌بنیاتنراوە، بابەتێکی سەرەکیو چەند ووردە باسی لاوەکی بە هێلەکانی‌یەوە خزمەتی هێلی سەرەکی دەکەن یا ناکەن وەك «ئاشەوان»و «هەوێز مالین»ی سەدەی نۆزدەهەمو «مەمی‌ئالان»و «محاوەرەی ئیقتصادی»و «بەد رەوشتی»ی هونەرمەند فؤاد رشید بکر لە هەولێردا سالی ١٩٢٨ کە ژمارەیەکی «زاری کرمانجی» باسی دەکاو «دایکێکی جاهیل»ی سالی ١٩٣٠و «فارس – Farce» ەکەی طاهر صادق کە لە سالی ١٩٣١ دا بەر لە شانۆیی «نیرۆن – وێنە١ – ٢)[17] لە رەواندوز نوێنراوە. هەروەها بەرهەمە خۆمالی‌یەکانی تیپی خانەی مامۆستایانی لادێیی دهۆك لە نێوان سالانی «١٩٤٩ – ١٩٥٣»داو درامای «کاوەی ئاسنگەر»و، «پیلان»و، «مستر لاین»ی مامۆستا کریم شارەزاو «گولی خوێناوی»ی گۆرانی مەزنو کۆمیدیای «ئۆتومبیلچی»ی ئەمین میرزا کریمو «فالچی»یێ «مەلا گچکە» لە سالی ١٩٧١داو «وەلی دێوانە»ی محمد عبد الرحمان زەنگەنەو، «گوندەکەم بەجێ ناهێلم»ی مۆیدفقیو سلام کۆییو «بۆ لێم تێ‌ناگەی» تحسین شعبان، لە هەمان کاتیشدا لە بارەی هونەری «چنین – PLOT» گەرهاتوو دراماکە ئاوێتە بێت یا سادە دوو جۆرە چنین لە درامای کوردیدا بە بەرچاو دەکەون:- یەکەمیان – چنینی لێکدراوە – لێکدراوەکەشی بە پاشو پێش‌کردنی زنجیرەی زەمەنی‌ی رووداوی گشتی روودەداتو، چنین بە پێشەکی‌یە بەرایی‌یەکەی دراما لە سەرەتاوە بە دوورو درێژی خۆی نانوێنی، بەلکو بەکردەوەی هەلبژاردنی رووداندە – Action – ئاسکەکان وا لە بینەران دەکا لە

..رگەی یەکەکان بگەنو سفتو سۆو تامەزرۆیی‌یان دادەگیرسێنێ تا بینەران بەشداری پیشان‌دان‌بکەن، جا لە ناوەراست یا نزیك کۆتایی، یا هەر لە کۆتایی‌یەوە بەشکاندنی هونەری، هێڵی دراما بەسەرخۆی دابەش دەبێتو یەکەکانی دژو نادژی باری بنچینە بەرامبەر بە یەکتر رادەگیریو دیمەنێکی‌تر لە جیاتی پێشەکی‌ی راستەقینە دەبێتە پێشەکی بەرایی‌و، لە ناواخنیشدا هێڵەکانی دراما ئاستی خۆیان دەگرنەوە یا ناگرنەوە، بەلام لە ئەنجامدا بەیەك ئاست دەرۆن، هەروەك «هاوارێکی تاساو»و «خانزادێکی‌تر»و تەم جۆرە چینەش مەرجو مەبەستی خۆی هەیە، تەنیا بە ئالۆزکردنی زنجیرەی زەمەنی مانای لێکدراوی نادات‌و لە باسی رووداندا زیاتر روونی دەکەینەوە..

جۆری دووەم:-

شانۆیی چنینی ئاسایی - یە و سەز بە سەرەتا زەمەنی‌یەکەی خۆی دەست‌پی‌دەکات‌و رۆڵی خۆناساندنی بەرایی دەگێری‌و، هێڵی دراما لەم جۆرە درامانەدا بە شێوەیەکی ئاسایی لە سەرەتاوە، تا کۆتایی دەروات‌و، مەرجیش نی‌یە لە ناوەراست‌و ئەنجامدا پاش‌و پێشی تێ‌نەکەویێ، ئەڵبەتە پێشەکیش لە هەر جۆرە درامایەکدا لە یەکێتی‌یە ئۆردووگانی‌یەکەی جەستەی چنین دانابری‌و، گیان‌و ژیاری تێکرایی بەرهەم زیندەگی‌ی دەداتی‌و، کاکلی دراماو شانۆیی لێ بەدی دەکری‌و، زۆریش زەحمەتە سنوورێکی دیاری‌کراو بۆ پێشەکی بکێشری، یا لە شێوەی قالب، پێشەکی‌و ناوەراست‌و کۆتایی بۆ دراما دابرێژرێت ؛ بەلام هەر چۆنی بێت، دەتوانرێ، لە هەر بەرهەمێکدا پێشەکی‌یەکی بەرایی، یا پێشەکی‌یەکی ئامادەیی، یا ئامادەبوون تا رادەیەك ببینرێ، یا دەست‌نیشان بکرێ، کە بە زاراوەی باری خۆناساندن - Initial situtıon - پێناسەکراوە، کە واتە باری خۆناساندن لە بەراییدا دووحاڵەتی بۆ هەیە، لە دراما چنین ئاسایی‌یەکاندا سەرەتای راستەقینەیە ؛ بەلام لە دراما چنین لێکدراوەکاندا سەرەتای راستەقینە نی‌یە، بۆیەش بەکارهێنانی باری خۆناساندن لە جیاتی زاراوەی سەرەتا یا پێشەکی‌ی بەرایی جوان‌و پەسنترە..

پێشەکی‌ی راستەقینە، یا سەرەتای زەمەنی‌ی دراما، ئەو بارەیە کە دراماکە بە هەرسێ مەوداکانی سی‌یەکە دەست پی‌دەکاو، زەرورەتێکی حەتمی پەیدای‌دەکات‌و بە باری بنچینەی دراما دەژمێردری‌و باری بنچینەش بە یەکەکانی نادژو دژی‌یەوە روو داوی‌گشتی دەخولقێنێ، کە باری گشتی‌ی دیاری تێکرایی درامایە، جا باری بنچینە لە «محمدو سیۆی»دا یا لە «لاس‌و خەزاڵ»و «تەنەکە»دا دەناسێندری‌و دەبینرێ، لە راپۆرت»دا پێناسە دەکری‌و وەکو «هاوارێکی تاساو» تێکەڵ بە بینای درامایی دەبی‌و ؛ بەلام لە «خانزادێکی‌تر»دا مەودایەکی.باری بنچینە لە ژوورەکەی بازرگاندا دەبینرێ‌و، لایەنەکانی دیکەی لە بینای دراماییدا رەنگ‌دەداتەوەو، دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی‌و هونەری بە تایبەتی دراما، سەرە دەق - Sur Text و ژێرە دەق - Sub Text - ی هەیەو

لەیەکتر جیاناکرێنەوەو، لە تەك بینای ئاسایی هەر درامایەکیشدا بینایەکی رەمزیی خوازراو دەبی‌و بە هەر دووکیان بوونی دراماکە پێك دەهێنن، کەوایێ هێڵی سەرەکی‌ی دراما لە چەند هێڵێکدا خۆی دەنوێنێ، کە رەفتاری هەر جۆرە توخمێکی بەشداری لە دراماکە داو، ئەوەی لە بەر چاوە هێڵی دیارە - Visual Line - کە لە سەر شانۆدا دەنوێنری‌و دەبینرێ ؛ بەلام هێڵی نادیار - Nonvisual Line -، دوو جۆرە، یەکەمیان هێڵی نادیاری ناسێندراوەو، لەسەر دەقدا باس‌کراوەو ناوی دی‌و نابینرێ هەر وەك درامای بیستن، بۆ نموونە:-

زەوت‌کردنی دایکی سیۆیێ لە لایەن سلێمان بەگەوە، یا هەوڵدانی کوشتنی قەیسەر هەر چەندە باری بنچینەیە لە «هاوارێکی تاساو»دا.

جۆری دووەم هێڵی نادیاری نەناسێندراوو نەنوێنراوەو، لایەنە کورت‌کراوەکان‌و ژێرە دەق دەگرێتەوە، کە بینەر خۆی لە ژێرە دەقدا بە بەراوورد کردن‌و لێکوڵینەوە دەیدۆزێتەوەو، هێڵی سەرەکی‌ی دراماش بە گشتی لە چنین ئاسایی‌یەکاندا، یا لە چنین لێکدراوەکاندا بە زۆر شێوە هەڵدەکشێن‌و مەوداکانی خۆیان وەردەگرن لەوانە[19] :-

١ - هێڵی ئامادە:-

لە سەرەتاوە هێڵەکەی لە شێوەی گۆشەی نووك تیژ یا بازنەیی خوارو خێچ بەرزدەبێتەوەو لە ترۆپکدا گۆشەیەکی کراوەی ئامادە بەرامبەر بە گرتنی چاوەری‌کراو پێك‌دێنێ، وەك «مەمی ئالان»ی سالی ١٩١٩و «محاوەرەی ئیقتصادی»ی سالی ١٩٢٢و شانۆیی «کاوەی ئاسنگەر» کە زالێ دەبێتە سەر زوحاك‌و خۆی‌و کوتکەکەی لەسەر شانۆدا دەمێنێتەوە.

٢ - هێڵی سەرکەوتوو:-

هێڵێکی خوارو خێچی کەم‌و زیادە، بەرزدەبێتەوەو لە دوندیشدا هێڵی سەرکەوتوو، بەرەنگاری هێڵی دژخۆی دەبی‌و دەیبەزێنێ‌و بە گۆرینی باری بنچینە چار دەبەخشێ‌و ئاسۆیی دەروات وەك:- کۆمیدیای (مەلیك)و «دڵداری‌و پەیمان پەروەری‌و فەرەیدوون لە «کاوەی ئاسنگەر»دا.

٣ - هێڵی سەراوژێر:-

هێڵەکەی وورده وورده هەڵدەکشێ‌و لە ترۆپکدا تووشی بەرەنگاری دەبی‌و بەرەو خوار دادەشکێ وەك:- ئاشەوان‌و «سروودی دڵداری»ی جان کۆکتۆ کە (گەزیزەی) هونەرمەند لە شێوەی شانۆیەکی داخراودا پێشکەشی‌کرد..

: هێڵی داشکاو:-

ئەمەیش ئەبرێت یا بە خوارو خێچی بەرزدەبێتەوەو، لە پڕیەدا لەپڕ دادەشکێ‌و ... تەوەری سەرەکی دەبەزێ‌و ئەمەیش لە درامای چاخگیری‌دا - Modernism - زۆر بەدی دەکرێ، هەروەك مامۆستا یانکی‌و «قرال جونز»ی ... نۆبێل. هەر چەندە ئەم هێڵە لە شێوەدا لەگەڵ هێڵی سەراوژێر دەگونجێ

... دەبێ ئاگامان لە مەودای فەلسەفی‌ی دراماکە هەبێت‌و سەرنەکەوتنی کەسێتی‌ی ... لە هەر درامایەکدا هێڵەکەی بە سەراوژێرو داشکاو ناژمێردرێ. لێرەدا ... دراماکە مەرجە کە لە ڕەفتارو هەڵوێستی کارەکتەری تەوەرەکان ... دەداتەوە..

ؤ - هێڵی ئاسۆیی:-

ئەمەیش ئاسۆیی دەڕوات‌و هێڵی دیارو نادیاری دژ خۆی ئاشکرا دەکاو وورده ... تیژو گژدولکەیی دەنوێنێ. وەك لە ڕاپۆرت»و تارادەیەکیش «جەنابی ...»و «پێکەنین بەپێ‌ی یاسا»ی چیرۆك نووس حسێن عارف بەدی‌دەکرێت.

- هێڵی قووچەکی:-

... ڕادەیەك لە دراما شێوە ئەرستوتالیزمی‌یەکاندا بەم جۆرە ڕوو دەدات ... ڕوو ڕووداوی هەڵکشاو دوند ڕووداوی لێژبوو چار کۆتایی) ئەم هێڵەش لە (چنین - PlotR) نوێدا گۆڕانی بە خۆوە بینیەوەو زێدەیی بە خۆی دەدات‌و لە هەڵکشان‌و ... ندا. بە هۆی دەوڵەمەندی دراماکە لە بواری ڕووداوی گشتی‌دا هەروەك:- ... مانێ کە هێڵی ئەرستۆتالیزمی‌ی بەسەردا دادەچەسپێ یا هەروەك «بووکی ...»و «بەهرەی کوشتن»ی هونەرمەند مهدی ئومێدو «تەنەکە»و خەج‌و سیامەند»و ... و خەزاڵ».

جا ئەم شەش جۆرە هەڵکشان‌و داکشانی هێڵی دراما یەکەکانی نادژو دژی باری گشتی‌ی دیاری سەر بە باری بنچینە پەیدای‌دەکەن‌و بە شێوەیەکی گشتیش لە جیهانی ئەدەب‌و هونەردا دەبینرێ بەلاّم داهێنان هێڵێکی پڕ بە پێستی خۆی دادەهێنێ‌و چۆنێتی ئەم هێڵ‌و ئەو هێڵ نابێ ببن بە قاڵب‌و مەرجێکی داسەپێنراوو، مەرجیش نی‌یە دوند هەر لە ناوەندی ماوەی دراماکەدا ڕووبدات، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمەکان بەگشتی‌و بەبێ مەرج پێکهاتنی - Composition - بوونیان کە ڕووداوی گشتی‌یە لە بواری چنینەوەدا چنین لێکدراوەبن. یا چنین ئاسایی، بۆیەش بەکورتی لە چنین دەدوێین کە دەست‌پی‌کردنی ئیشە هونەری‌یەکەی نووسەرە لە سەرەتاوە تا کۆتایی. کەوابێ چنین هۆنینەوەی هەموو لایەنێکی بەرهەمەو، بوونێکی سەربەخۆی بۆنی‌یە.



لەتەك توخمەکانی‌تری بینای دراماو کە دەڵێین دراماکە. یا ڕۆمان‌و، چیرۆکەکە ڕێك‌وپێکە مەبەستمان سەرکەوتنی نووسەرە لە (چنین)ەکەیدا. یا کە دەڵێین دراماکە یا شیعرو مۆسیقاکە لە باریەك ترازاوە. مەبەستمان سەرنەکەوتنی نووسەرە لە ئیشە هونەری‌یەکەی‌داو، بینای بەرهەمەکەی فش‌و فۆڵ‌و شەت‌و پەتە. کەواتە (چنین - Plot) زیرەکی نووسەرو، شارەزایی‌و کارامەیی‌و پسپۆری‌و بوونی «هەستی درامایی»و هەستی شانۆیی)و (هەستی دەرهێنان)و سەرکەوتنی ئامۆژگاری شانۆیی‌یەو، سەرکەوتووترین چنینیش ناخی دیاردە دەرەکی‌یەکانی ناوەوەی بزووتنەوەی واقیع هەڵدەتەکێنێ کە هەردەم بە تەواوی ناکەونە ڕووو ڕاستگۆیی‌بەکەشی لە خۆنەدانەدەستەو. گەر دەستکاریش کرا جەوهەرەکەی خۆی دەپارێزێ‌و دوو فاقیش نانوێنێ، ئەگینا بەرهەمەکە بازاری - Mercantilism - و کوڕی ڕۆژی خۆیەتی وەك درامای چاخگیرەکان کە بە هەنجەتی نەبوونی گرێ‌و ململانێ‌و دەرچوون لە واقیع بە لەنگی چنراون‌و بینایان لاسەنگە، گەرچی هەر ڕووداوێکی گشتی پێداویستەکانی هونەریی بەخۆوەیەو، بە خورتیش لە ڕووداوە سادەکاندا، ڕووداوی ئاوێتەی لێ ناچنرێ‌و لە ڕووداوە ئاسایی‌یەکانیشدا درامای چنین لێکدراو ناهۆنرێتەوە، بە پێچەوانەش هەست بە دەستکردیی بەرهەم دەکرێ‌و توندو بەندی چنینیش مانای هەژاندن‌و حەپەسان بە ڕووداوە دەگمەنەکان نادات، بەڵکو ناساندن - Personificatuion - و کارو نواندن - Acting - مافی خۆیان دەدرێتێ‌و زۆری ئامۆژگاری‌و ڕستەی شاش بەکارهێنان کە هەندێکیان دەبنە بزووتنەوەو هەندێکیشیان بەرجەستە دەکرێن، یا بە خورتی دیمەن گۆڕین‌و، درەنگی‌دان، بێ ئەوەی حسێب بۆ ماوە بکرێ، کلیلی بزوتنەوەو نواندن‌و زەپۆشی گشتی تێك دەدەن مەزجیشە مەودای فەلسەفی‌و بیرۆکەی سەرەکی‌و بزوێنەرو

ڕەفتاری کارەکتەرو. تەورەکانو هەرسێ مەودای بەدەنیو دەروونیو کۆمەلایەتی ی هەر کارەکتەرێکی سەرەکیو ناسەرەکی بڕەخسێنێو. مەودای چوارەمیش هەڵبەستەو. سەر بە مەودای دەروونی یە. چونکە گەر بێتو لە مەودا لاوەکی یەکانی ئەو سێ مەودا سەرەکی یانە بکۆڵیەوە ئەوە مەودای سیانزدەهەمیشمان دەبێ. کەچی چاخگیرەکان چەپڵە بۆ مەودای چوارەم لێدەدەنو. بە ناوی درامای دیوی ناوەوەو سایکۆ درامای جەوهەر دژ دراما – Anti Dram – یەکێتی ی جیهانی هەر سێ مەودا سەرەکی یەکان تێك دەشکێنن تا دابڕانو نەزعەی تاکەکەسیو ڕەشبینیو سایکۆباسی بلاوبێتەوەو کەسێتی ی مرۆڤ لە بوونە کۆمەلایەتی یەکەیدا دامالرێ.

دراما نووس بۆ ڕەزامەندی ئەکتەرو دەرهێنەر دەقو، ووتووێژ ناچنێو لە مۆنتاجو کۆپی کردنو چاولێکەری دوور دەکەوێتەوە چونکە چاولێکەری لە پێناوی شێوەو ناوەرۆکدا بەهرە کوژەو ڕێگا لە هەولو داهێنانو شێوازی تایبەتی دەگرێو مۆرکی خۆماڵی ی بەرهەم دەشێوێنێو هاوکێشەی واقیعو شانۆ تێك دەداتو، سەرچاوەکانی داهێنانیش لە واقیعی نووسەردایەو شێوەی زیباو، شوێنو دیکۆرو، ئیقاعی موسیقاو بابەتی ناپابێ لێ بەدی کرێ، لە هەمان گرنگتر دەبێ دراما نووس یەك دەنگ نەبێو سەربەستی ی کارەکتەران زەوت نەکاو هەر نەچێتە کلێشەی تاکە پاڵەوانەکەی خۆیو، ژیاریو زرنگی بەرهەم ماوەدانو خستنەکاری گشت توخمەکانی بینای درامایەو، گەر بەکرۆکەی درۆزن ڕۆڵی خۆی نەدیبوایە، زیاتر شایەدی درۆزنی خۆی نەدەداو، مەزنی ی دڵداری «مەمو زین»یش سەرنەدەکەوت، لە هەمان کاتدا زۆر خۆدوواندنو شێوە بازیو ناوەرۆکی زەقو تەمو مژیو زۆری کارەکتەرو زۆر دانیشتنو درێژی دراماو ،زۆری دیمەن باویان نەماوە.

چنین، یا شانۆگەری، هەولێکی کۆمەلایەتی یە، ئیتر نازانین لەبەرچی؟! هەر کارەکتەری سەرەکی لە سەرەتای چنین تا کۆتایی هەر لەبەر چاو بووەو، دڵدارو، دەوڵەمەندو، پاشاو، میری پۆشتەو جلو بەرگی جوانی لەبەر بووەو، لە هەموو شتێکدا هەیاسی دورناسو پاڵەوانی ئاخیر زەمان بووەو، ئەو کەلەپوورەی کورد هەیبووە، هەر لە ماڵی ئەو بینراوەو، ئەوانەی دروستیان کردووە شایانی گاڵتەو گەمە پێ کردن بوونو هەر پاڵەوانەکانی سەرەکیش گرێی سەرەکیو، نا سەرەکی یەکانیان دروست کردووەو کردوویانەتەوەو، ئەوانی دیکەش بوونەتە ئەکسسواری بێ ژیانو بوونیان لەسەر شانۆدا بۆشایی پەیدا کردووە، یا گەر ڕووداوەکە چوار کارەکتەری بەس بووایە دەو پانزەیان بۆ دادەتاشی، تا بینەر -بڵێن بە خوا نووسەرێکی بە توانایە، کەچی لەو لاشەوە،لە هۆڵدا بێزارەو، ئەوەی شایانی باسیشە کارەکتەری دووەم لە شانۆیی جیهانیدا زۆر گرنگە ؛ بەلام لە هەندێ درامای کوردیدا فەرامۆش کراوە، گەر هەبوویێش، یانەگەدا یا کوڕە میر بووەو، یەکەمیان گەمژەڵەو دووەمیان ژیر، گەر میرێکیش سەلبی بووبێت، باوكو باپیرانی ناندەرو خێرخوازنو دەرەبەگایەتی لە درامای خۆماڵی دا تەختو دەسەلاتی پارێزراوەو دەبێ جووتیاریش لە ژێر نیرو کۆیەران بێت.

کورد زمانێکی دەوڵەمەندی هەیەو. زمانە ئەدەبی یە یەكگرتووەکەشی لە هەولدایەو. شێوازەکانیش لەیەکتر زۆر نزیکنو. دراماش بەگشت جۆرەکانی یەوە بە ژیانی جەماوەری بینەرانەوە بەندە. جا دراما نووس دەتوانێ دەورێکی سەرەکی لە گەشەپێدانی بوونی زمانی ئەدەبی ی یەكگرتووی کورد بگێڕێ، گەرهاتوو لە بازنەی ناوچە بازی دەرچێو. بەم کارەش مەجالی درامای کورد گەشە دەکاتو ماوەی زمانی شانۆییش بەرینو فراوانەو. بزوتنەوەو نواندنو پیشاندان بە گشت هۆیەکانی خزمەتی ووتووێژ – Dialogue – دەکەن. لە گشت شێوازەکانیداو. لەم بوارەشدا پێویستە ووشەو ڕستەکانی ووتووێژی دراما پڕ جوولەو دیمەنی حاڵەتەکانی دراماییو کردە لە باوەش بگرنو زۆریش خزمەتی ناساندنو ڕەفتاری کارەکتەران بکەنو مۆرکی دەنگیو مۆسیقایی خۆیان هەبێتو، بینەر ڕابهێنێو یەکەی زەمانو شوێنو کردە بپارێزنو ئەرکی کۆمەلایەتی ی خۆیان جێبەجێ بکەنو، سوود بەخش بنو لە گیروگرفتەکانی خۆیان بدوێنو بەرەنگاریان بنو یارمەتی ی دەربڕینی کارەکتەر بدەنو، بە پێی یاسای دراما حسێب بۆ ماوەی دەربڕینی ووشەو ڕستەو کردە دەکرێو قسەی زل زلو، بێ پەرواو، هێاگیری ناساغ. زمانی شانۆیی پیس دەکاو هەر دیالۆگیش بە دراما ناشێو زۆر بلێ بێ کارەکتەر سەری بینەر دەئێشێنێو لە کەم دووش ناگات..

دەبارەی کۆرسو چیرۆکڤان، یا حیکایەتخوان چەند ڕایەکی سەیر لە ئارادانو، وا دەزانن مۆرکی خۆماڵی یا دراما نووسین، تەنیا بە داستانو کۆنە چیرۆك هێنانە سەر کاغەزو، هەر داتاشینی دیالۆگو، کۆرسو، چیرۆکڤانو، دیوەخان ڕێك خستنو جلو بەرگی خۆماڵی لەبەرکردنە، بۆیە لە هەندێ درامادا کاروکردە دراماییەکان دەخرێنە پاڵ حیکایەتخوانو ڕۆڵێکی لە ڕادە بەدەری دوور لە ئەندازیارییو نواندنی دەبێ، جا لەم سووچو ئەو سووچی شانۆو لە هۆڵدا ئەوەی پێویستە بنوێنرێ هەر وەك قوتابی یەك دەیگێڕێتەوەو، بینەرانیش هیچ شتی ئەوتۆ نابینن!! ماوە ماوەش کارەکتەران دێنو خەریکی «فلان بانگ بکەو فلان بەری بکەو، بەخێر هاتیو بەخێر نەهاتی» دەبنو، یا بۆ چەپڵە دزین دوو سێ قسەی گەورە دەکەن، گەرچی لەگەڵ چۆنێتی کەسایەتی یان ناگونجێو، هەر وا بە خۆڕایی لە دەوری یەکتر دەخوولێنەوەو، سەیرترین دیاردەی بێ توانایی سستی ی جوولانەوەو خۆ بەزەوی دادانو یەکترڕاوانو هاتو هاوارە، بە ناوی ململانێو گرێ – Complex – ئەگەرچی گرێ لە شێوەدا بەزۆر جۆر خۆی دەنوێنێو لە پێکهاتنیشدا چەند چەشنە، گرێی سەرەکیو ناسەرەکیو دیارو نادیارو گرێی تایبەت بە تاکە کەسی کارەکتەرو گرێی گشتی کە واقیعی دراماکە دەگرێتەوەو، هەموانیش بە گوێرەی تایبەتی یەکانی خۆیان لە شێوەدا دەناسێندرێنو بەیەکتر بەندنو لەکتو پڕیشدا سەرهەڵنادەنو سەر بە باری بنچینەنو، زەمینەیان گرفتی باری گشتی ی درامایەو. بە چەند دۆخ تێدەپەڕن (سەرهەڵدەدەن + ئالۆزدەبن + دەتەقنەوە)و. لە هەمان کاتدا هۆو سەرئەنجامی یەکترنو بە پاشو پێشتری خۆیان دەبەسرێنەوەو کارێکی نوێی نەزانراوو چاوەڕێ نەکراو دێنێتە کایەوەو لە گرێ دانیشدا گرێی

ـەسەن کوێرو زگ لەدەر نابێ، چونکە ناسکترین مەودای ئارەزووی بزووتنەوەی ملانی – Conflict –ی لە پاڵدایەو هەڵویستو هەناسە وەرگرتنو هەناسە ـەوەیەو هەوڵی گۆڕانو گۆڕانکاری دەداو، ململانێو گرێی بزوتنەوەی دراما ـەگدانەوەی واقیعی درامای بزوتنەوەیە، بۆیە پاكبوونەوە –Catharsis–ی ئەرستۆتالیزمی هەوڵێکی نابەجێیەو بیرکردنەوەی بینەرو تەئسیری پیشاندانو باوەرو ـوی بینەرو پەیوەندی‌یەکانی دادەوەشێنیو دەکەوێتە گێژەنەی سۆزو عاتیفەو زاخی ـوودن – Action – لە یاد دەکات..

لێرەدا هەر بۆنموونە چەند جۆرە گرێ دەخەینەروو:–

مەمۆی ساڵی ١٩١٩و خێزانی چاورەش داخوازی‌یە پیرۆزەکانی لە مەسەلەی ئەنەستیندا دەنوێنێو «رسولو مراد» لە شانۆیی‌یە رامیاریو فێرکردە ئاسایی‌یەکەی حمد حمدی صاحبقران بە ناوی (محاورەی ئیقتصادی) لە بیستەکاندا پلانێکی رامیاری بۆ بازاری کورد دەکێشێو، سەرکەوتنی شێرۆو نازەنین لە دڵداریو پەیمان پەروەریدا، گۆڕانکاری بوو، بە هانا هاتنی لاوی کوردو برادەرەکانی بۆ قیژەی –پیرۆز – ی کچی کوردستان گۆڕانو بریارێکی مەزن بوو، کە «فیکرەت» یش لە – تەنەکە – دا گۆڕاو گۆی بردەوە با «توفیق بەگ» هەر تەنەکە لێداو، ئەوەی تۆفیق بەگ کردی باری بنچینەی سەخترکرد، بەری‌کەوتنی فیکرەت کەبووە فیکرەت بە هۆی جیهانی داپیرە گەورەو (جمال)ە کوێرو شخاتەکەی محاورەی ئیقتصادی ئەمە گرێبوو، ئەوەی لە «گوندەکەم بەجێ ناهێڵم»دا رووی‌دا ئەوە رووی‌دا گەڕانەوەی «رزگار» گرێبوو، باری تراژیدیانەی حەمبالەکان گرێی سەرەکی‌ی رەفتاری بزرگانو لەشکریو خانزادێکی‌تر بوو یا لە «راپۆرت»دا هەر جمال‌عرفان دەیزانی بە خۆرایی صوفی ماندوو دەکرێو باوكو دایکی لاسو، لاسو بینەران نەیاندەزانی دەرویش دەرەبەگێکی خرفاوە بە دوای جوانێکی لە تەمەن کچی خۆیدا کەوتووەو، هەر خانزادیکی‌تریش بە تاقی‌گەری‌یەکەیو ئەنجامەکەی دەزانی، تەنیا سێویش لەسەر شانۆدا وا تێ‌دەگەیشت محمد کوژراوەو، بینەرانو محمد نەیاندەزانی دایکی سێوی کاتی خۆی حەزی لە باوکی محمد کردووەو بۆیەش حەز دەکات سێوی بۆ محمد بێ، کەچی «مام حەمکۆ» ئەمەی ئاشکراکرد، ئەم حاڵەتو بۆچوونانەی گرێ لە چەند درامای کوردی‌دا زیرەکنو، بەڵگەی هەبوونی توانای دراماییی نووسەرەکانیانە، دەتوانن زیاتر خزمەتی درامای هاوچەرخی کوردی بکەنو نرکە نرکی شانۆی کوردیش ناڵەی ئاواتێکە لە دوو ئاستدا یەکەمیان پێویستی بە درامای کوردی‌یە، تا ناسنامەو ئارەزووی مێژوویی بنوێنێ..

دووەمیان:–

سوود وەرگرتنێکی بەرپرسیارە لەو دەقە جیهانی‌یانەی کە مرۆڤ لە ئاستی کۆمەڵدا دانامالنو بەرپرسیاریی کۆمەڵیش لە ئاستی مرۆڤ پێ‌شێل ناکەنو، تاك لە بوونە کۆمەڵایەتی‌یەکەیدایەو، هەڵی نادێرن، لە پەنای رەخنەو سلبیات خستنەروو. کە

شێوازی گومان لێ‌کراوی رەچەڵەك چاخگیریی ئەلکسەندەر دۆماسو ئوفینباخو مایربیرو فلوبیرو دوو جیکوری براو سکریبو ئەمیل زۆلاو ئەپسنو ستنبردجو ئەندریە ئەنتوانو شاگردەکانی لە ئەوروپاداو میترلینگو یوجین ئۆنیل‌بوو، خزمەتی سلبیاتو سووانلنی رەخنەی پێ‌دەکرا بە ناوی درامای نوێو دروشمی شانۆیی چنین توونلو بەند کە باس‌کردنی لێرەدا بە پێویست دەزانم..

**شانۆیی چنین توونلو بەند**

•

شانۆیی چنین توونلو بەندی شێوە شێواوی ناوەرۆك هەلبزرکاوی بینا لەنگ بە هەوڵی ووشکە ئەکادیمیەتی سکریبو دیماو بۆنسارو ئوجیەو لابیشو ساردۆو سارسی لە پاش شۆرشی ١٨٤٨و ١٨٧١ لە فەرەنسادا هاتەکایەوە[٢٠]و، دروشمێکی سەرزاری بۆرژوای ناوەنلو بچووك بوو، پاسەوانی‌ی کەسێتی‌ی رۆشنبیریی سەرمایەداریان پێ‌دەکرد دژ بە درامای میللیو واقیعیو بەرامبەر بە هەر تەوژمێکی نوێی پێشکەوتنخواز دەوەستانو بەربگای دەستگاکانی سەرمایەداریو بە ناوی بەربەرەکانی‌کردنی کلاسیو جیلی نوێو نوێخوازیو جەنگی‌نەوەکان ئەرکی پاراستنی باری بنچینەی سەرمایەداریان لا زۆر پیرۆز بووو، بە لینگاو قووچی سەیری‌واقیعیان‌ دەکردو یەکەی گشتی‌ی مەسەلەکانیان دادەوەشاندو بە زۆرە ملێ یەکەکانی پێکهێنەریان – Components – لە کارو کاردانەوەی پەیوەندی‌یەکانی‌دا دادەمرکاندو بە هۆی (خوداوەند لە ئامێرەوە)و رێکەوتو خۆم خۆییو تاقی‌گەری‌یە نائاسایی‌یەکانو نائەزرانەیی Antirationalism – لە واقیعو دەوروبەر دەردەچوونو جیاوازیی نێوان چۆنێتی تەلەفوزکردنی ووشەو شەرەجوێنو یەکتر نەگرتنەوەی وەڵامو پرسیارو، ووت‌ووێژیان بەگرێو ململانێ دادەناو هانی ناژباریو رقو کینەی یاخی بوونی خوودییو ململانێی دژ بە مرۆڤایەتی‌ی کۆمەڵو، خۆتاوانبارکردنیان دەدا هەروەك مامۆستا (یانکی)ی غۆریلاو (قرال جۆنز)ی یوجین ئۆنێل..

چاخگیرەکان داوای درامای بێ‌گرێو ململانێ یان کرد یا نەبوونی جێگەو زەمان ئەگەرچی شانۆیی هەر بەخۆی گرێو ململانێ‌یەو بە هاتنەکایەوەی دراماش جێگەوزەمەنی بۆ دەبێ؛ بەڵام مەبەستیان لەو دروشمە لە واقیع خۆلادان بوو، بە ئاڵۆزکردنی دەروونی کارەکتەرانو سووپەرمان تاشینو بەزین بەرامبەر بە تەکنۆلۆژیا کە دەست‌کردی ئادەمیزادە بەمەش لەپلەی ئادەمیزادی ئاسایی‌یان کەم دەکردەوەو بە زنجیرەیەك لە رووداوی ناکاو بە هۆی فێڵەکانی تەکنیك بینەرانیان لە خشتە دەبردو تووشی سەرسوورمانیان دەکردنو بە قسەی هەلەقو بەلەق ژنی خوودیو عاتیفەیان دەلەراندنو، یا بە پەنابردنە بەر کارتی‌کەرە هونەری‌یەکانی سەر شانۆ رووداو ئاڵۆزتر دەکرا، تا لایەنە لاوازو پووچەڵەکانی بشاردرێتەوەو گرێ لێ‌سەرو بەرەکانیشیان لەپڕ بە (خوداوەند لە ئامێرەوە) دەبەسراوو، دەکرایەوەو، هەمووشتێكو چارەسەریشی بەدووا دەخراوو، بینەران هەر چاوەرێ دەبوونو، کارە نارەواکان رێگای بۆ خۆش‌دەکراو، گەر بینەران بیانزانیبوایە، یا نەیانزانیبوایە چی روودەدات، یا

رووادات، گرنگ نەبوو، گرنگی هەر ئەوەبوو، بەبێ هۆو لە ناکاویدا کارەکان روو بەرووی بینەران دەبوونەوەو، نەیاندەهێشت بیر لە شتێ بکەنەوەو، لەکتو پریشدا پەردە بە زووترین کات دادەدرایەوەو باری بنچینەش دەپارێزرا..

لە پاش یەکەمین جەنگی جیهانیو شۆرشی ئۆکتۆبەر بەتایبەتی پاش دووەمین جەنگی جیهانی یەکێتیە زۆر پیرۆزەکەی چاخگیری تەوەرێکی برایەتیی رێك‌خستو، دژ دراما – Anti Dram –ی داهێنا دژی بوونو، گەشەکردنی ریالیزمیو درامای سوشیالیستیو، پێشکەوتنخواز، کە جەوهەرەکەی گۆرانو گۆرانکاریی کۆمەڵو سەرفرازیی ئادەمیزدەو لەبەر رۆشنایی ئەم فەلسەفەیەشدا سەیری ئەدەبو، هونەرو، زاراوەکانیان دەکەن، جا بۆ ئەوەی چاخگیری بتوانێ واقیعی دراما لە ئەوروپاو جیهاندا بشێوێنێو خۆماڵیی شانۆی گەلو نەتەوەکان بگۆرێ، درامای ناتورالیزمیو خزرینە ساواییانەکەی کیرکجاردو ئەپسینزمیو هێماگیری ناساغو شانۆ زۆر سەربەستەکەی ئەندریە ئەنتوانو قوتابخانەکانی لە ئەوروپاداو فروێدیزمیو تەعبیریەتو دادایزمیو سوریالیزمیو ووجودی پێکەوە جۆرەها بەرگی رەنگاو رەنگیان پۆشیو بە ناوی ئەزموونگەریی بەردەوام شێوەکارییان پەیرەو دەکردو لە جەوهەریشدا پاسەوانیو، پاراستنی کەسایەتیی رۆشنبیریی سەرمایەداریان لا هەرە پیرۆزترین ئەرك بوو، وەك (شانۆی رەمزیو بێهوودەو ووجوودیو فوتوریزمیو پێشەنگیو شانۆی ستێزو پەنهانیو ئەرستۆتالیزمیی کلاسی... هتد.

سەرەرای ئەمەش پێوستە هونەرمەندو نووسەرانی کورد لەم جۆرە بەرهەمانە سڵ نەکەنەوەو بە چاوێکی رەخنەیی سەیریان بکەنو سوود لە لایەنە هونەرییەکانیان وەربگرن..

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

١ – هەندێ سەرچاوە بە ساکاری باسی ئاهەنگی مزگەوتو میهرەجانەکانی بەهارانیان کردووە، گوایەمیهرەجانەکانی شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩١٠و ١٩١٢ پەیدابووە. ئەگەرچی باسەکانیان هەر ساڵی ١٩٢٦و ١٩٢٧ی گرتۆتەوەو ئاهەنگو میهرەجانەکانی شاری سلێمانیو ناوچەی هەورامانو موکریانو هەولێرو (دیاربکر بەر لە ساڵی ١٩٢٤) هەر هەبووەو. لە چاپیکەوتنێکی تایبەتیدا مێژوو نووس أحمد خواجەو مامۆستا شاکر فتاح فەرموویان: – لە سەردەمی بابانەکانو شیخ محمودیشدا میهرەجانو ئاهەنگ لە مزگەتو بەهاراندا رێك دەخراو بەڕێز شاکر فتاح فەرمووی :- لە نامێلکەیەکمدا باسی میهرەجانی ساڵی ١٩٢٧ کراوەو وێنەیەکی میهرەجانەکەشم بلاوکردۆتەوە ئەوەی راستی بێت پرسەی «شیخ سعید»ی نەمر لەسلێمانیدا بووە هۆی سستبوونی ئاهەنگ گێرانو کپ بوونی گرامافۆنی چایخانەو بەزمو رەزمو حیکایەتخوانی چایخانەی خانەکان. بەلام لە پاش پرسەدا هەروەك جاران ئاهەنگو میهرەجان سازدەکرا. (مێجەر سۆن) یش لەکتێبەکەیدا ئەم شتەی دەستنیشانکردووەو. بنەماڵەی نەمر شێخ محمود لە کۆنی کۆنەوە هانی درامای مزگەوتەکانیان دەدا کاتی ئیجازەدانە فەقییەکانو پاڵپشتی میهرەجانەکانی بەهارانیش بوونو. شیخ محمودی نەمر خۆی سەرۆکی تاقی گەرەکی خۆیان دەبوو لە یارییەکانی بەهارانو سوار سوارێنیو شەرە خەنجەر لە «تووی مەلیك»داو هەموو ساڵێکیش بریاری بەستنی میهرەجانی دەداو، نەدەبوایەکەسیش فەرمانی پادشا بشکێنێو بەخۆشی لە گەڵ خەڵك کەکە بە داماوی بەرامبەر بە کارەکتەری پادشا دەوەستاو لێی وورد دەبووەوە، بەلام کە ئینگلیزەکان «سلێمانی» یان داگیرکرد، بە هەنجەتی پووچەڵو بیانوو نەك لە سلێمانی دا بەڵکو لەگشت شارەکانی کوردەواریدا نەیاندەویست پادشا لە میهرەجانو مزگەوتەکاندا بنوێنرێو لە دوورەوە بە سواری ئەسپ سەیری میهرەجانەکانیان دەکردو دەترسانو دەیانزانی درامای پادشا جەوهەرێکی بە تینی هەیەو لەبەرچی پیشان دەدرێ، هەرچەندە دووبارەکردنەوەی درامایەکی واقیعیی زۆر کۆنە لە مێژووی کورددا و چیرۆکێکی لاساییکراوەیەو لە ئەنجامدا تێك دەچوو، لە شێوەیەکی رەسمیو واقیعێکی راستەقینە پێشکەش نەدەکرا، هەروەك شانۆییەکی ئاسایی بەکارو ناساندنو لاساییکردن دەنوێنراو گۆرانی لێ بەدیدەکرا، تەنیا لە نێوان ساڵی ١٩٢٧و ١٩٣٠دا. لە «شیخ فرخ»ی شاری قەلادزیدا (بکر أمین مصطفى قادر یاسین قۆزە قصاب) بوو بە شاو حاجی صادق حاجی مامەو حاجی فەقێ خدرو سید اسماعیلو سلیم مهند بوون بە وەزیرو بارەگای پاشایان بۆ ماوەی چل (٤٠) رۆژ تێك نەداو بەتەواوی فەرمانرەواییان گێراو خەڵکەکەش بریاری پادشایان جێبەجێ دەکردو، لە دواییدا بە هەرەشەو بەزۆری بارەگای (مام بکر قصاب) تێك درا، هەروەها شانۆی چایخانەی ئیسرابادیو مەیدان لە خانەقینو قەسری شیریندا. لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە هۆی جعفر لەکلە یا جعفر لەكو برادەرەکانی کەهەندێ سەرچاوەی هونەری جموجۆڵی ئەو هونەرمەندە کوردانە بە سەرەتای شانۆ لەعیراقدا دادەنێن بەردەوام بوو..

٢ – محمد تیمور – المسرح الكرديو مساره التأريخي – جريدة العراق ٢٨ / ٨ / ١٩٨٠
٣ –ماسك = رەنگ = سارو = دەمامك =
١ – احمد تیمور پاشا – التصوير عند العرب
٢ – محمد غنيمي هلال – الأدب المقارن
٣ – محمد تیمور – نەورۆزو دراماو شانۆ – مجلة الحكم الذاتي العدد ١/١٩٨٥

٤ – لە چەند چاوپێکەوتنێکی: – مامۆستای نەمر ناصح حیدریو، حلمی نجارو یاسین ئاشەوانو یاسین حلاقو مصطفى قاوەچی بۆمان بەدەرکەوت (شەکەرەوکۆچەرە) ئامێری موسیقاشیان هەبووەو، دوو جۆرە ماسکیان بەکارهێناوە، جۆری یەکەمیان تەواو رووی ئەکتەرەکانی دادەپۆشیو ئەوی دووەمیان لە لووتەوە تا سەرووی نێوچەوانو خوشکێکی بەرێزی ماڵی بەرێز مصطفى قاوەچی لە ساڵی ١٩٨٢ دا فەرمووی: گەر دەمزانی رۆژێ‌یەکێ بە دوواییی ئام لاستیکەی دەم وچاو دەگەرێ چەند دانەیەکیان بۆ ئەم مەبەستە دەپاراست کە تا ئەم دووای یەش لە دەس منداڵاندا بووو یاری یان پێ دەکردو فەوتاندیان)
٥ – دیناوەند = دەماوەند = ذماوند =زەماوەند
واتای :–مەڵبەندی ئاینو دایکۆو ئاواییو پەرستنو شوێنی تیرەو هۆزو میهرەجانو ئاهەنگ دەداتەوە.

٦ – بووکە بە بارانە: – بووکەبە پیتوفەرە. دایکۆ لە بەر بارانە، یا بووکە وا بە بووك دەچێت. چونکە ئاو لە کوردەواریدا بە توخمێکی نێرینە ناسراوەو «بووکە» لە کۆندا «دایکۆ» بووە یا دیا یا دایەو. «کۆسەبەبە» ش مانای باوکی کۆز، یا باوکی هۆز، یا باوکە بەران، یا باوکی هەمو خەڵك یا باوکی هەردەم لاو دەداتەوە. هەروەك :– باکۆس یا باخۆسو، لە لای فینیقییەکان بە کۆبابا دەناسراو باسێکی تایبەتیان دەربارەی «دیاناسیس» لە چەند شوێنێکی کوردستاندا ئامادەکردووە هەوڵی بلاوکردنەوەی دەدەین.

٠ - محمد تیمور - (یورپیدس و شانۆ له کوردستاندا پیش زایین) باسی کۆڕێك بوو له ...ی ١٤ - ١٠ - ١٩٨٥ له هۆڵی رۆشنبیری جەماوەر ، دە(بارەی پیشاندانی ...)ی یورپیدس لەکوردستانو بوونی شانۆی (دیوسکرایدز)له بابل و ...ی میتانی یەکانو سەیری (دراسات کردیه في بلاد سوبارتو) ی دکتور جمال ... بکه لاپەرە ٤٨و ٤٩

- مهیار الدیلمی - دیوان مهیار الدیلمی - في جزئین

• - محمد ملاکریم - دیوانی خانای قوبادی - (شیرین و خوسرەو) و
عبد الرقیب یوسف الدولة الدوستكیة
.. - مرتن اسلن تشریح الدراما

.. - له چاوپێکەوتنێکی مامۆستا محمد امین عوسمان له سالّی ١٩٨٠دا که له ...بوو فەرمووی (لەپاش شۆرشی چواردەی تەمموزی سالّی ١٩٥٨ له بەغدا بووم ، خۆمو چەند برادەرێك گردبوونەوەیەکی رۆشنبیریمان پێك هێنابوو ، دوو درامای تەله‌ ...م نووسی ، وا بزانم یەکێکیان به ناوی (سەرکەوتنی جووتیار)و ئەوی تریان ...جووتیارو دەرەبەگ) بووو ، هونەرمەند خلیل شوقی هەر دووکیانی یەك لەدووای یەك ...ە سالّی ١٩٦٠و ١٩٦١ بۆ تەلەفزیونی بەغدا دەریهێناو ، خۆمو نەسرین شێروانو چەند هونەرمەندێکی کورد بەشداریمان تێدا کرد ..

١٢ - جلادت عالی بدرخان - شانۆگەرێی - هڤند - له گۆڤاری «هاوار»ی ژمارە (٢٠) بیستی رۆژی دووشەممە ٨ هەشتی مانگی ئایاری سالّی ٣٣ بلاوکراوەتەوەو ، ووشەی «تماشا» له جیاتی شانۆیی بەکارهاتووەو ، ئامۆژگاری یەکان له نێوان دوو کەوانەدا دیاری کروانو له پێشەکیدا زیرەکانه پێناسەکراوەو مەودای کۆمەلاّیەتی ی کارەکتەران ناسێندراوەو هەروەکو خۆی دەینووسینەوە .

هڤند - تماشا (١) پردە - و١٠دە کارەکتەری سەرەکی ی هەیە - ١ - سرور بگ = ژتورنین سرحدان ، ٢ - لوند = سرکی عشیرکی ، ٣ - خورشید اغا = سرکی عشیرکی ٤ - پزیشك = پس ئاغامادنی ٥ - گرگین = پس اغایك ٦ - فەلەمیز = برای وی ، ٧ - قشم = دەستگرتیا گرتین ، ٨ - منیژە = دەستگرتیا فەلەمیز ، ٩ - قباد = خلامی سروربگی ، ١٠ - هڤند = سیویکی دوانزدە سالیو کۆتایی حەڤدەمین چهانوکی هڤند به (مارشا سگمانان) دی که چواردە دێرەو دراماکەش بەگشتی دۆخێکی تراژیدیی و هەستی نەتەوایەتی ی لی زالّەو ، یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هاوار)یش له مانگی ئایاری سالّی ١٩٣٢دا دەرچووەو ، دەربارەی (قەلاّی دمدم)ی سالّی ١٩٣٨ سەیری باسێکی دکتور معروف خەزنەدار بکه بەناونیشانی (معركة دمدم في الفلكلور الكردي) له گۆڤاری (التراث الشعبي)ی مانگی ئایاری سالّی ١٩٧٠دا بلاّوکراوەتەوە ..

١٣ - ابو بکر هەوری - دلداری و پەیمان پەروەری - لەسالّی ١٩٣٣دا نووسراوەو له شاری سلێمانیدا نوێنراوەو دوو جاریش له سالّی ١٩٤٣و ١٩٧١ لەچاپ دراوەو له سالّی ١٩٤٣دا که نەمر محمد محمود قدسی له رەواندووز ئەفسەری تجنید بووە ، دەریهێناوەو براکەی دەوری شێرۆی دیوە ..

١٤ - محمد تیمور - دە ربارەی دراماو رەخنه - کاروان ژمارە ٤١ بەداخەوە تائێستا نووسەری درامای «ئینسان ئەوەی ئەچینێ ئەوە ئەدووریتەوە»و (دایکێکی جاهیل) نەزانراوە.

١٥ - المر رایس - المسرح الحي - ص ٢٢ - ٢٣

١٦ - محمد تیمور نقد مسرحیة محمدو سێوی - جریدة العراق - ٢٤ - ٨ - ١٩٨١.

١٧ - هەندێ سەرچاوە ئەو گاڵتەجاری یەی که له نووسینی نەمر طاهر صادق بوو به (نیرۆن)ی محمد لطفي جمعەی میسری تێگەیشتووە چونکه پێکەوە له ١٥ / ١٠ ١٩٣١ دا له رەواندووز پێشکەش کراون، ئەو دوو وێنەیەش : یەکێکیان که مێژوو نووسی نەمر حزنی موکریانی ی تێدا دیارە له مامۆستا طاهر صادق مان وەرگرتووە . بەلاّم وێنەی دووەمی (نیرۆن) له ئەندازیاری بەرێز عبد الوهاب حاجی حسن وەرگیراوە که برای (عیسی حاجی حسن)ەو بەر لەوەی ببێته پزیشك له رەواندووزدا مامۆستا بووەو بەشداری له نواندنی (نیرون) کردووە ، که هونەرمەند فؤاد رشید بکر دەریهێناوەو ئەکتەرەکانیش ئەمانه بوون : - حسام الدین شیخ یحیی ، فؤاد رشید بکر ، طاهر صادق ، عیسی حاجی حسن ، جواد رسول ناجی ، سید نظیف کۆیی ، یوسف نصرت ، نوری سید عزیز ، عزت حسین ، ابراهیم حاجی حسین ، محمد علی اغا ، عبد الوهاب محمد علی اغا ، نشاة شوکت ، ئەو منداڵانەی که له پێشەوەدا دیارن یەکێکیان شیخ سلیمان ناوێکەو ئەوی دووەمیان نشأة محمد صفوة که له شەستەکاندا بەڕێوەبەری پەروەردەو فێرکردن بوو له هەولێر.

١٨- مەلاگچکه عبدالله له دانیشتوانی شەقڵاوەیەو دەستی نووسینی هەبووەو ، بەگوێرەی توانا له مەیدانی شانۆدا دەورێکی هەبووە ، له پێکهێنانی تیپ و کۆمەڵەی هونەری و له سالّی ١٩٧٠- ١٩٧١دا شانۆیی «فاڵچی»ی نووسیوەو دەستخەتەکەی له لای من پارێزراوەو له پێشەکی یەکەیدا دەڵێت (چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی و ، ئەو کەسانه ئاشکرا ئەکات ، کەبه ناوی نوشتەو دووعاو دەرمان دروستکردن پارەو پول له کەسانی ساویلکه ئەروتێننەوە ، پەردە لەسەر ئەو جۆرە کەسانه لا ئەبات که به ناوی فاڵچی دەستی خەلّق ئەبرنو دزی ئەکەن). فاڵچی سێ پەردەیەو ، شەش کارەکتەری سەرەکی ی هەیە ، حاجی شیخ رەجەبی فاڵچی و کریم قەزازی دەوڵەمەندو خاوەن کوگاو رەعنا خانی خێزانی و زیادی کوری و شەمامی کچی و نازداری جیرانی ماڵی کریم قەزازو دەسته خوشکی رەعنا خان

١٩- الدکتور عدنان خالد عبدالله -النقد التطبیقي التحلیلي ص ٧٧

٢٠- ارنولد هاوزر -الفن و المجتمع عبر التأریخ -الجزء الثاني -ص ٣٣٩و ص ٣٤٠و ٣٤١و...

هونەر

لەئاسۆی هونەری جیهانیدا

# ریبێرا



نووسینی مێژوونووسی سۆڤیەتی: ت ث. کاپتێریڤا
وەرگێرانو ئامادەکردنی لە ڕووسی‌یەوە : محمد عارف

نیگارکێشی ئەسپانی مەزن: (خوو سێپیێ ریبێرا)، ١٥٩١ – ١٦٥٢، لە شاری خاتیڤ نزیك ڤالێنسی لە ئەسپانیادا لە دایك‌بووە. ریبێرا کە تەمەنی بوەتە بیست ساڵ، بەرەو ئیتالیا چووەو هەموو ژیانی خۆی لەوێ بەسەر بردوە.

هونەرمەندی لاو، لەسەرەتای ژیانیدا، بە دەست‌کورتیو هەژاری ژیاوە، هەر بەم جۆرەش گەشتی لە شارەکانی ئیتالیا کردوەو زۆر دڵسۆزانە هونەری نەمری ئەم وڵاتەی خوێندوە. ریبێرا زۆر ڕای لە نیگارەکانی (کاراڤاد چۆ) بووە. هونەرمەند لە ساڵی ١٦١٦دا لە شاری ناپۆلی جی‌نشین‌بووەو هەمو ژیانی لەم شارە بردوەتە سەر. لەو کاتەدا ئەسپانی‌یەکان حوکمی ناپولیان کردوە.

ریبێرا کارێکی تەواوی لە زۆربەی هونەرمەندانی ئیتالی هاوچەرخی خۆی کردوە.. تەنانەت کاری لە رابەری قوتابخانە هونەری‌یەکان، بە تایبەتی قوتابخانەی ئەکادیمی کردوە.

هونەری ریبیرا پایەو نرخێکی گەورەی بۆ ئەسپانیا هەبووە، پەیوەندی نزیك‌و بەهێزی هونەرمەند لەگەڵ ژیان‌و هونەری ئیتالیا، یارمەتی دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆك‌و ڕووخساری نیگارەکانی داوەو جۆرە هونەرێکی ئەوتۆی هێناوەتە کایەوە، کە بە داهێنانێکی ڕاستەقینەی دووبارە نەکراو ژماردراوە.

چوارچیوەی جموجۆڵی هونەرمەند، چوارچیوەیەکی مەزن‌و فراوان‌بوە... ریبێرا تەنیا ڕووداوی ئاینیی ڕەسم نەکردوە، بەڵکو سەرکەوتوانە چارەسەری ناوەڕۆکی میفۆلۆژیاو پۆرترێت‌و گراڤیوری کردوەو یەکێك بوە لە هونەرمەندە گەورەکانی هونەری گرافیکی ئیتالی سەدەی حەڤدەهەم.

بێجگە لەمە، ڕیبێرا هونەرمەندی دەربڕینی ڕووداوی دراماتیکی وئازاری مرۆڤ بوە. لە قوتابخانەی هونەری (بارۆککۆ)دا، دەربڕینی ئازاردانی مرۆڤ، بە تایبەتی مروڤە ئاینی‌یەکان، دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێش‌بوە. جۆری چارەسەرکردنی ڕووداوی تراژیدیو ئازاری مرۆڤ لە لایەن ریبیراوە لەبەر نەژادیو ڕەسەنی دەربڕینیان، لە چوارچیوەی ئایینی فراوانتربووەو مۆرکێکی مرۆڤایەتی قوولی هەڵگرتووەو بەم شێوەیە هونەرمەند داهێنەرانە شۆرە سواری زەمانی خۆی بووە لەو کاتەی زۆربەی هونەرمەنداتی‌تر هەمان ڕووداوو ناوەڕۆکیان بە شێوەی پۆزی شانۆیی‌و نواندن‌و فۆرمالیزمی دەربڕیوە. سەرکەوتنی هونەرمەند لەم بوارەدا لە سەرەتای قۆناغەکانی بەرهەمی دا دەستی پی‌کردوەو باشترین نموونەی قسەکەمان نیگاری: (ئازاردانی سیباستیان)ە... ئەم نیگارە سەرکەوتوەی کە ئێستا مووزەخانەی (ئەرمیتاژ)ی لنینگرادی ڕازاندوەتەوە.

تابلۆی (ئازاردانی ڤارفۆلۆمیا)، مووزەخانەی (پرادۆ – مەدرید). بەشێوەیەکی ڕۆن‌تر گیانی هونەریی‌و شێوازی هونەرمەندمان بۆ بەرچاو دەخات... دامەزراندنی هونەریی ئەم نیگارە، پایەی بەرزی هونەرمەندمان وەك هونەرمەندانی (دامەزراندنی هونەریی) بۆ ڕەچاو دەکات... لە ناوەندی نیگارەکە، ئازاردراو دروست‌کراوە. ستەمکارەکان بەنیازی هەڵواسینی دەیانەوی بەرزی بکەنەوەو بە هۆی کۆڵەگەیەك لە ئاسمان هەلیبواسن... جۆری دەربڕینی ئەندازەی لەشی ستەم لی‌کراو و چۆنیەتی دەربڕینی ئەناتۆمی واتە (تشریح)ی ماسولکەکانی.

بەکسە ـ بیری بینەر بەرەو بەکەر هێنی مۆدێل دەدەت. بەلە هونەرمەندی د ـهبە ـ زۆر لە سنووری مۆدێل دەرچووەو نیگ ـرەکەی بەرەو ئاسۆیەکی هونەـی فراوانتر بردوە، لێرەدا سیستیمی رەنگ‌و بەکەر هێنانی کەلەریتی وەستـ ـنە. زۆر لە ئاستی هونەریی نیگارەکەی بەرزکردوەتەوەو هەستێکی تەوزەوی‌تری بەخشیوەتە بینەران.

نیگارە میفۆلۆژی‌یەکانی هونەرمەند بە تووندی سەرنجی بینەر بۆ خۆیان ڕادەکێشن. بەشێکیان کراونەتە گرافیورو بە تەکنیکی گرافیکی و بە ووردەکاری‌یەکی سەرسوڕێنەر دروستکراون، لێرەدا ریبێرا توانیویەتی جیهانی مەتریالی دەربڕێ، ئەم شتەی پێچەوانەی نیگارە ئایینی‌یەکانە، کە بەو پەری هەستی تەنك‌و ئاسمانی‌و پڕ سۆز دروستکراون. بەرچاوترین نیگاری میفۆلۆژی لەم زنجیرەیەدا تابلۆی: (ئەپەلۆن‌و مارس)ە، (بروکسل، مووزەخانەی هونەرە جوانەکان).

ریبێرا سوودی لە چیروکی فۆلکلۆری‌و میفۆلۆژی وەرگرتوەو بەشێکیانی کردوەتە نیگار، جوانترین تابلۆی ئەم زنجیرەیە نیگاری (ئینێسا)یە کە داستانی کیژۆلەی لاوو جوان‌و نازدارێك دەگێرێتەوە کە بە رووتی فڕێدراوەتە چۆل‌و بیابانێك. دامەزراندنی هونەریی ئەم نیگارە لەسەر بنکەی (جولانەوەی ناوەوە، کە لە سووچێك دەست پێ‌دەکا و بۆسووچی بەرامبەری دەڕوا)، دامەزراوە، (بە پێچەوانەی دامەزراندنی هونەریی کە لە ڕێنیسانی‌دا باو بووە، واتە دامەزراندنی سێ گۆشە).

ریبێرا ئەم جۆرە دامەزراندنەی زۆر خۆش‌ویستوەو بە ئارەزویەکی تایبەتی‌یەوە لە چەند نیگارێکی‌دا بەکاری هێناوە.

هونەرمەند دلسۆزانە هەولی داوە هونەری میللی بەرەو ئاسۆیەکی فراوان بەرزبکاتەوە. بە تایبەتی لە گۆڕەپانی پۆرترێت‌دا... خۆشەویستی هونەرمەند بۆ ئوبرەزی نەتەوایەتی پالی‌پێوەناوە کە مرۆڤە ئایینی‌کان بە شێوەی ئوبرەزی مرۆڤە هاودەمە چەوساوەو دەست بە ئەژنۆکان دەربڕێ. لێرەدا پێویستە ئەوە بچەسپێنین کە هونەرمەند سوودیکی زۆری لە مۆدێل وەرگرتوەو زۆر وەستایانە زانستی ئەناتۆمی (تشریح)و زانستی سەیر کردن (پەرسپەکتیڤ)ی بۆ مەبەستی هونەریی خۆی بەکار هێناوە (چەند هونەرمەندانە جەستەی پڕ لە دەمارو ماسولکەی هەژارو ئازار دراوەکانی لە ژێر جلك‌و بەرگی دڕاو پینە هەلوەشاوەکان رەسم کردوە) لەم بوارەدا پێویستە ناوی پۆرترێتی: (دیۆگێن)، وەك چارەسەرکردنێکی دەروونی ئەو مرۆڤە هۆشمەندەی، تەنگ‌و چەلەمەی ژیان بریسکی چاوەکانی کوژاندوەتەوە، بهێنین هونەرمەند لە نیگاری (مرۆڤێکی شەل)، وەستایانە نیشانەکانی: (پۆرترێت‌و ڕووداو)ی کۆکردوەتەو پالەوانی هونەرمەند لەم بەرهەمەدا مرۆڤیکە (بە بێ دەستکاری) لە کۆلان وەرگیراوە... لێرەدا پەیوەندی هونەری میللی‌و پێش‌کەش‌کردنی لە سەرینج‌و بناوانێکی ریالیزمی و بە جۆرێکی داهێنەرانە، بەرچاو دەکەوێ.

هونەرمەندی مەزن لە دوا نیگارەکانیدا رووی لە ڕەنگی گەش‌و کراوەو گەشبین‌و دیکۆری کردوە وەك نیگاری: (نیشان کردنی یکاتێرینا، مووزەخانەی میترۆ پۆلینان –نیویۆرك)، هەروها نیگاری: (کرنووش بردنی شوانەکان) کە بەشداری لە ڕازاندنەوەی مووزەخانەی لووڤری پاریس کردوە.

▽ ( بەشێکی پۆرترێتی دیۆگین )
١٦٣٧ مۆزەخانەی دریزدن



▽ ( مرۆڤێکی شەل ) ١٦٤٢
مۆزەخانەی لۆوڤەر • پاریس



▽
( بەشێکی نیگاری ئینێسا )



# ئیقاعو ژیان

ئەنوەر قەرەداغی



**جوانترین ووتە کە ئەم باسەمانی پیٚبکەینەوە... ووتەی زانای مەزن فیساغۆرسە کە دەڵیٚت. گەردوون ژماردنو ئاوازە. بەم دەست پیٚکردنە سەرەتامان دەخەینەروو دەست نیشانی مەبەستی باسەکەمانی لیٚوە دەکەین کە ئیقاع چی‌یەو چ رۆڵیٚك دەبینیٚت لە ژیانی مەردمداو لەو کارانەی کە دەستی دەداتیٚ...**

ژیانی مرۆڤو دەوروبەری، پرە لە جۆران ئیقاعی رەنگین.. لە ووردترین کاتەوە... بچووکترین پیٚکهاتنیٚکی ماددەوە... لەم گەردوونەدا... هەمووی لەسەر ئیقاع دەروات.

گەر سەیری دەوروبەری خۆمان بکەین سوورانەوەو جموجۆڵی ئەستیٚرەو مانگەکان، لە هەڵهاتنو ئاوابوونیان. هەروەها سەوزبوونی گیاو ووشك بوونی، گەورەبوونی درەختو چرۆ کردنیو گەڵا کردنیو گەڵاریٚزانیو ووشك بوونی لە وەرزی خۆیدا. یان مانەوەی هەر بە سەوزی...

هەروەها... گەر ووردبینەوە لە لیٚدانی دڵی مرۆڤ، هەناسەدانی، هەستو نەستی، هەڵسوکەوتی، نووستن، کارکردنی... هتد هەریەکە لەمانەو چەندینی‌تر کە لەم گەردوونەدایە لەسەر ئیقاعیٚکی تایبەت دەجوڵیٚنو دەگۆریٚن...

هەر لە میٚژەوە ئیقاع سەرنجی مرۆڤی راکیٚشاوەو وای لیٚکردووە کە بکەویٚتە بیرکردنەوەو تیٚروانین. میٚژوونوسەکان دەڵیٚن: «مۆسیقا لە ئیقاعەوە دەستی پیٚکردووە»، بیردۆز دوای بیردۆزی داریٚژاوەو سەلماندویەتی کە ریٚرەوی گەردوون هەمووی بە ئیقاعەوە بەندەو ژیانی مرۆڤیش بەشیٚکە لەو ئیقاعانە.

ئەم ژیانەی ئیٚمەی تیادایـن... ئەم گەردوونەی کە لە ئامیٚزیداینو سەروبنی دیاری نەکراوە، لە رژیٚمیٚکی هەندازو ریٚکوپیٚکدا خۆی دەنویٚنیٚت. لەو رۆژەوەی کە دروستکراوە... هەتا هەتایە هەرواش دەبیٚتو... هەرواش دەروات!!!!

سەبارەت بە کات، گەر ووردبینەوە...

سات بە دوای سات‌دا دیٚت لە رۆژیٚکدا..

شەوو رۆژ بە دوای یەکدا دیٚن...

هەفتە بە دوای هەفتە...

مانگ بەدوای مانگ...

وەرز بە دوای وەرز

هەر چەرخە گەردوونیٚك... هتد

ئەمانە هەمووی کاتو ئاوازیٚکن لە دروست بوونی ئەم جیهانە بیٚبەرینە کە هەتا ئیٚستا دوپات بوونەتەوەو لە مەولایش دوپات دەبنەوە!!!!

ئەندامەکانی لەشی ئادەمیزاد... وەك لیٚدانی دڵ، سووری خویٚن، هەناسەدان گەورەبوونی لە منداڵیەوە تا هەرەتەکانی ژیانیو تا مردن... هەمووی بەڵگەن ک ووردودرشتی گەردوونو ژیان هەمووی... ئیقاعن.

ئیقاع لە کردارو رەفتاری هەمیشەی مرۆڤداو لە بەرژەوەندی تایبەتیو گشتیو ژیان ئابووریدا سەر هەڵئەدات... چیٚژی خەڵك هەر تاوناتاویٚك بە جۆریٚك دەگۆریٚت. دمیٚ دڵی خۆشە... تەنگو خەمناکە... دەمیٚکیش ئاسایی‌یە. جۆری ژیانو ئەو شارستانیە تیا پەیدابووە، بە ئیقاع دروست بووەو گەرانەوەی بەدەستی ئیٚمە نیە، چونکە کاتیٚکە بەسەر چووە.

گەر بروانینە پیٚکهاتووەکانی مادە... پەیوەندیەکی یەکانگیری تیا بەدی دەکریٚتو رەوشتیٚکی ئیقاعانە خۆی پیٚکهیٚناوە. ئەمەیش لە رەفتاری ناووكو ووردیلەکانی ئەتۆمەو دیارە، هەروەها لەو شەپۆلە کارۆموگنەتانەی ماددەو خانە زیندووەکانو پەیوەندیان دەوروبەرەوە.

مرۆڤ کە لەم جیهانەدا دەژیو لەگەڵ سروشتیان دەست لە ملانی‌یەکن... ئەوەی دەوروبەریدا روودەدا لە ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، رۆشنبیری، رامیاری... هتد هەمو ئەم لایەنانەی رەنگدانەوەی لە دەروونو ناخی‌دا هەیە. هەست بە گەرمیو ساردی فیٚنکی، خۆشیو ناخۆشی، جوانیو ناشیرینی، تاڵیو شیرینی ژیان دەکات، هەست پیٚشکەوتوویی و دواکەوتوویی، شارستانیو ویٚرانی، ئازادیو چەوسانەوە دەکات.. ئەمانە هەمووی رەنگدانەوەیەکی سەرانسەری دەدات بە دەروونو ناوەرۆكو ناخی ئە مرۆڤە، کاردەکاتە سەر هەموو هەڵسوکەوتو جموجۆڵیٚکی. بیٚگومان ئەم کارتیٚکرد ئیقاعی دەروونو رواڵەکانی مرۆڤ دەگۆریٚت.

دەبینین... لە رۆژیٚکدا، بەیانی - نیوەرۆ - ئیوارە - شەوان هەریەکە لەم دەمانە مرۆڤ بە جۆریٚك هەڵسوکەوتی تیادا دەکات هەروەها جۆڵانی لە وەرزەکاندا.. دەبی هەر وەرزە جۆرە تامیٚکی هەیە سەبارەت بە چالاکی مرۆڤ، هەروەرزە دۆخیٚکی تایبە خۆی هەیە کە ساڵانە دووبارە دەبیٚتەوە. جموجۆڵی نەتەوەیەك... سەربەست بیٚت یا ژیٚردەست. یاخود ووڵاتیٚك پیشەسازی کاری سەرەکی بیٚت تیایدا لەگەڵ ووڵاتیٚکی تردا کشتوکاڵی کاری سەرەکی بیٚت هەریەکەیان جۆرە دوخیٚکی تایبەتیان هەیە لە چە بیرکردنەوەو ژیان گوزەرانیدا.

ئەم کردارە لە ناوەرۆکدا کاتو شویٚن دەبیات بەریٚوە کە لە سەر چەند یەکەیە

..وست بووەو چەندین جار بە ڕێکوپێکی یان بە ئاڵۆزی دەڕوتێن... چ بە هێمنیو ..وە. چ بە دیارو ئاشکرا.

ئەم چەشنە جووڵانەو ڕێکخستنی ژیانە.... بە ئیقاع دروست بووە.

کەواتە با بزانین ئیقاع چییە؟.

## ئیقاع چییە...؟

ئیقاع بە زمانە ئەوروپاییەکان پێی دەووترێت ڕیتم: Rhythm کە لە یۆنانییەوە ڕیتمۆس: Rhythmosوە وەرگیراوە، وەئەمیش لە Rheeinوە وەرگیراوە کە بە مانی (هەڵئەقوڵێ یان بە خوڕی دەڕوات) دێت.

لە زمانی عەرەبیدا دەشێت لە ووشەی (توقیع : Rhythmization) ەوە هاتبێت کە جۆرێکە لە ڕۆیشتن.

کورد... ووشەی ئیقاع بەکار دێنێت، وا تێدەگەم کە ووشەی (ڕەزم) چ لە ماناو چ لە دەنگدا نزیکە بە یۆنانیەکە.

لە کوردیدا دەڵێت: بەزمورەزم واتە بەزم بە مانای ئاوازو هەڵپەرکێو ئاهەنگ دێت، (ڕەزم)یش ئیقاعی ئەو بابەتانەیە. بەڕای من ڕەزم جوانترین ولەبارترین زاراوەیە بۆ ئیقاع، بەڵام ڕای زانایانی کورد زمان لە پێشترە بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم ووشەیە.

زۆر لە زانایانو فەیلەسوفان کە پێناسی ئیقاعیان کردووە وەك مانایەکی تایبەت بۆی چوون، ئیتر ئایا وەك (کات – زمان)یان (شوین – مکان).
کۆنترین پێناس بۆ ئیقاع فەیلەسوفە یۆنانیەکان دایانناوەو نزیکیان کردۆتەوە لە چەمکی جووڵە. پلاتۆ (ئیفلاتون) پێناسی ئیقاعی کردووە کە وەك بڵێیت هەر لە بنەڕەتدا جووڵەیە... دەڵێت: ئیقاع ڕێکخستنی جووڵەیە، هەروەها دەڵێت لە فڕینی باڵندە، لە لێدانی دەمارەکانی لەش... لە هەنگاوی هەڵپەڕین دا... لە بڕگەی قسەدا، دەتوانرێت ئیقاع بناسرێتەوە.

قەشە ئۆگەستین لە پێناساندنی ئیقاعدا دەڵێت: جوڵانەوەیەکی هونەری پاكو جوانە. دەروون ناسەکان لەسەدەی نوێدا ئیقاعیان گەڕانۆتەوە بۆ چاووگی جووڵان، دەروونناسی ئەڵەمانی فۆنت دەیگەڕێنێتەوە بۆ ڕۆیشتن، ڕیمان دەیگەڕێنێتەوە بۆ لێدانی دڵ، بوجیر دەیگەڕێنێتەوە بۆ جووڵەی لەش. زۆریتریش دەیگەڕێننەوە بۆ یاسای جووڵانی سروشت. لە لای فەیلەسوفی یۆنانی هێرکلیتس جووڵەو گۆڕین بە پێی کاتو شوێن بناغەیەکە بۆ تێگەیشتنی نهێنی گەردوونو ژیان... هیچ شتێك سرەوتی نیەو لەسەر بارێك نامێنێتەوە، ئیقاعیش بەدوایەك هاتنێکەو لە هەموو شتێکدا تەشەنە دەکات. ئەرەستۆ جووڵەی کردووە بە خاڵی دەستپێکردن بۆ لێکدانەوەو ڕاڤەی هەموو جیهانو دەروویەك بۆ تێگەیشتنی دیاردەکانی.

بەڵی... ئێستا تا ڕادەیەك ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە ئیقاع بە مانای جووڵەو گۆڕین دێت، بەڵام ئایا ئەم پێناس کردنە بەسە بۆ ئەوەی ئەم ووشە بە تەواوی مانای خۆی بدات بە دەستەوە؟ لەوەڵامدا دەڵێین نەخێر!!!!
چونکە جووڵە هێزێکی بزووتنەوەیە بۆ هەموو ئیقاعێك بەڵام تەنها مانایەکی تەواو دەرناخات چونکە مانای ئیقاع تەنها جووڵە نیە... واتە هەموو جووڵەیەك پێی ناووترێت ئیقاع گەر شیرازەو ڕێکوپێکیو جڵەوگیری لەگەڵدا نەبێتو چەند جارە نەبێتەوە لەکاتو شوێنێکی دیاریکراودا.
لەوانەیە ئەم گوازرەیە کە دەڵێت:

«جووڵەیەکی ڕێکوپێك بە دوایەکدا مانای تەواوی ئیقاعمان بۆ ڕوونبکاتەوە، چونکە سیفەتی ڕێکخستن کە دامانە پاڵ جووڵە بەتەواوی ئیقاع پێناس دەکات. لەم تێڕوانینەوە دەڵێین ئیقاع: ڕێکخستنێکە لە دابەشکردنی کاتیان شویندا، یان چەند کاتێکە بە پێی دابەشکردنی بەدوای‌یەکدا بە یەکەیەکی دیاریکراو، یان شوێنێکە یان ڕوویەکە بە پێی ڕووبەرێکی تایبەت دابەشکراو. هەموو کەس هەست بەکاتو بەردەوامی کات دەکات،ئەمەیش لەخۆیەوە بۆ دەوروبەری خۆی. ئەم هەستکردنە وەك لایەکی دەروونی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت. دەبینین کاتێ مرۆڤ دڵی تەنگ بێ ساتێکی بە چەندین سات لێ‌دەڕوات، کاتێکیش دڵخۆشو بەچوست بێت ڕۆژێکی لادەبێتە ماوەیەکی زۆر کەم. ئەمەیش لە خۆیدا ئیقاعێکی شاراوەیە بە پێی ئەو کاتەی بەسەریدا دەڕوات، ئایا بەخاوی یان بەخێرایی (وەك هەست دەکات). لێرەدا خاویو خێرایی ئەو ئیقاعە دێتە پێشەوە بۆ باسکردن کە پێی دەووترێت تێمپۆ واتە خێرایی ئیقاع.

ووتمان ئیقاع بریتی‌یە لە ڕێکخستنی کاتی جووڵەیان شوێن بە چەند یەکەیەك، کە واتە تێمپۆ دەست نیشانی خاویو خێرایی ئەو جووڵە ڕێکخراوەیان ئەو شوێنە ڕێکخراوە دەکات.
بۆ نموونە کاتێ چەند ژمارەیەکی وەك:
**١ – ٢ – ٣ – ٤ – ٥ – ٦ – ٧ – ٨ – ٩ – ١٠ دەژمێرین هەریەکە لەم ژمارانە وەك یەکە یەکی کاتی سەیر بکەینو بەدوای‌یەکدا بیانژمێرین... ئیقاعێك دروست دەکات، بەڵام ئەو ژماردنە لە چ خێراییەكدایە ئەوا تێمپۆ دەست نیشانی دەکات... دەڵێین تێمپۆی ئەو ژماردنە خێرایە یان خاوە یان مامناوەندیە. گەر ڕووبەرێك بکەینە چوار گۆشەی وورد یان درشتو بە تەنیشت‌یەکەوە دایانبنێین ئەوا زۆریو کەمی ئەو چوارگۆشانەی کەدادەنرێن باری چڕیو تەنکی پیشان دەدات.**

**سنوورێکی زۆر فراوان هەیە بۆ دەست نیشان کردنو ئیشارەت کردنی خێرایی. بۆ نموونە: پارچە مۆسیقایەك کە چەند تیپێکی هونەری لێی ئەدات... مەرجنیە کت‌ومت بەیەك خێرایی لێ‌ی بدەن، هەرچەندە**

**هەریەکەیان هەمان نۆتە دەخوێننەوە، بەڵام جۆری خێراییەکەی دەگۆڕێ. ئەم گۆڕینەیش کارناکاتە سەر ناوەڕۆکی ئەو پارچە مۆسیقایە چونکە هەریەکەیان تام و چێژێکی تایبەتی هەیە.**

**بۆ نموونە (بتهوفن)ی مەزن لە بەرهەمی سمفۆنیەی پێنجەمدا چەندین تیپی ئۆرکیسترالی لێیداوە، هەر کۆندەکتەرەی کە ڕابەری تیپە ئۆرکێسترایەکی کردووە کە ئەم بەرهەمەی لێداوە. جیاوازی لە لێکدانەوەو تێمپۆی ئەو ئاوازانەی تیا ئەبیسترێ و بەدی دەکرێت. دەگێڕنەوە کە هەمان مۆسیقاری بەناوبانگ سەربەستی یەکی زۆری داوە بە ئامێرژەنەکان بۆ لێدانی مۆسیقاکانی.**

**بۆ نموونە جارێکیان بە کچێکی پیانۆژەنی وتووە کە سۆناتەیەکی ئەوی لێداوە: هەرچەندە من بەو شێوازەی تۆ ئەو سۆناتەیە لێنادەم بەڵام تۆ هەر بەردەوام بە لەسەر شێوازی خۆت چونکە جوانی ژەنینەکەت لەوەی من کەمتر نیە).**

**خێرایی و خاوی و چەشن و جۆری ئیقاع لە جێگایەکی بچووکەوە بۆ هەموو جیهان دەگۆڕێت. بۆ نموونە: لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر، لە گەڕەکێکەوە بۆ گەڕەکێکی تر، لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو... وەهەروەها. لەم تێڕوانینەوە بە ئاسانی دەتوانین دەستنیشانی ئیقاعی نەتەوەیەك بۆ نەتەوەیەکی تر بکەین. دەبینین ئیقاعی هەندێ لایەنی ژیانی کوردەواری گورج و گۆڵترەو جیاوازترە لە هەندێ لایەنی ژیانی ناوچەی عەرەبی. هەروەها ئیقاعی ژیانی ئەڵەمانی سستترە لە فەرەنسایی، هەندێ لایەنی ژیانی ڕوژهەڵاتی جیاوازە لەگەڵ ئیقاعی هەندێ لایەنی ژیانی ڕۆژئاوایی... و هتد. ئەم ئیقاعانەیش کە باسیان دەکەین و هەمە جۆرە، بە دوو شێوە دەکەوێتەوە: -**

**١ - شێوەیەکی ئاشکراو دیارو هەستپێکراو - ئەم شێوە یەکەکانی بە ئاسانی هەستیان دەبزوێنێ و بە پیریەوە دەچین، وەك ئەو ئاوازانەی کە گوێیان لێدەبێت لە گۆرانیەك یان مۆسیقایەکی میللی، بە ئاسانی بە چەپڵە یان بە قاچ بەزەویدان. یان هەڵپەڕین یا بەهەر**
هۆیەکەوە بێت ... بە پیریەوە دەچین و سەرنجیان ڕادەکێشێت . یان چوارچێوەیەکی وێنە کە کورت و درێژی لاکانیان لێوە دیارە ... یاخود چوارکەس یان پتر لەسەر شانۆیەك دابەش بوون بە میانەیەکی ڕێك و پێك و گونجاو ... ئەمانە هەمووی ئیقاعێکی ئاشکران چ لە کات داو چ لە شوێن ، یەکەکانیان بە ئاسانی لێوە دیارە .

٢ - شێوەیەکی پەنهانی و شاراو - ئەم شێوەیان یەکەکانی وەك شێوەی پێشوو دیارو ئاشکرا نین و بەئاسانی هەستی پێناکەین ، بەڵکو لە ڕێگەی پێشکەشکردنی بەرهەمەکە پەیوەندی لەگەڵ دەروونی بینەر یان بیسەران هەیە ، کە پێویستە ئەو کەسانە ڕۆشنبیرییەکی ئەوتۆیان هەبێت تا بتوانن بە تەواوی لێی تێبگەن و بچنە ناوەڕۆکی یەوە ، ئەو کاتە هەست بە جوانی ئەو ئیقاعە نهێنیە دەکەن کە کەسێکی ئاسایی یان نەشارەزا هەستی پێ ناکات و لێی تێناگات وەك چۆن گوێیان لە موسیقایەکی سیمفۆنی یان (تصویری) دەبێت ، یان پەخشانێکی جوان ، تابلۆیەکی ڕازاو کە پڕە لە جۆرین ڕەنگ و هێڵی وا کە بە ئاسایی چاو لێی تێر نابێت و ناتوانین بە ئاسانی لە لایەنەکانی بکۆڵینەوە ... ئەمانە هەموو پڕن لە چەندین جۆر ئیقاعی ڕەنگین و جوان ، بەلام پتر بە نهێنی ئەو ئیقاعانە دەردەکەون کاتێ بینەر یان بیسەر لە ڕۆژنەیەکی ڕۆشنبیریەوە سەیری دەکات یان گوێی لێدەگرێت .

یان مرۆڤ کاتی هەست بەخۆشی یان ناخۆشی دەکات و .. یاخود چەندین بابەتی تر لەم لایەنانەوە .

کەواتە دەتوانین بڵێین ئیقاع بنکەیەکە پاڵی داوە بە دیاردەکانی ژیانەوەو بەرووداوە هەمیشەیی و سەرەکیەکانی سروشت دەژمێررێت ... هەر لێرەیشەوە دەڵێین ئیقاع چەند جووڵەیەکی بەکێشە واتە ڕێك و پێك و گونجاو بەرژنمێکی تایبەت دوبارە دەبێتەوە ... یان چەند ڕووداوێك یان لێدانێك و چەند خامۆشیەك یان وەستانێك بەدوای یەکدا دێن بەپێی کێشەیەکی تایبەت ... (تێمپۆ) یش خاوی و خێرایی ئەو جولانانە دەست نیشان دەکات .

ئیقاع ئەزمونگەریە کە ئادەمیزاد وەریدەگرێت کاتێ بەدوایەك هاتنێکی ڕێك و پێك و گونجاو کار دەکاتە ناو دەروونیەوە لە ڕێی چاوی یان گوێیەوە ، لە چەند کۆمەڵێکی دیارو ئاشکرادا بە زەنگێکی تایبەتی ،لەم کاتەدا دەروونی ئادەمیزاد لەگەڵ ئەو بینراوو بیستراوانە ئاوێزێ یان گونجانێ دروست دەکات ، بەپێی بە هێزی و لاوازی ئەم کارتێکردنە لەسەر ئەو کەسە ، ئەم ئەزمونگەریە دەردەبڕێ ... ئایا بە جووڵانی هەست و دەروونیەوە یان بە هۆی جووڵانی ئەندامەکانی لەشیەوە

**ئیقاع لە ئەدەبدا :**

**نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ**
**نەچم شەرتبێ ، هەتا ئەم خوارە بێ تۆ**
**دەروونم خاڵییە ، وەك نەی دەناڵێ**
**هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ**
**نالی**

**بە هیچ جۆرێك ناتوانین ئیقاع لە ئەدەب بەگشتی جیا بکەینەوە . ئیتر شیعر بێ یان پەخشان ، چیرۆك بێت یان داستان . پەیوەندی ئەدەب لەگەڵ مۆسیقادا زۆر کۆن و بەتینە ، ئەم پەیوەندی یەش لە ئیقاع و کیشەدا خۆی دەبینێتەوە کە دوو لایەنی گرنگ و سەرەکین لە پێکهاتنیاندا .**

**ئەم پەیوەندییەش دوو ڕا دەخاتەوە**

**١- هەندێك دەڵێن مۆسیقا باناغەی هەموو ئیقاعێکە. چونکە جۆرە زمانێکی سروشتی یەو ڕەنگی ئیقاعەکانی زمانی گرتووە، لەبەرئەوە ئیقاعی مۆسیقا دروستکەری ئیقاعی شیعرە.**

**٢ - هەندێکی تر دەڵێن... گوایە زمان (واتە لغة) کە شیعری لێکەوتۆتەوە بەر لە**



دەنگەکانی مۆسیقا بەپێی بەرزی و نزمی



دابەش کردنی دەنگەکان بەچەند خانەیەك بەکێشەی 2/4




ڕێکخستنی ئەم کاتانە بەپێی کێشەو تیمپۆکە ئاوازێکی ئاوازێکی بچووکی دروست کردووە ....

مۆسیقا بووە چونکە بناغەی توانای دەنگی زمانە . هەر ئیقاعێك لە مۆسیقادا بێت لەو مایەی دەگەڕێتەوە بۆتریەی دەنگی زمان .

گەر بگەڕێینەوە بۆ مۆسیقای یۆنانی کۆن بۆمان دەردەکەوێت کە ئیقاعی مۆسیقا بەستراوە بە ئیقاعی شیعرو زمانەوە بە جۆرێ لە لایەنێکی تیۆرییەوە هیچ جیاوازی نەبووە لەو ئیقاعانەدا لە نێوانیاندا . کێشەی شیعر بناغەی ئیقاعی مۆسیقا بووە . بەلاّم پاش ئەو سەردەمە مۆسیقا لە ئیقاعی شیعری دەرچوو و ئیقاعی هەمە جۆری تایبەتی بۆ خۆی پەیدا کرد ... بەلاّم تا ئێستاش زۆرجار کە باسی مۆسیقا دەکرێت وەك ئیقاعێکی شیعری ئیقاعەکەی لێك دەدرێتەوە .... لە هەمان کاتیشدا بە شیعرێك دەڵێن لەرەی مۆسیقای تیایە .

ئیقاعی بابەتە ئەدەبیەکان بەتایبەتی شیعر دەروونی زۆر لە مۆسیقارەکانی جیهانی پێ ڕووناك بۆتەوە بە جۆرێك کە خوریەی زۆر لە ئاوازەکانیان سەرچاوەی شیعر بووە . لە بەرهەمەکانی مۆسورسکی‌دا ئەمە بە جوانی بەدی دەکرێت .

هەروەها زۆر لە شاعیرانیش ئاوازی مۆسیقاو ئیقاعەکانی مەستی کردوون‌و شیعریان بووەتە مۆسیقا ، هەر مۆسیقایەکیان بیستبێ لە شیعرەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە . گۆرانی ووتن هونەرێکە مۆسیقاو شیعر کۆدەکاتەوەو زمان بۆتەهۆی دەربرین بۆ ماناو واتاکانی ... لێرەدا گۆرانی ووتن دووکاری گرنگی لێ‌دەوەشێتەوە :

١ . تارایەك دەدات بەسەر مۆسیقادا ، بەلاّم بەجۆرێکی‌وا زمان سنوور بۆ کورت‌و درێژی دانێ .

٢ . ئیقاعی شیعر بە جوانی دەردەکەوێت‌و باوەش بە مۆسیقادا دەکات .

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەریەکە لە شیعرو مۆسیقا کاریگەرن لەسەر یەکتری‌و هەریەکەیان خوریەدەدات بەوی‌تر . بۆنمونە چەندین شاعیر خەیاڵی شیعری وایان کەوتۆتە خەیاڵ کە لە بناغەدا مۆسیقابووە . چەندین مۆسیقاریش شیعر بووەتە تەلیسمێك لە دڵیانداو لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە تەنانەت زۆر لەو نووسەرانە دەڵێن : «حەزدەکەم بەزمانی مۆسیقا بنووسم» .

لەو نووسەرانەی کە مۆسیقا کاری کردۆتە سەر بەرهەمەکانیان – سۆیل بەتلەر – ی نووسەرو مۆسیقادانەر، – هۆفمان – ی نووسەرو مۆسیقارو نیگارکێش ، جۆرج ساند کە چارەنووسی خۆی بە شاعیری پیانۆ شوپان بەستبووەوە ، مەولەوی ، بێکەس ... و چەندینی تر لەم مەزنانە .

هەروەها لە مۆسیقارەکانیش لەوانەی کە خولیای ئەدەب بوون بەگشتی‌و شیعر بە تایبەتی شۆمان ، ڤاگنەر ، باخ کە بە مۆسیقاری شاعیر ناسراون . ئەمانەو چەندین مەزنانی تر . خۆئەگەر سەیری عەروزی شیعر بکەین ئەوا بە تەواوی کێشەو ئیقاع لە شیعردا دەردەکەوێت کە بە تەواوی لەگەڵ کێشەو ئیقاعی مۆسیقادا یەك دەکەون .

### ئیقاع لە مۆسیقادا :

گەر لە مۆسیقادا باسی ئیقاع بکەین دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو ترنگە سەرەکیانەی کە دەنگی مۆسیقا ، یان ئاوازی مۆسیقایان لێ پەیدا دەبێت . ئەو ترنگە

نموونەی – ٣ –



نیشانەکانی دەنگ



نیشانەکانی وەستان

سەرەکیانەیش ئەمانەن :

١ . دەنگ ، ٢ . کات .

گەر هەردەنگی پەیدابوو ئایا لە دەنگی ئادەمیزادەوە یان لە ئامێرێکی مۆسیقاوە . هەرچەندە لەرینەوەیەکی ڕێکوپێك بێت نابێتە ئاواز یان موسیقا گەر ئەو دەنگە لە چەند یەکەیەکی ڕێکخراودا لە کاتدا دووپات نەبێتەوە ، بە بەرزی‌و نزمیەکی دیاریکروا بەتیمپۆیەکی نیشان کراو ، بە شێوەیەکی تایبەت . کەواتە سیفەتی دروست بوونی ئاوازێك لە لەرینەوەو دوپات بوونەوەی دەنگەکان لە بەرزی‌و نزمی لە چەند یەکەیەکی وەك یەك بە پێی خانەیەك یان گوزارەیەك و برگەیەك . هەر بۆئەوەی ئەم مەبەستە بە ئاسانی بێتەدی ئەوەتا نیشانەی کات بۆ دەنگەکانی مۆسیقا (دۆ– ڕێ – می – فا – سۆل – لا –سی) دانراوەو بەرامبەر بەم کاتانەیش کاتی ڕێکوپێکی وەستان دانراوە کە بریتین لە : – نموونە (٣)

کاتێ‌بمانەوێت هەندێ لەم نیشانانە بە پێی ئەو ئیقاعەی کەمەبەستە ڕێکی بخەین ئەوا لە چەند یەکەیەکی لە دوایەك دایان دەنێین‌و دەیانخەینە کێشەیەکی دەست نیشان کراو بە پێی بەرزو نزمی دووبارەیان دەکەینەوە . دەگونجێ جۆری ئەو کێشەی دای دەنێین دوانی بێت یان سیانی ... چواری ... هتد نموونە ٤

**کێشەی مۆسیقا هەمووی لە سێ جۆردا کۆدەبێتەوە :**

١ . کێشەی سادە

٢ . کێشەی ئاوێتە

٣ . کێشەی تێکەلاّو

هەرکێشە لەم کێشانەیش ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە جۆرە دەست نیشان کردنی ئیقاعی ئەو ئاوازەی کە دەیبیسین .. نموونە ٥

هەر ئاوازێك کە دروست دەبێت پێویستە دەنگی بە هێزو لاوازی تیا دەست نیشان بکرێت، خۆ ئەگەر ئەم کارە نەکرێت، ئەوا ئەو چەشنە مۆسیقایە یان ئاوازە دەنگی ئاسایی‌و مۆنۆتۆن دەردەچێت. ئەو ئاوازە هەموو بە یەك‌جۆر لێ دەدرێت کە




نموونه (٥)

ئەمەیش خۆش نی‌یه. ئەو دەست‌نیشان کردنی دەنگانەیش لە خانەکاندا بە (Accent : نبرة) دەناسرێت . کەواتە کاتێك مۆسیقارێك کە ئاوازێك دەنووسێتەوە بەچەند بەشێکی بچووكو بە قەدەر یەك لە کاتدا . هەر بەشە پی‌ی‌دەوترێت خانە (بار : Bar) ، هەر خانەیش لە چەند یەکەیەکی مۆسیقا پێك‌دێت ، ئایا دەنگ بێ یان وەستان کەدابەش دەبن بەسەر جێگای بەهێزو لاواز (جێگای بەهێز سەرەتای خانەدەگرێتەوە ... هەندێ جاریش دەگۆرێت بەپی‌ی جۆری خانەکە ... هەر خانەیش بەپی‌ی کێشەکە لە بەشی بەهێزەوە دەست پێ دەکات تا بێ‌هێزترین یەکەی. بەم ڕێکخستنە لە مۆسیقادا ئیقاع دروست دەبێت‌و شێوەی ئیقاعمان بۆ دەردەکەوێت‌و جۆری تێمپۆی بابەتی ئاوازەکە کە دەست نیشانی دەکات ئایا خێرا بێت یان خاو لەم کورتە شیتاڵکاری‌یەدا ئەوەمان لێ‌ڕوون دەبێتەوە کە ئیقاع‌و تێمپۆوو شێوەی ئیقاع لە مۆسیقادا گەورەترین ڕۆڵ دەبینێت بۆ ئەوەی مۆسیقا دروست بێت .

کەواتە ئیقاع لە مۆسیقادا بریتی‌یە لە ڕێکخستنی کاتی ئەو دەنگانەی کە دەئاوازێن بە کورتی‌و درێژی لە کێشەیەکدا . تێمپۆیش جۆری خاوی‌و خێرایی ئەو ئاوازە دیاری‌دەکات . ئەم دیاری‌کردنەیش بەهۆی ئامێری میترۆنۆم (Metrome) ەوەیە . زۆر جار لە سەرەتای پارچە مۆسیقایەکدا نۆتەیەك دەنوسرێت بە کاتێکی

نموونه (٦)




دەست نیشان کراوو بەتەنیشتیەوە ژمارەیەك دەنووسرێت بەم شێوە :

. هتد... ♩= 112 ، ♩= 68 ، ♩= 108

ئەمە ئەوە پیشان ئەدات کە هەریەکە لەو جۆری نۆتەیە دەبێت وەها لێ‌بدرێت کە لە خولەکێکدا دەبێت ئەوەندە ژمارە لەو جۆرەکاتە لێ‌بدرێت .

یان هەندێك ووشە هەیە لە سەرەتای مۆسیقاکەدا دەنووسرێت کە بە گشتی جۆری خێرایی ئیقاعمان دەداتێ . هەندێ لەو ووشانەیش وەك

**زۆر خاو Largo Lento خاوێکی مامناوەند Andante خێراو گورج Allegro زۆر خێرا Presto**

.... هتد . کێشەی ئیقاعەکانیش بەهۆی ژمارەی چەند کاتێکی بەقەدەریەك کە لە خانەیەکدا دەنووسرێت دەست‌نیشان دەکرێت‌و ئەمیش هەر پەیوەستە بە جۆری ئیقاعەوە . کاتێك سەرۆکی تیپێکی مۆسیقا (کۆندەکەر)کە جوولە دەخاتە تیپەکەوە بەم کێشانە یەکیان دەخات ، بە دەست جۆری ئیقاع‌و تێمپۆو کێش یان دەداتێ ... تەنانەت شێوەی ئیقاعیش . ئەو جوولانەی کە لەو ئیقاعانە ڕێك دەخات هەندێکیان لێرەدا بە نموونە دەخەینە ڕوو :

کێشی 4/4 ، هەرکێشێکیش چواری بێت ئەوا بەم شێوەیە . 

کێشی 2/4 ، هەرکێشێك دووانی بێت بەم شێوەیە دەبێت 

کێشی 3/4 ،هەموو کێشێکی سیانی بەم شێوەیە دەبێت . 

ئا بەم جۆرە دەست جولانە جێگای بەهێزو مامناوەندی‌و لاواز لە ئیقاعدا پیشان ئەدات . کە دەست لەسەرەوە بەرەو خوارەوە دێت مانای سەرەتای خانەیەوەو بەهێزە ، جوولانی ئاسۆیی مانای جیگای هێزی مامناوەندە لەخانەدا ، جوولانی لابەلایش جێگای لاوازە لە خانەدا .

زۆر جۆری‌تر هەن لەم جوولانانە بەلاّم ئەوەی باوە ئەو سێ جۆرەی پێشووە .

بێگومان ئیقاع بە ئاشکرا ئەوەبوو کە لە مۆسیقادایە ، بەلاّم جۆرێکی‌تر هەیە کە لایەنی شاراوەیە ئەویش لە گوزارەو ڕستەو برگەی ئاوازەکاندا بەگشتی دەردەکەون . یان لە چەشنی دەربرین لە مۆسیقاکەدا وەك مۆسیقای سیمفونی ، جاز ، مۆسیقای هۆل Chamder Music ،وەیا خود مۆسیقای میللی .... هتد .

کاتێك گوێمان لە مۆسیقایەکی میللی بێت مۆرکەکەی ئەوە ئەدا بە هەستی مرۆڤ کە ئیقاعەکەی‌و جۆری ئیقاعەکەی میللی‌یە ، هەروەها سەبارەت بە جۆرە مۆسیقاکانی تریش ... کە باسێکی زۆر درێژتری دەوێت بۆ یەکالاّکردنو ڕوونکردنەوەی چەمکی ئیقاعی نهێنی تیایدا .... هەروەها ئیقاعی مۆسیقا لەگەڵ ئیقاعی دەروونی ئادەمیزادو هەستیدا دەگونجێت‌و یەکدەگرێت وەك هەستی مرۆڤێك کە ئیقاعێکی خەمناکی هەبێت دەتوانێت مۆسیقایەك دابنرێت بۆی کە لەگەڵ ئەو ئیقاعەیدا بگونجێت . هەر ئاوەهایش بۆ لایەنە هەستیەکانی‌تریش وەك کۆمێدی ، ئاسایی ، خۆشەویستی ، درندەیی‌و شەڕانی ... هتد .



نموونە ٧

**ئیقاع لە هونەرە شێوەکارییەکاندا :**

هونەرە شێوەکارییەکان بە هەموو لقەکانیەوە پڕن لە ئیقاعی هەمە جۆری ڕازاوو حەشین . بەڵام ئەو ئیقاعانەی کە تیادا بەدی دەکرێن وەك ئیقاعێکی شوێنەواری هەستی پێدەکرێت ، چونکە هەمووی ڕێکخستنی شوێن‌و ڕووبەرو قەوارەو .... پەیوەستین لەگەڵ یەکتر دەگرێتەوە . گەر سەیری هونەری ساختمانیدازی (الهندسە معماریة) بکەین بریتی‌یە لە دووبارەکردنەوەو لەیەکچوون‌و بەشکردنی ڕووبەرو ..شتی بە شێوەیەکی چونیەك‌و ڕێکوپێك . ئەتوانین بەم ڕێکوپێکیە بڵێین موسیقایەکی خامۆش ... تەنانەت ئیقاعی زۆر خانووی گەورە هەر لە دێرەوە کاریکردۆتە سەر مۆسیقارە مەزنەکان‌و لەبەرهەمەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە . ئەم ڕەنگدانەوەیش بۆتە سەردەمێك لە سەردەمە مۆسیقاکان . ئەوەتا لە سەردەمی ..ڕۆك Baroqueەوە لێمان دەردەکەوێت کاتێ پەرەسەندنی هونەری خانووبەرەلەوپەڕی گەشەو پێشکەوتندابوو . ئەمە کاری کردبووە سەر هەستی مۆسیقاری مەزن باخ لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگی دابووەوە . ئیتر بەسەرەتای سەردەمی مۆسیقای بارۆك ناونرا . جا ئەوەی شارەزای تەواوی بەرهەمەکانی باخ بێت ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە باخ شارەزاییەکی باشی هەبووە لە هونەری ساختمانیازیدا .

لە ساختمانێکی زۆر گەورەدا کەلە چەندین نهۆم پێك هاتبێت ، دەبینین بە چ جۆرە ئیقاعێك ژوور و هۆڵ‌و پلیکانەو دەرگاو پەنجەرەو .... هتد دروستکراون‌و دوبارەبوونەتەوە . ئەم دوبارەکردنەوە بە پێوانێکی دەست نیشان کراوو ڕێکوپێك .... ئیقاعێکی شوێنەواری تیادروست دەکات . کەواتە دوبارە کردنەوەی هەموو ڕووبەرێك یان قەوارەیەك ... یان پتر لە دووجار ناوەڕکێکی ئیقاعیمان بۆ دروست دەکات

خۆ ئەگەر تابلۆیەك بکەین ئەوا ئیقاع بە چەشنێکی خامۆش خۆی دەبینێتەوە ، بە تایبەتی کاتێك سەیری تابلۆیەك دەکەین‌و بە ووردی لیێ نزیك دەبینەوە ، هەرچەندە جوولەیەکی ئاشکرای تیادا نیە بەڵام جۆرە خرۆشیەکی دەروونی تیادا بەدی دەکرێت . ئەمەیش لە چاوی ئەو کەسانەدا دەردەکەوێت کە بە مانای سەیرکردنێکی زانایانە لەو کارە سەرنج ئەدەن ، واتە بە جۆرێکی تایبەت هەست بە کات دەکرێت لەو تابلۆیەدا چونکە ساتێکی زۆر کەم لە سەردەم پیشان‌دەدات کە ناگەڕێتەوە ، یان ساتێکی داهاتوو لە خەیاڵ پیشان دەدات . ئەم هەست پێکردنە لە



نموونە ٨



نموونە٩

تابلویەکدا بەوەدەردەکەوێت کە هەندێك جێگای پتر چاومان ڕادەکێشێت بۆ سەیرکردنی .

بەم تێڕوانینە جۆرێ لە جووڵانی خامۆش تیادا بەدەی دەکرێت کە لەسەر ئیقاعێك دانراوەو وامان لێدەکات چاو لەسەر هێندی بەش بهێڵینەوە پتر لە هێندی بەشی تر . بیستن‌و بینین بە هۆی زرنگانەوەی دەنگ‌و لەرینەوەی ڕەنگەکان هەستیان پیێدەکرێت کە هەردوکیان کارکردنە سەر دەروونی ئادەمیزاد ، ئەم کردارە گەر بەڕێکخراوی‌و بە چەند بارەکردنەویەکی ڕێك دەرکەوتن ، ئایا بەهۆی گوێوە بیستران ، یان بەچاو بینران و کاریان کردەسەر دڵ‌و دەروون ....ئەوا هەست پیشان‌دان بەرامبەریان جوانی ئیقاع دەست نیشانی دەکات .

مۆسیقارە فەرەنساییەکان لە چەرخی ١٧ – ١٨زدا زۆر جار بە خورپەی نیگاری ئافرەتێکی جوانەوە مۆسیقایان داناوە. جاری وایش هەبووەبە ناوی هەمان ئافرەتەوە ناویان ناوە .هەندێ دانەری مۆسیقا وەك ڕامۆ ، کۆپیران دەڵێن زۆر جار مرۆڤ دەتوانێت هەست بە ڕوخساری دەم‌و چاو ، باڵا ، هەڵس‌و کەوت‌و چەندین شتی تر بکات لەو جۆرە مۆسیقابانەداو ئەو ئاوازو ئیقاعانە بەو شێوە بەدی بکات. لەسەردەمی ڕۆمانتیکدا دەنگی ڕیبازیك بۆکێشانی (دیمەنی مۆسیقا) بەرزبووەوە ، ئەم ڕیبازە پەرەی‌سەندو چامەی سیمفونی لیێپەیدابوو ، وەك دانانی مۆسیقا لەسەر نیشتمان ،ڕووبار ، یان ناوچەیەك ، بۆ نموونە مۆسیقای دانوب ، ڤۆڵتا ، ناوچەی ئیبریا .

نیتشە سەبارەت بە ڤاگنەر دەڵێت : دەبێت ڤاگنەری مۆسیقازان لە ڕیزی نیگارکیشان سەیر بکرێت . ئەم ووتەیە زۆر لە مۆسیقارەکانی تریش دەگرێتەوە . بۆ نموونە چەندین لە نیگارکیشان هەبووە خەریکی مۆسیقایش بوون وەك لیونارد دافنشی ، میکائیل ئەنجلۆ کە دەڵێت : تابلۆی چاك پیویستە ئاوازو مۆسیقابێت . ئیقاع لە نیگارکیشاندا لە باسی هاوسەنگی‌و جووڵان‌و و جۆری ئەو دوولایەنەو هاوسەنگی بینراودا خۆی دەبینێتەوە

لەرەنگەکاندا .... شیکردنەوەی ڕەنکە سەرەکیەکان‌و پەیوەندیان لەگەڵ یەکترداو هاوسەنگیان بە پیێی ساردی‌و گەرمی هەروەها لە پێکهێنانی هێڵ‌و جۆرەکانی لە نزیکترین بینراوەوە تا بەرەو قوڵایی‌و دووری ، یان لە خاڵێکەوە بۆ پتر لە خاڵێ ، وەیان لە خۆدانەوەیان (انعکاس)دا . ئەمانە بە ئاشکرا ئیقاعێکی دیارن . ئەو ئیقاعە مۆسیقاییانەی کە بەگوێ دەبیسترێن هەمان ئیقاعە کە بە چاو دەبینرێن چونکە هەر وەك ووتمان ڕەنگدانەوەیان لە هەستی مرۆڤدا بەهۆی زرنگانەوەو لەرینەوەی ئەو شتەیە ئیتر ئایا دەنگ بێت یان ڕەنگ . نموونە٩

ئەگەر لایەنی ئاوێزی Harmonyو هاوبەری‌Contrast لە هونەری شێوەکاریدا ڕەچاو بکەین ، بۆمان دەردەکەوێت کە کۆڵەکەیەکی پتەوو کاریگەرە لە پێکهێنانی ئەو هونەرە .

ئەم دوولایەنە کە لە مادەو ئەنجامەکانیدا دەستمان دەکەوێت دەبێت بە ئامرازێك بپێورێن کە ماناو خاسیەتێکی تایبەتی هەبێت بە جۆرێك کە بیبەسینەوە بە

نموونه (١٠)



ناوەڕۆکەوە . ئەم ناوەڕۆکە شاراوەیش پەیوەندی بە تیروانینەوە هەیە بۆ هەر کارێك و هەر دیمەنێك . ئەم دیمەنەیش مانای تەواومان دەداتێ لە رووی داناناو دارشتنی ناوەڕۆکەوە کە زۆر لایەن دەگرێتەوە وەك رەنگ ، دیمەن ، بارستە . هێڵەکانو زاڵ بوون بەسەر ئەو لایەنانەداو پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا سروشتی پێکهاتنی ئەو پەیوەندیانەو روخساری گشتی ئەو رەنگانەی کە هەن لە پێکهاتنیان . سەرجەمی تەرازوی ئەندازەی بۆ چونیەکی و ناچونیەکی لەو دیاردانەی کە بەرچاومان خست .

خۆ هەر قەوارەیەك کە بێتە بەرچاومان ... ئەوا پارسەنگی کە لە خۆیدا ئیقاعە زۆر لایەنی دەگرێتەوە بە تایبەتی لە جۆری ئەو پارسەنگیەدا ئیقاع بە ئاشکراو بەنهێنی هەستی پێ دەکرێت نموونە (١٠)

**ئیقاع لە شانۆدا :**

ئیقاع لە شانۆدا لایەنێکی زۆر گرنگە لەو لایەنانەی کە کاری هونەری شانۆیی لێ‌پەیدا دەبێت ... هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەو بەرهەمە .

وەکو ئاشکراو روونە شانۆ کۆبەندی هونەرەکانی ترە لە مۆسیقاو شێوەکاری plastic و ئەدەب‌و وەرزش ... کەواتە لە شانۆدا ئیقاع بریتیە لە چەند یەکی کاتی‌و شوێنەواری رێکخراو بە تیمپۆیەکی دیاریکراو ئیتر بە ئاشکرا بێت یان بە خامۆشی .

با بزانین ئیقاع بە چ جۆرێك خۆی دەنوێنێت لە شانۆدا ... پێش هەموو شتێك دەبێت بگەڕێین بە شوێن ئەو ترنگانەی کە کارێکی شانۆیی لێ‌پەیدا دەبێت ... بێگومان ئەو ترنگانەیش ئەمانەن :

١ - دەقی شانۆیی ٢ - دەرهێنەر ٣ - نوێنەر ٤ - دیکۆر



نموونە ١١

٥ - ئارایشت ٦ - جلوبەرگ ٧ - رووناکی ٨ - مۆسیقا

٩ - تەکنیکاری‌و کارگێران ١٠ - بەرهەم هێنانو چەندین کاروباری تر

هەر یەکە لەمانە بە جۆرە ئیقاعێکی تایبەت کاری لەگەڵدا دەکرێت ، هەیە وەك هونەرێکی کاتی ، هەیشە وەك هونەرێکی شوێنەواری .... دەڵێن فلان دەق ئیقاعێکی گرانی هەیە ... یان فلان دەرهێنەر ئیقاعێکی گورج‌و سووکی بە دەستەوەیە . وەیان فلان دیکۆر هاوتایی‌و هاوسەنگی ناتەواوە ... یان فلان نوێنەر ئیقاعی دەورەکەی سوکەڵەو تیمپۆکەی گورج‌و گۆڵە ... ئیتر بەم شێوە ...

ئەمانە هەمووی بۆ بینەر دیارەو لە هەستی بینەردا چەسپ دەبێت بێ‌ئەوەی زۆریان بەو جۆرە لێکی‌بداتەوە کە کاری ئیقاع رەنگدانەوەیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو لایەنانە ، یان بتوانێت ئەو هەستەی دەری‌دەبرێت یان ئەو جوانیەی دەیبینێت لەو کارە هونەریەدا یان ئەو نارێکیەی دەیبینی‌و دەیبیستێ پەیوەندی بە ئیقاع‌و گورج‌و گۆڵی‌و خاوی ئیقاع (تیمپۆ)وە هەیە....

هەر شەخسیەتە لە دەورێك‌دا ئیقاع‌و تیمپۆیەکی تایبەتی هەیە کە بە پێی‌ئە رووداوی ئەو بابەتە دەگۆڕێ ... جاری وا هەیە ئاساییە ... جاری وا هەیە خێرایە ... جاری وا هەیە خاوە ... بۆیە پێویستە دەرهێنەر پێش ئەوەی بە کارەکەی هەستی کە دەرهێنانە دەبێت ئیقاع‌و تیمپۆی هەر دەورە بۆ ئەو نوێنەرانە روون‌بکاتەوە کە کاریان لەگەڵ دەکات بە پێی دەقەکە .

ئەو بابەتانەی کە هەن لە شانۆگەریدا وەك بابەتی کۆمێدی یان تراجیدی و هەر بابەتێکی‌تر ... رەچاو کردنی ئیقاع‌و تیمپۆی ئیقاع بۆ دەرخستنی جۆری ئەو بابەتانە دەبێتە هۆی سەرکەوتنی ئەو بەرهەمە . بۆ نموونە لە دیمەنێکی کۆمێدیدا تیمپۆی گورج‌و گۆڵ رۆڵێکی گەورە دەبینێ ... هەروەها لە دیمەنێکی تراجیدیدا تیمپۆی قورس‌و مەنگ رۆڵێکی گەورە دەبینێت .

بۆ دەربڕینی ئەم لایەنانە لە ئۆپێرادا دانەری مۆسیقای مەزن ڤاگنەر بابەتی لێتموتیف leitmotive ی داناوە .

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەهەر نوێنەرە بەپێی دەورەکەی خۆی مۆسیقایەکی تایبەت لایەنی دەورەکەی پیشان دەدات کە لایەنێکی دەروونی دەردەبڕێت کە ئەو نوێنەرە پێی هەڵدەستێت .

هەر لە ئۆپێراو ئۆپەرێت‌دا ئیقاع بە هەموو جۆرە کانیەوە گەورەترین دوخ دەبینێ لە رێکخستنی هەموو ئەو لایەنانەی کە هەیەتی وەك : جوڵانی نوێنەرەکان ، گۆرانی ، سەماو جووڵانەکانی‌تر . نموونە(١١)

هونەری سەما کە هەندێ پەروایان بە بەشێك لە جوڵانی شانۆیی دادەنێن‌و هەندێکی تر دەیدەنە پاڵ مۆسیقا . لە راستیدا ئەو هونەرە لە ناو هەردووکیاندا ئەو بەجێ‌دێت و وەك هونەرێکی شوێنی‌و کاتی سەیر دەکرێت – هەر لە زۆر کۆنەوە زۆر لە نەتەوەکان سەمایان بە جۆرێك لە نەریتی ئاینی داناوەو پیرۆزانە بە دەمیەوە چوونەو وایان بیرکردووەتەوە کە مرۆڤ بە هۆی سەماوە لە خواوەند خۆی نزیك دەکاتەوە..

ترنگی ئیقاع پەیوەندی مۆسیقاو سەمای کۆکردۆتەوە بەجۆرێك هەر یەکەیان لەناو ئەوی تردا تواوەتەوە . تەنانەت پەیوەندی گیانی مۆسیقا لەگەڵ سەمادا کارێکی



... هەبووە لەسەر مۆسیقا . پەروایەن وای دادەنێن کە هۆیەکی گرنگك بووە لە ... مۆسیقاو دۆزینەوەی جۆرین ئیقاعی هەمە جۆر بۆی . هەر ... هەرجوولەیەك لە سەمادا لەسەر یەکەیەکی مۆسیقا دەروات . ... زۆر جێگا لە جیهاندا بە تایبەتی لە سەمای بالیّدا . رووناکی ئەو تابلۆ ... مۆسیقا دادەنێن و روونکی دەکەنە جوولەیەکی کاتی و تێکەلّ بە ... تری دەکەن .

... هاوسەنگی لە شانۆدا دەبێت لە هەموو ترنگەکانی شانۆگەریدا رەچاو ... جونکە ئەم کارە دەروازەی کارکردنە لەگەلّ ئیقاعی ئەو بابەتە شانۆیی یە . جا ... دیکۆر یان جلوبەرگ یان رووناکی و ..... هتد بۆ دەست نیشان کردنی هەر ... کە دەبینرێت و هەست بکرێت بە جۆری ئیقاعەکەی و تیمپۆی و بابەتی ... کەی پێویستە ئاگامان لەوە بێت کە بە تەواوی ئەو دەقەی لەبەردەستایە لیّ ی ... ینەوە . لایەنی هەستی و جوانی و ناوەرۆکی روون بکرێتەوە . هەروەها لە ... ەوەی دەقەکەدا دەبێت جۆری ئەو دەورەی کە نوێنەرەکان دەیگێرن روون ... تەوە . جۆری شانۆگەریەی بۆ یەکالّابکرێتەوە بۆ ئەوەی ئیقاعی گشتی و تایبەتی ... دەورە لەلایەن نوێنەرەکانەوە لەبەر چاودا بێت بۆ کارکردن لەگەلّیا . بۆ نموونە ... شانۆگەریەکەپاش لێکۆلینەوەی دەرکەوت کەشانۆگەریەکی کلاسیکە دەبێت ... کلاسیك و ئەنجامەکانیان لەبەرچاوبێت . نوێنەر وەك ئیقاعی گشتی ئەم جۆرە ... گەریانە دەبێت بزانێت کە ئیقاعی دەنگ و قسەکردن و جموجول و لەش ولارو ... رگ و ... هتد دەبێت بەجۆرێکی لەسەرخۆو خامۆش و پرو قورس بێت .

خۆ ئەگەر لەم جۆرە لێکدانەوەدا چووە دەرەوەو ئیقاعی ئەم لایەنانەی رەچاو ... کرد ... ئەوا ئەو شانۆگەریە وەك پێویست خۆی نادا بەدەستەوە . **نموونە (١٢)**

دارشتنی دەقەکەلە ئیقاعی ئەو دەورو روودانەی کە لە شانۆگەریەکەدا هەیە ... جێکی گەورە دەبینیّ . دارشتن هەیە بە پیّ ی جۆری دەورەکە کورت و کەمە . یان هەیە ئیقاعی درێژو زۆرە ، گورج و گۆلّە ، خۆش بەسەردەمەوە دێت ، قورس و حمۆشە . جا کە هەندیّ لەم لایەنانە روون دەکەینەوە بارێکی گران بەدی ... کەین لەسەر شانی دەرهێنەر ، بۆیە پێویستە کە توانای هەر دەر هێنەرێك لە توانای ... وسەرێك کەمتر نەبێت بۆ ئەوەی دەست نیشانی ئیقاعی گشتی ووشەو رستەکان و ... رووداوەکان بەباشی بکات و بزانێت چۆن بابەتی ئیقاع و تیمپۆی ئیقاعی ئەو بابەتە ... دەرهێنیّ لەجیّ ی خۆیداو دەیان بەستێت بەیەکەوە بۆ ئەوەی دەقێکی سەرکەوتوو ... کەش بکات . بەم جۆرە دەرهێنەر دەتوانێت ئیقاعی نوێنەرەکان بە پیّ ی دەورەکانیان ببەستێت بە ئیقاعی لایەنەکانی ترەوە . ئاپ لایەنی دەقەکە . دەرهێنەکە خۆی یان مۆسیقا ، رووناکی ، جلوبەرگك یان دیکۆر ... هتد . **نموونە (١٣)**

زۆرجار نارێکی بەدی دەکەین لە شانۆگەریەکدا ، وەك کارێکی پەسەند نایەتە بەرچاومان یان بەرگوێمان ... لەوانەیشە نەزانین کە ئەو نارێکیە دەگەرێتەوە بۆ جۆری بەکارهێنانی ئیقاعی ئەو کارە هونەریە . بۆ نموونە کورێکی لاوی ٢٠ سالّەکە دەوری پیاوێکی ٧٠ سالّە دەبینێت ... هەموو پێداویستی یەکی خۆی دەگۆرێت ئیتر لە قسەکردن ، چرچی دەمو چاوی ، جوولانی ، لەرینەوەی دەنگی و چەندین لایەنی تر ، ئەمانە هەمووی کۆدە کاتەوە لە خویدا ، جائەگەر ئەو نوێنەرە لە دەورەکەیشیدا سەرکەوتووبێت ناتوانێت دەقاو دەقی ئەو پێداویستیانەی کە کابرایەکی ٧٠ سالّە پیّ ی هەلّدە سێت بە ئەنجامی بدات ، چونکە ئیقاعی ئەوکەسە قورس ترە لەئیقاعی لاوێکی ٢٠ سالّە . زۆر لەو بابەتانە کە هەن ... چ لەسەر شانۆ چ لە تەلّە فزیوندا بەرچاومان کەوتوون بە تایبەتی کاتێك پیاوێك دەوری ئافرەت دەبینیّ خۆ ئەگەر دەورەکەیش بەباشی ببینێت هەر ناتوانێت وەك ئیقاعی دەروونی ئافرەت ئەو دهورە ببینێت .

لە بابەتی قسەدەربرنیدا ... زۆرجار گوێمان لەیەك دەق پەخشان یان ووتارێك یان هۆنزاوەیەك دەبێت لە دەمی یەکیکەوەو بەتەواوی هەستمان رادەکێشی و دلّو دەروممان دە جوولێنێت و لەگەلّیا دەژین ... هەر هەمان دەقی بابەتەکە یەکێکی تر بە ئەنجامی ئەدات کەچی لیّ ی وەرس دەبین ، سەرمان پیّ ی دێتەئێش .. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە شارەزایی چەشنی دەربرین و جۆری ئیقاعی ئەو بابەتە کارێکی گەورەیە بۆ چەسپکردنی ئەو ناوەرۆکەی دەمانەوێت بۆ بینەرو بیسەر . کەواتە ئیقاع لە شانۆدا بەیتی یە لە ئیقاعی ئاشکرا لەو کارانەی کە دەیبینین و دەیبیسین . یان ئیقاعی شاراوە کە لەو ناوەرۆك و کارە دەروونیانەدا خۆی حەشارداوە .


سەرچاوەکان :

١ - کیف تتذوق الموسیقى - ارون کوبلاند

٢ - التعبیر الموسیقي - د . فؤاد زکریا

... اد زکریا ٤ - جمالیات الابداع الموسیقی . جیزیل بروله

٥ - مؤلفات کندی الموسیقیة . زکریا یوسف

٦ - فن الالقاء . جزء (٢) .. سامي عبد الحمید . بدري حسون فرید

٧ - علم عناصر الفن . الجزء الاول والثاني . فرج عبو

٨ - فلسفة الفن - سوزان لانجر

٩ - روح الموسیقى - سمیر الجاح شاهین

١٠ - تعلم الرقص - اعداد وترجمة . بیدروس شاطر .






# منداڵی میزن و چارەسەری

**منداڵی میزن ئەو منداڵەیە، کە میز ڕاناگرێت، تا دەیگەیەننە ئاودەست یان سەر [قەعدە] میز بەخۆیدا دەکات، میزنی وا هەیە بە شەوو ڕۆژ، وەکو یەك گیانی خۆی تەڕ دەکات، هەشیانە تەنها بە شەوان. هەشیانە تەنها بە ڕۆژ میز بەخویدا دەکات.**

لەوەی نەبێت ،زیانی‌میز بەخۆدا کردنی منداڵ – بە تایبەتی بەشەوان – تەنها ئەوە بێت جێگەی نوستنەکەی خۆی تەڕکات، وجلەکانی پیس بکات، وپیخەوەکانی برزێت، وزوو بدڕێت، وژوورەکەی،و نێو جۆلانێکەی یان بێشکەکەی ،بۆنی ناخۆشیان لێ بێت،و دایکی یان دایەنەکەی بە جل گۆڕین، وشۆردنەوە، ماندو بکات، بەڵکو منداڵی میزن، هەست بە کەمسەری، وپەشێوی دەروونیش دەکات، هەمیشە شەرمنە، وهەست بە تەریق، وهەست بەبێ نرخی، ونزمی ،خۆی دەکات ،ترسنۆکە، ولە سزای دایکی، وباوکی دەترسێت، ولەخوتە، وبۆڵەی کەسانی دەور، وپشتی دەترسێت.

ئەمانە هەمویان دەبنە هۆی ئەوەی کە گۆشەگیر بێت،و تێکەڵاوی منداڵانی دیکە نەکات، لە چالاکی‌یەکانیاندا، ودورە پەرێز بوەستێت.

زۆر کەرەت، ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی، تورەبێت، یان قسە بگلمێنێت، ودەمی گۆنەکات، کاتی واش هەیە منداڵەکە سەرشێت، ویاخی دەکات، وسەرپێچ دەبێت، ووورکن دەبێت، وقاپ‌و قاچاخ دەشکێنێت، وبەرهەڵستی کەسانی دەوروبەری دەکات ،بەڵکو تێیاندا هەڵدەکەوێت، لە دووا ڕۆژدا دزوو درۆزنیش دەبن، زیانی میز بە خۆدا کردنی منداڵ، ئەوەشە کە لەشی منداڵەکە خۆی دەسوتێنێتەوە، هەست بە برژانەوەی پێستەکەی دەکات ،ئەگەر جلەکانی تۆزێك زبربن، پێستەکەی دادەماڵێت، وئازاری دەگاتێ.

ئەمجا کە هات،و میز بەخۆدا کردنی منداڵ، ئەم هەموو زیانە ماددی، ولەشی، ودەروونیانەی هەبێت، پێویستە لەسەرمان زوو بە دەست‌و، بردی بە شێوەیەکی زانستیانە، هۆکانی بدۆزینەوە، چارەسەریان بکەین.

پیویستە ئەوەش بزانین، چارەسەری ڕاستی، ئەم گیروگرفتانە بە هەڕەشە، وگوڕەشە کردن،و چورنوك، ودارکاری، وفەلاقە کردن، وشکاندن، وتەریق کردنەوە، وناوزڕاندن ؛ناکرێت، وەکو هێندێ کەس باوەڕیان وایە، بەڵکو

ـ ڕێگەی زانستی،و پەروەردەیی دەکرێت، وەکو لەمەودوا باسیان دەکەین.

خوێنەری هێژا! باش وایە پێش هەموشتێك بزانین میز بەخۆدا کردن، تا چ تەمەنێك بە ڕواڵەتێکی سروشتی دادەنرێت، ونەخۆشی نی یە؟ لە ڕاستیدا زوربەی زۆری منداڵان، تا تەمەنیان دەگاتە [٥ر١] یەك ساڵ و نیوی ـ نێو جێگەی خۆیان تەڕدەکەن،و میز بەخۆیاندا دەکەن، لەبەر ئەوە دایکی کوردی منداڵی خۆی لە بیشکەدا دەپێچێتەوە،و بلوێر بەکاردەهێنیت، وەکو ڕێڕەوێك، بۆ میزی منداڵەکەی، کە منداڵ لە تەمەنی [٥ر١] تێپەڕی، بەرە بەرە ڕادێت لەسەر میزڵدان گرتن، میز بەخۆدانە کردن، بە جۆرێك ماوەی ووشکی جلەکانی کاتی وا هەیە دەگاتە (٢)کات ژمێر، ئەمیش لەبەر ئەوەیە میزڵدانی بەرە بەرە گەشە دەکات،و دەگات یان بابڵێین! دەگەنێت نەك لەبەر ئەوەبێت ڕابهێنرێت لەسەر خۆگرتن، لەوەی نەبێت هەموو منداڵێك لە پەرەسەندنەدا، وەکو یەك وابن، بەڵکو لەم بارەیەوە منداڵان جیاوازییان هەیە. ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە، بۆ قەوارەی میزڵدان، یان گەیینی ـەش. یان ئەو ژینگەدەروونییەی کەتێیدا دەژی.

لەبەرئەوە، منداڵ هەیە ،دەتوانێت لە تەمەنی دوو ساڵیدا میزڵدانی خۆی بگرێتەوە، هەشیانە بە سێ ساڵی، وهەشیانە بە چوار ساڵی، لە گەڵ ئەوەشدا، تێکرایی ئەو تەمەنەی کە منداڵ دەتوانێت، تێیدا، میزڵدانی خۆی بگرێتەوە [٥ر١] یەك ساڵ و نیویە، تێکرایی ئەو تەمەنەی کە منداڵ دەتوانێت بە شەوو ڕۆژ بە شێوەیەکی سروشتی تێیدا میزی خۆی بگرێتەوە [٣ – ٤] ساڵییە. ئەگەر هات،و منداڵ لەم تەمەنە تێپەڕی، وهەر خۆی تەڕ دەکرد، مانای وایە، هۆیەکی خراپ هەیە بۆ ئەمە، پێویستە بۆی بگەڕێین،و بیدۆزینەوە، وچارەسەری بکەین، ئەگینا لێی دەبێتەوە،و نەخۆشی دیکە پەیدا دەکات، ئەوکاتە چارەسەری گرانتر، وقورستر دەبێت.

### هۆکانی خۆتەڕکردنی منداڵ

پێش ئەوەی بچینە نێو باسەکەوە، پێویستە بڵێین منداڵی میزن کاتێك کە میز بەخۆیدا دەکات، بە دەستی خۆی نی یە، ئەویش حەز دەکات : بەڵکو ئاوات دەخوازێت، کە ئەم ڕواڵەتەی نەبێت وەکو منداڵانی دیکەی ئاسایی بێت، لای کەسانی دەورو بەری خۆشە ویست بێت، ئەمجا لە بەرئەمە پێویست ناکات گاڵتەی پێ بکەین،و لەبەر چاوی میوان، وڕارەو بیشکێنین، بەڵکو



،پێویستە هۆکانی نەگەیشتن،و بێ‌هێز کردنی ماسولکەکانی میزـ ـ بدۆزینەوە، ئەو هۆیانەش دەکرێن بە چەند بەشێکەوە:–

### یەکەم: هۆلەشی‌یەکان:

ئەو هۆلەشی‌یانەی ماسولکەکانی میزڵدانی منداڵ لاوازدەکەن. و ای لێدەکەن کە توانای بەسەر ڕاگیرکردنی میزدا نەبێت ئەمانەن:

کەم خوێنی، بەدخۆراکی، شێواوی کۆئەندامی دەمار، بەدهەرسی. قەبزی، تووش بوونی شەکرە، کەم فیتامینی، هەوکردنی ئالوو، بوونی کرمی ڕیخۆڵە، نەخۆشی‌یەکانی گورچیلە ،ومیزەڕۆ.. .هتد.. . پێویستە لەسەر کەس ـ. وکاری منداڵی میزن، بەتایبەتی ئەو منداڵەی کە لە تەمەنی (٤) ساڵان تێپەڕی بێت، زۆر بەدەست و بردی نیشانی نوشدار [پزیشك]ی بدەن .بۆ ئەوەی بە ڕێگەی زانستی‌یانە نەخۆشی‌یە لەشی‌یەکەی بدۆزێتەوە.و چارەسەری بکات. وله میزنی ڕزگاری بکات.

**دووەم: هۆ دەروونی‌یەکان**

گرنگترین ئەو هۆیانەی کە منداڵ میزن دەکەن،و پێیان دەووترێت، هۆی دەروونی ئەمانەن:

دڵەراوکێی دەروونی، کە منداڵ پەشێو دەکات ،تووشی شەوخونی دەکات،و خەوی دەزرێنێت، و تووشی پەژارەی دەکات،و کە کاتێك نوست خەونی هەڵەشەو پەڵەشە دەبینێت، کە خەبەری بۆوە، دەبینێت، میزی بەخۆیدا کردووە.

هەروەها ترسنۆکی، لە تاریکی، لە باوك، لە دایك، لە مامۆستا، لە پۆلیس، لە دز، لە شەیتان، لە جنۆکە، لە دێو، لە مردن. کاتێ وا هەیە منداڵ بۆیە میز بەخۆیدا دەکات، چونکە برایەك، یان خوشکێکی بچوکی بووە، ودەترسێت ئەوپلە، و پایەی لای دایکی هەیەتی، لێی داگیر بکات، لەبەر ئەوە هێندێك منداڵ هەن، دەگەڕێنەوە، و خۆیان منداڵ دەکەنەوە، و مەمکە دەمژنەوە، هێندێکیان میز بەخۆیاندا دەکەن، چونکە ئەمانە ڕواڵەتی منداڵین، کاتی واهەیە کە منداڵ خۆشەویستێکی دەمرێت، وەك باوکی، یان دایکی دەبینین، دەگەڕیتەوە بە دواوە، خۆی منداڵ دەکاتەوە، ومیز بەخویدا دەکات.

هێندێك لە زاناکان دەڵێن: تەنها ئەمانە منداڵ ناگێڕنە دوواوە، بەڵکو جاری وا هەیە، هۆیەکی دەروونی ژنگەییش، یارمەتی دەدات، ئەو هۆیەش لەم شێوانانەدا دەردەکەوێت: ووره نزمی، باوەڕ بەخۆ نەبوون، هەست بە ئارام نەکردن، دکتور مەللاك جەرجیس لە چەند لێکۆڵینەوەیەکدا ئەم ڕاستی‌یەی سەلماندوە، واتای وایە: کە هەرەشە کردن لە منداڵ، هەست بە ئارام نەکردن، باوەڕ بەخۆنەبوون، خۆشە ویستی، ودایەخ، پەنا، لە کیس چوون، ئەبنە هۆی ئەوەی منداڵ بگێڕنەوە بۆ خووەکانی منداڵی ی، و میز بەخۆدا کردن.

**سێیەم: کەس‌وکار**: گوناهی کەس‌وکاری منداڵ لەوەدایە، کە کاتێك زانییان منداڵەکەیان، گەیشتۆتە تەمەنی ڕاهێنان، بۆچوونە ئادەست، میزگرتنەوە، ڕای ناهێنن،و ئەم کارەیان پشت گوێ دەخەن،و کەمتەرخەمی تێدادەکەن، ئەمەش یان لە بەرئەوەیە، کە خۆیان تەمەڵی‌تیادا دەکەن، یان بەلایانەوە گرنگ نی‌یە، ودەڵێن: کە خۆی گەورە بوو، چاك دەبێت، ئیتر بە لایانەوە قورس‌و،گرانە، کە شەوان، چەند کەرەتێك منداڵەکەیان لەخەو هەڵستینن،و بیبەنە پیش ئاو.

چوارەم: گورج، وگۆڵی، وياری کردن: زۆر لەو منداڵانەی، شەوان میز بەخۆياندا دەکەن، ئەو منداڵانەن کە بەرۆژ زور چالاکن، و خۆیان بە یاری،و گەمەوە، ماندوو دەکەن، کە شەوان خەوتن خەبەریان نابێتەوە.

هێندێ منداڵ هەن، بەدەستی ئەنقەست، میز بە خۆیاندا، دەکەن یەکێك لەو بەڵگانەش، لەسەر ئەمە، ئەوەیە، کەهەر ئەوەندە دایکی جلەکانی، گۆری، جلی ووشکی لەبەر کرد، دوای ماوەیەکی زۆر کورت، میز بەخۆیدا دەکات، وخۆی تەڕ دەکات. هەرچەند گورج،وگۆڵی دانانرێت بە هۆیەکی خراپ بۆ میزنی منداڵ، بەڵام منداڵێك بە دەستی ئەنقەست، خۆی تەڕ بکات پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی زۆر هەیە.

**چارەسەرکردنی میزنی منداڵ**

خوێنەری بەڕێز: وەکو لەپیشەوە ووتمان، ئەگەر تەمەنی منداڵ لە (٣ – ٤)ساڵی تیپەڕی کرد،و هەر جێگەی نوستنەکەی تەڕ دەکرد، ئەوە پێویستە زوو بەدەست،و بردی، هۆکەی بدۆزرێتەوە، وچارەسەری بکرێت، پێش هەموو شتێك، پێویستە نیشانی نۆشدار (پزیشکی) تایبەتی بدرێت، هۆکەی دەست نیشان بکرێت، چارەسەری بکرێت.

ئەگەر چارەسەری هۆ لەشی‌یەکانی منداڵە میزنە کەکراو هەرچاك نەبوو، ئەو کاتە پێویستە باری دەروونی چاك بکرێت، ئەویش بەم خاڵانەی خوارەوە، دەبێت!

١ – ژنگەیەکی باش،و پڕئارام،و دڵنیایی، وئاسایشی، بۆ دروست بکرێت، ناکۆکی نێوان دایك‌و باوەکی نەهێڵن.

٢ – بە جوانی،و خۆشەویستی،و سۆزەوە، کردەوەی لە گەڵ بکەن.

٣ – وای لێ بکەن، کە هەست بە نرخ،و پایە، و بوونی خۆی بکات، نەك بە بەرچاویوە، باوکە بڵێت: خوزگە ژنم نەهێنایەو منداڵمان نەبوایە،و ئای ژیانی زوگرتێی (ڕەبەنی) چەند خۆش بوو. لە لایەکی دیکەشەوە، دایکە بڵێت: خۆزگە شووم نەکردایەو هەر بەکچە عازەبی بمایەتەوە،و باوك،و دایکی بەجێ نەهێشتایە،و منداڵم نەبووایە، چونکە منداڵ کە گوێی لەم نارەزایی دەربرینانە دەبێت، هەست دەکات، کە بوونی جێگەی ڕەزامەندی کەس،و کاری نی‌یە،و تووشی بەشێوی دەروونی دەبێت، تین دەگاتە سەر میزڵدانی.

٤ – نابێت گاڵتە بە منداڵی میزن بکرێت،و سزای لەشی بدرێت،و بەند کرێت،

٥ – پێویستە لەکاتی دیاری کراودا شەوان لەخەو بێدار بکریتەوە وببرێتە سەر پێش‌ئاو، بۆ ئەوەی ڕابێت.



**خوێنەری هێژا**: باش‌وایە دایك‌و، باوك، کە زانییان، منداڵەکەیان توانای پەیدا، کردووە، خۆی بگرێت، پەنگ بە میزەکەی بکاتەوە، هەوڵ بدەن رای‌بهێنن، لەسەر ئەمە، بۆ ئەوەی خوی پێوە بگرێت، لە کوردەواریدا، دوای ئەوەی منداڵ لە قنۆرکەوە دەگوێزرێتەوە، بۆ نێو بێشکە، تا تەمەنی دەگاتە نیزیکەی (١) ساڵی، دایکی بۆ ئەوەی جێگای منداڵەکە تەڕ نەبێت، شەوان بلوێر بەکاردەهێنێت، وەکو میزەڕۆیەك، بۆ ژێری لانکەکە، بەرۆژیش، بەڵکو جاربەجارێك بەشەویش، تاو ناتاوێك، منداڵەکەی دەخاتە (سەرپێ)، .بۆ ئەوەی ڕابێت لەکاتی تایبەتیدا گمیز بکات، بەڵام ئیستە بەتایبەتی لە شارەکاندا (قەعدە) بەکار دەهێنرێت، بۆ ئەم مەبەستە، واتا لەباتی منداڵ خستنە (سەرپێ)، **بەراستی تەنها گەیینی ماسولکەکانی میزڵدانی**

**منداڵ بەس نی‌یە بو** ئەوەی کەمیز نەکات بەخویدا، بەڵکو فێربوون،و ڕاهێنانیش دەوری هەیە لەم بارەیەوە، ئەمجا پێویستە لەکاتی ڕاهێنانی منداڵەکەدا، تیبینی ئەم خاڵانە، بەووردی بکرێت:

١ – منداڵەکە ڕابهێنن، لە پشت بەخۆبەستن، بەڵکو وای لی‌بکەن کە چاودێری منداڵی لە خۆی بچوکتریش بکات، وەکو بیشکە ڕاژەنن، یان ژێر کردنەوەی منداڵ بە (شەقشەقە)، ئەگەر منداڵی بچوك هەبوو لە خێزانەکەدا، لە گەڵ ئەمەشدا، ئەبێت تاوای لی بکرێت کە ئەویش هاوکاری بکات، لە لابردنی کۆسپەکەیدا.

٢ – پێویستە کۆسپەکەی بەلاوە. بچوك‌کەیتەوە، لابردنی ئاسان کەیت بۆ ئەوەی وورەی بەرزبێتەوە،و زاڵ بێت بەسەریا.

٣ – نەیەڵێت: هەست بە کەمسەری (الشعور بالنقص) بکات.

٤ – ئەگەر ترسنۆك پێویستە چارەسەری ترسەکەی بکەیت.

٥ – ئەبێ تێی‌گەیەنیت کە گمیز کردن بەخویدا، دەبێتە گرفت لە ڕێگەی گەڕان،و سەیران، هات، وچۆ کردنی ماڵەخزمان، لەگەڵ باوك.و برو کەسانی دیکەدا، چونکە کە هەستی کرد بەری (محروم) دەبێت لەو گەشتن هەوڵ دەدات کەنەی هێڵێت.

٦ – ژەمە خواردەمەنی‌یەکانی سەر لەئێوارانی، بەتایبەتی ژەمەکانی دوی شیوانی، سوك‌بن،و بەهارات،و شیرینەمەنی‌یان، تێدا نەبێت. تێپێت دەکرێت، ئێواران شیرو،و ئاوی لی بگرەوە.

٧ – دەبێت بەشەوان یەکێك چاودێری ئەوەی بکات، وبزانێت. شەوی چەند کەرەت،و لە چ کاتژمێرێکدا میز دەکاتە جێگاکەی، بۆ ئەوەی نە کاتانەدا لەخەو خەبەری کەنەوە،و بیبەنە سەر پێش‌ئاو.

ئەمجا دەتوانن خشتەیەك، وەك ئەم خشتەیە بکێشن،و ئەو ڕاستی‌یانەی لەسەر تۆمار بکەن،و شەوانی داهاتوو کەڵکی لی وەرگرن.

**شەوەپاکەکان**

**شەممە**

**یەکشەممە**

**دووشەممە**

**سی‌شەممە**

**چوارشەممە**

**پێنج‌شەممە**

## گرنگترین سەرچاوەکان

١ – فهمی،مصطفى – سایکولوجیة التعلم – ط ١ دار مصر للطباعة – القاهرة
٢ – دجلاس توم – مشکلات الاطفال الیومیة – ترجمة اسحق رمزی، ط ٥ دار المعارف ١٩٨٢ – القاهرة.
٣ – رفعت، محمد – صحة الطفل – ط ٤ من منشورات دار المعرفة للطباعة والنشر ١٩٨٠ – بیروت – لبنان
٤ – دکتور سپوك – مشاکل أباء في تربیة الابناء – ط ١، ١٩٧٥، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر – بیروت.
٥ – جرجیس، ملاك – مشاکل اطفالنا النفسیة، من منشورات مجلة روز الیوسف المصریة ١٩٧٣
٦ – مجلة (پەروەردەو زانست) باللغة الکردیة العدد الخاص بالمصطلحات المدرسیة (١٤) ١٩٧٨
٧ – مصادر اخری.



«درەختە دێرینەکەی کوردستان»

# داربەڕوو

## Oak Tree Quercusشجرة البلوط

وەرگێڕان و ئامادەکردنی
کەمال جەلال غەریب

دار بەڕوو درەختێکی تایبەتە بە هەندێك وولآت لەوانەش کوردستان و بەریتانیا. نیشانەی ڕەقی و قایمی یە وەکوو لە قسەی نەستەقدا هاتوە: (دڵی لەبەڕووە --قلبه من بلوط)! وادیارە بەڕوو شایانی ئەم ناوەیە. تەختەکەی زۆر ڕەق و قایمە. ڕەگەکانی زۆر بە نو زەویدا دەچنە خوارەوە. تەنانەت بەهێزترین ڕەشەباش هەڵی ناتەکێنێت. داربەڕوو تەمەنی زۆر دێژە کەتەمەنی دەگاتە (١٢٠) ساڵ. تەختەکەی زۆر باش دەبێت. دەشێت لەوە زیاتریش بژی. دەڵێن تەمەنی کۆنترین داربەڕوو کە مابێت لەهەزار ساڵ زیاترە. ناتوانین بە ڕێگەی ژماردنی ئەڵقە ساڵانەیی یەکانی (الحلقات السنوية (Annual rings)تەمەنەکەی بزانین. چونکە بەر لە مردنی بەماوەیەکی درێژ لە گەشەکردن دەکەوێت. لە بەریتانیادا دوو جۆرو لە ئەورووپادا چەند جۆرێك لە بەڕوو هەیە. کۆی جۆرە جیاوازەکنی دەگاتە (٥٠٠). زوربەیان لەناوچە گەرمەکان ڕواون. هەمووشیان سەر بە ڕەگەزی (جنس) کویرکەسن (Quercus). کە بەشێوەیەکی گشتی. بەبەرە سەیرەکەید. کە پێی دەوترێت acorn. بە ئاسانی دەناسرێتەوە. لێرەدا باسی هەندێك جۆری بەڕوو دەکەین:-

١- بەڕووی گەڵا لاسکدار (البلوط المعنق (Peduncululate) ناوە زانیاری یەکەی (Quercus robur)ئەمەش بەڕووی ئاسایییە. لەبەریتانیاو زۆر شوێندا باوە لەوەدا لە بەڕووی گەڵایێ لاسك واتە دانیشتو (ورقة جالسة= (Sessile) جیاوازە کە لاسکێ گەڵاکەی (Leaf—stalk)کورتە. کەچی لاسکی بەرەکەی درێژەو بەرەکەشی سەرەکەی نووك تیژە. وشەی ڕوبەر=(Robur) لە لاتینیدا بە مانای «بەهێز» دێت.

٢-بەڕووی گەڵا بێلاسك (غير المعنق) Durmast oaksناوە زانیاری یەکەشی (Quercus petraea)[ کەم کەس هەیە جیاوازی لەنێوان ئەم جۆرەو ئەوەی پێشوودا بکات.

ئەمەیان بەرەکەی دانیشتووە واتە بێلاسکە، لەجیاتی ئەوەی کەهەر بەرێك لاسکێکی تایبەتی خۆی هەبێت. لەسەر لقەکە دانیشتووە، سەرەڕای ئەوەش باریك (مستدق (tapering) نووك تیژە (مدبب (Pointed) کەچی بە پێچەوانەوە لاسکی گەڵاکانی لە لاسکی گەڵای جۆرەکەی پێشوو درێژترن، لەبەر ئەوە بە ئاسانی دەتوانرێت ئەم دوو جۆرە درەختە، چی لە زستان بێ چی لە هاویندا، لە یەکتری جیا بکرێنەوە، چونکە گەڵاکان لە هاویندا هەن و لەزستانیشدا بەر.

٣-بەڕووی تورکی البلوط التركي (urkey oak)ناوە زانیارییەکەشی Quercus cerrisئەم درەختە سەربەناوچەی باشوری ئەوروپاو بولقانە Bolkanو لەوێوە براوە بۆ بەریتانیاو ناوچەکانی تری ئەوروپا، ئەمە خێرا گەورە دەبێت، بەڵام ڕەق تەختەکەی وەکوو هینی ئەوانی‌تر نیە، گەڵاکەی تەسك و نووك تیژە، کڵاوی بەرەکەی واتەجەوتەکەی (کؤوس الثمار (Accorn cups) مووداره.

٤-بەڕووی هۆڵم یان (جەرمەنی) Holmoak پێشی دەووترێت بەڕووی هەمیشە سەوز (دائم الخضرة (Ever green) ناوە زانیاریی یەکەشی .Quercus ئەم درەختە لەدیمەندا زۆر لەوانی تر ناچێت، تەنانەت بەزەحمەتیش دەزانرێت کە داربەڕووە بەڵام ئەگەر سەیری ژێر درەختەکە بکەیت ئەو بەرە (ثمرة (acorn دهبینیت) کە ڕەگەزی (کویرکەس) لە هەموو جیهاندا جیادەکەنەوە، ئەمانە درەختی ناوچەی دەریای ناوەڕاستن، دیمەنی گەڵاکەیان لە دیمەنی پێست دەچێت.

شێوەیەکی هێلکەیی (بيضوي (oval) یان هەیە، ڕەنگەکەیان سەوزێکی مەیلەو ڕەشە، لە زستاندا بەسەر دارەکەوە دەمێننەوە، تەختەکەی زۆر پتەوو قورسە. لەدروستکردنی کابینە (کابينة (Cabinet Corkoak دابەکاردێت.

٥ - بەڕووی تەپەدۆر (بلوط الفلين ناوە زانیاریی یەکەشیQuercus suber. ئەمیش جۆرێکی هەمیشە سەوزی‌ترە، لە باکووری ئەوروپادا دەڕوێت، بە تایبەتی لەئیسپانیاو پورتوگال و ئیتالیا هەروەها لە مەراکیشدا توێکڵە زۆر ئەستوورەکە لە درەختە زیندووەکە نەکرێتەوەو پارچە پارچە دەکرێت، دەبێت بەو تەپەدۆرەی (فلین (cork) کە لە بازاردا دەفرۆشرێت.

**سودەکانی تەختەی بەڕوو:-**

داری (تەختەی) بەڕوو زۆر قایمە. لە بەر ئەوەی کە ترشی تانیکی (حمض التانيك) (nnix× cid تیادایە زۆر بەرهەلستی ئاو دهکات. لە یەتی ژێر تەو- تەختەی ژێر هێڵی ئاسنین (عارضة= فلنكة السكة الحديدية **Railway sleeper**) ـ دروستکردنی گالیسکە گواستنەوەو فارگۆنی (عربة) **شەمەنەفەردا بەکردێت** هەروەها بۆ دروست کردنی کەلوپەلی ناو ماڵ (**کورسی و مێزو دۆلاب**... **هتد**) و بەرمیلی پێگەیاندنی (asks) مەیی برەندیدا **braandyبەکار دێت. هەروەها** خەڵوزێکی باشیشی لێ دروست دەکرێت.

**لە هەندێك وولآتدا بەڕوو بەشێوەی ئالیك دەدرێت بەبەراز.**

مازوو (عفص (Gall) بریتی یە لە گرێ یەك یە **کاری هەندێك مێرووی وورد** لەسەر ڕووەك پەیدا دەبێت. بەڵام **جۆرەکانی مازوو لە سەر داری بەڕوو گەلێك** زیاترە وەك لە سەر ڕووە کەکانی تردا. گرگلیش. (تفاحة البلوط (Oak apple





مازوویەکی زۆر چاکە، بریتی‌یە لە تۆپەڵێکی ئیسفەنجی سوور، بەکاری زەردەواڵەی Bior hiza–– پەیدا دەبێت مازووی قور قوشم (رصاص) یان مەرمەر (رخام)یش هەر لە سەر داربەروو هەیە، هەندێك مازووی بچووکیش لە سەرگەڵای داربەروو هەیە، هەندێك مازووی بچووکیش لە سەرگەلای تروو پەیدا دەبێت پێی دەووترێت مازووی پوولەکە یان سیچکە «عفصات الترتر(= spangle Galls-R.

## تەپەدۆر «فلین -COrk

ئەو تەپەدۆرەی کە لە بازرگانیدا بەکاردێت لە توێکڵی جۆرێکی تایبەتی لە بەروو درووست دەکرێت، ناوە زانیاری یەکەی کویرکەس سوبێر Quercus suber )هەندێك جار ئەستووریی ئەو توێکڵە ٣سم یان زیاتر دەبێت، لە درەختە زیندووەکە دەکرێتەوە، دوای ماوەیەك درەختەکە توێکڵی تری بۆ دروست دەبێتەوە، یەکەم بەرهەمی تەپەدۆر زۆر باش نیە، لە دروستکردنی حەسیری تەپەدۆردا بەکار دێت، بەڵام تەپەدۆری باش لە تازە بوونەوەی توێکڵەکەوە دەبێت، دوای لێ کردنەوەی توێکڵی یەکەمو ئەوانەی دوای ئەو، چونکە ئەم کردارە هەر (٧) حەوت ساڵ جارێك دووبارە دەبێتەوە.

تەپەدۆری ئاسایی لە هەزارەها خانەی (یلخە (Cell) ووردی پڕ لە هەوا دروستبووە، ئەمەش وا لە تەپەدۆر دەکات کە بە ئاسانی سەر ئاو بکەوێت، هەر لە بەر ئەوەشە کە تەپەدۆر لە دروستکردنی سەرقاپی بوتڵو حەسیری تەپەدۆرو تەوقی رزگار بوون «طوق النجاة (Life buoy)) وکەڵەك (طوف= (raft و بەری (ناو پۆش) شەپقەو بنی پێڵاودا بەکار دەهێنرێت.

**بەروو لە مێژوودا:–**

بەروو رۆڵێکی گرنگی لە مێژووی هەندێك دەوڵەتاندا دیوە، بۆ نموونە لەبەریتانیادا، ئەو پاپۆرە تەختانەی کە هێزی دەریایی پشتی پێی دەبەستن لە ماوەی نێوان ئەرمادا[1] Armadaوترافلگار[2] (الطرف الأغر (Trafalgar) دا لە تەختەی دار بەروو دروست دەکران، لێرەدا تەنها هەر پارچە تەختەی راستیان بەکار نەدەهێنا، بەڵکو لقەکانیش (تفرع (Fork) و ئەمەش دەبووە هۆی قایم بوونی پەیکەری کەشتی‌یەکە.

جاران دارستانی کێنت Kentو سەسێکس Sussex لە بەریتانیادا، دارستانێکی مەزن بووە لە دار بەروو، لەبەر ئەوەی کە کانەکانی ویلدن Wealdenکەرەسەی خاوي ئاسنیان تیا دۆزرایەوە، دار بەرووی ئەم دارستانە بڕانەوە بۆ دروستکردنی خەڵووزی پێویست بۆ تواندنەوەی ئاسنەکە، چونکە تواندنەوەی کەرەسەی خاوی ئاسن بە خەڵووزی کۆك فحم الكوك (Coke) رێگەیەکی تازە بابەتە هەتا ئەم نزیکانەش پیشە سازیی دەباخ‌کردن(دباغة (Tanning) پشتی بەو مادەی (Tannin) تانینە دەبەست کە لە توێکڵی داری بەرووداهەیە هەروەها ئەو تانینەی کە لە مازووی بەروو دەردەهێنرێت پێك هێنەرێکی گرنگە لە پێکهێنەرەکانی مەرەکەب.

**پۆلێنی (تصنیف=** (Classification) بەروو:

جۆر: النوع robur وIlex

رەگەز: الجنس Quercus

پەل: الفصیلة Fagaecae

پلە: رتبة (الزان) Fagales

خێزان: العائلة ذوات الفلقتین، دوولەتکەیی‌یەکان Dicotyledones

بەش: القسم مغطاة البذور: تۆو داپۆشراوەکان Angiospermae

جیهان: النباتیة (رووەك) Planr kingdom

**رەگەزی بەروو (جنس البلوط) .C. Ouercus .L.**

لەم رەگەزەدا (٢٠٠–٣٠٠) جۆر رووەك هەیە، سوود لە تەختەکانیان وەر دەگیرێت، لە نیوەی باکووریی خڕۆکی زەویدا بە تایبەتی لە ئەمریکای باکووریی و خۆر هەڵاتی ناوەراستو یابانو باکووری ئەفریقاو ئەندنوسیادا دەروێت، بەشێوە دارو دەوەنە گەڵاکەی ساکارو وەریو یان هەمیشەیی، ئاڵوگۆرە قەراغی رووەکەکە گەڵاکەی پلپل یان ددانداره. تاكماڵەیە (احادي المسكن)[3].

گوڵەکەی تاك رەگەزە «أحادي الجنس»[4].

بەرەکەی لە بەری فنق (بندقیة) دەچێت. ئەم درەختە بە قەد پاڵی چیاکانی

ـ کووری (کوردستانی) عیراقەوە دەڕوێت لە بەرزاییەکی زۆردا کە هەندێك جار دەگاتە (٦٠٠–٢٠٠٠) مەتر لە ڕووی دەریاوە، دارستانی بەڕوو تەنها دارستانێکی سەرەکییە لە عیراقدا.

تەختەی بەڕوو سەرچاوەیەکە بۆ زوربەی کەلوپەلی دانیشتوانی ناوچەکە بە تایبەتی لە دروستکردنی خانووکەلوپەلی ناوماڵ و کەپردا. دارستانی بەڕوو هەمیشە دووچاری برینەوەو سوتان دەبێت.

لە عیراقدا (٣) جۆر لە ڕەگەزی بەڕوو هەیە:–

١–مازوو (العفص Quercus in fectoria

٢–بەڕوو (بوط) .Qaegilopsl

٣–بەڕووی لوبنانی (داندار) .Q.Libani oliv

ئەم سێ جۆرە لە داری بەڕوو قەبارەیەکی مام ناوەندیان هەیە، لە خاکێکی بەردەلانیدا دەڕوێن، ئەگەر لە ناوچەی ووشکانیدا بن قەبارەیان بچووك دەبێت بەلام لە ناوچەی شێدارو بەپیتدا بە ڕووی Q. aegilops لەو ناوچانەشدا بە شێوەی دارستان بروێت کە (٦٠٠–٩٠٠) مەتر لە ڕووی دەریاوە بەرزن، ئەم جۆرە بەرگری باری ناهەمواری وەکوو سەرماو وشکانی دەکات.

جۆری سێ هەمیان واتە لوبنانی کەمترە باوە لە بەرزایی زیاتر لە (١٢٠٠) مەتردا دەڕوێت (جگە لە ناوچەی سوارە تووکە چونکە ئەمە پیویستی بە شێیەکی زۆرو پلەی گەرمی نزم هەیە.

**بەڕوو (بلوط. Q.aegilops L:E(Oaktree**

یەکێکە لە درەختەکانی دارستانەکان، درەختێکی قەبارە مام ناوەندییە، هەندێك جار بەرزاییەکەی دەگاتە (١٥) مەتر، لق بە هەموو لایەکدا دەهاوێژێت، گۆیکەکەی زیبوی مەیلەو خۆڵەمێشی یەو تیسکنە. گەلاکەی ساکارو ئالو گۆرو وەریوو سافە، شێوەکەی هێلکەییە قەراغی گەلاکەی ددانداره بەرەکەی دانیشتووە واتە لاسکی نیە یان لاسکێکی کورتی هەیە، بە تەنها یان بە شێوەی هێشووە، هەر هێشوویەك (٢–٣) بەری پێوەیە، بە توێکلێکی ئەستوور داپۆشراوە، بەرەکەی کلاوێکی (جەوت) گرنج گرنجی پێوەیە لە درك دەچێت.

هەندێك جار درێژی بەرەکەی دەگاتە (٤–٦) سم، لە مانگی ئازارو سەرەتای نیساندا گوڵ دەکات و بەرەکەی لە مانگی تشرینی یەکەم و تشرینی دووەمدا پێ دەگات، لە ماوەی دوو ساڵ یان چوار ساڵ جارێکدا بەرێکی باش دەدات. تەختەکەی زەردی مەیلەو قاوەیی یە، ڕەق و قایمە، بەرهەلستی ڕزین دەکات، بە زۆری بۆ دروست کردنی خەلووزو بۆ سووتەمەنی و دروستکردنی کەلوپەلی کشتوکاڵی بەکاردێت. گەلاو لقە ناسکەکانی بە شێوەی ئالیك دەدرێت بە ئاژەڵ. مادەی گەزۆ لە گەلای ئەم درەختە دەگرێت بۆ دروستکردنی حەلوای گەزۆ بەکار دێت. گەزۆ لەئەنجامی تووشبوون بە هەندێك مێروو پەیدا دەبێت. بەری ئەم بەڕووە دەخورێت یان دەهارێت و. لە گەڵ ئاردی گەنمدا تێکەڵ دەکرێت و بۆ دروست کردنی نان بەکار دێت. ئەم جۆرە بەڕووە لە ناوچەکانی تری جیهانیشدا هەیە وەکوو باشووری ئیتالیاو ناوچەی بولقان و تورکیاو سوریاو فەلەستین و ئێران، هەندێك جۆر لەم بەڕووە کلاوەکەی لە ڕەحەتی دەچێت بەرەکەی لوولەیی و پانە.

بەڕوو نزیکەی ٢٨ جۆری هەیە لەمانەش:–

١–بەڕووی ئاویی (بلوط مائي aguatic oak).

٢–بەڕووی ڕەش (بلوط أسودblack oak ).

بەڕووی بەرگەورە (بلوط کبیرالثمر **buroak**)

٣–بەڕووی سوور (بلوط أحمر championoak) گەلاکەی لە پایزدا سوور هەڵدەگەڕێت.

٥–بەڕووی پورتەغال (بلوط البرتغال– portuges oak= dyers oak

٦–بەڕووی هەمیشە سەوز evergreen= holly oak

٧– بەڕووی مازوو.galloak (Quercus— Lustanica)

٨–بەڕووی تەپەدۆر= بلوط الفلین=بەش= Quer cus suber = Cork oak

درەختێکی هەمیشە سەوزە لە ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا دەڕوێت توێکڵەکەی ئەستوورە بەلام سوکە بریتییە لەو تەپەدۆرەی کە بۆ سەر قاپی بوتڵ و گەلێك مەبەستی تر بەکار دێت.

٩–بەڕووی قرمزی= (سندیان= بلوط قرمزی) scarlef oak = Kermes oak

١٠ – بەڕووی ڕومی = (ملول = بلوط رومی) Valoni a oak

**هەندێك تێبینی لە سەر دار بەڕوو:–**

١ – قرمز= لعل= قلة النباتات= حشرة المغافیر Ker mes - Co chineal insect)
l licis)

مێروویەکی توێکڵدارە لە سەر جۆرە دار بەڕوویەك دەژی پێی دەووترێت= Lecanium— ilicis زیان بە درەختی وەکوو بەڕوو پرتەقاڵ و سێوو هەنجیر قۆخ و زەیتوون و بەهی و هەڤریسك و مێوو بادەم دەگەیەنێت. جوری تریش هەیە لە سەر ڕووەکی هەنجیری دڕکاویی واتە سوبیر coccus cacti دەژی، ئەم جۆرەیان پێی دەووترێت کۆچینیل Cineal ئەم مێرووە لە ولاتی هیندۆراس و دورگەکانی کەناری و مەکسیك و پیرۆو ئوستەرالیاو جەزائیر هەیە. لە هەندێك ولاتدا ئەم مێرووە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك پەروەردە دەکرێت بۆ بەدەست هێنانی ئەو ڕەنگە سوورە مێرووەکە لە ڕووەکەکانەوە کۆدەکرێتەوەو لە شوێنی تایبەتیدا، لە هێلانەی پووشدا دەپارێزرێت، هێلانەکانی دەبەسترێن بە ڕووەکی ترەوە بۆ ئەوەی مێیەکانی ئەم مێرووە بە ئاسانی هامووشۆی ئەو ڕووەکە بکەن بۆ خواردن.

دوای (٣) سێ مانگ مێرووەکان بە کاری ئاوی گەرم یان هەتاو یان وشك کردنەوە دەمرێنرێن، ئینجا دەهاڕرێن، هاراوەکە بریتییە لە ڕەنگە سوورەکە، وەکوو زانراوە کە (١٥٤) هەزار دانە مێروو یەك کیلۆ غرام لەو ڕەنگە واتە (کۆچینیل) دەدات.

٢–تەنها لە ئەمریکادا ٧٥ جۆری جیاواز لە بەڕوو هەیە.

٣–هەندێك جار دار بەڕوو دەگاتە بەرزیی (١٥٠) پێ واتە نزیکەی (٤٠) مەتر.

٤ - گیانداری سمۆره حەز بە بەری بەڕوو دەکات لە پایزدا کە دەوەرێتە خوارەوە کۆیان دەکاتەوە لە ژێر بەردو گەڵاو کونو کەلەبەردا دەیان شارێتەوەو لە زستاندا دەیانخوات.

٥-توێکڵی داری بەڕوو لە ٦-١١٪و بەڕوو جەوتەکەی لە ٢٦-٣٠٪ مادەی دەباخکەریان تیادایە، کە بە زۆری بۆ دەباخکردنی پێستەی ئەستوور بەکاردێت.

## بەڕوو لە کوردەواریدا[٥]

ئەوەی شایانی باسە کە میللەتی کورد لە دێر زەمانەوە بەیوەندی‌یەکی بەهێزی لەگەڵ داربەڕوودا هەبووە، سودی لە قەدو لقەکانی وەگرتووە لە دروستکردنی کەلوپەلو ئامرازو خەڵوزو داری سوتانداو گەڵاکەی بۆ ئالیکی ئاژەڵو وڵاخ بەکار هێناوەو بەرەکەی بۆ خواردنو جەوتەکەی بۆ پێستە دەباخ‌کردن، لە سەرماو بارانو گەرمادا خۆی لە ژێریدا پاراستوە. دارستانی بەڕووی کردووە بە سەیرانگەو[٦] گوریسی بەسەر لقەکانیدا هەڵ خستووەو دیلانێ‌ی لەسەر کردووە.

چەندەها ئاهەنگی لە ژێریاندا گێڕاوە هەرچەندە کە هەندێك جاریش لەبەر باری نەفامی‌و هەژاری خۆی دڵ ڕەقانە پەلاماری داونو لە بن‌وبێخدا بڕیونەتی‌یەوە لەگەڵ ئەوەشدا چەندەها مرۆڤی کوردی زاناو دڵسوز توانیویانە، لە هەندێك شوێندا، بە بیانووی ئایینیی‌یەوە، زۆر لە داربەڕووەکان بپارێزنو ڕێزیان لێ‌بگرن، ئەویش بە ناشتنی تەرمی پیاوچاکان لە ژێریاندا و دروستکردنی پەرژینو وشکە کەڵەك بە دەورو‌پشتیاندا بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە ئەو داربەڕووانە، بەتایبەتی ئەوانەی کەوتوونەتە سەر شەفامو ڕێگەی نێوان شارو گوندەکان، گەلێك گەورەو مەزن بوونو بوونە تە شوێنی حەوانەوەی مرۆڤو ئاژەڵی ئەو ناوچانە، جگە لە جوان‌کردنی دیمەنەکانیانو کورد ناوی بەڕووی لە هەندێك گوندو گەڕەك ناوە وکوو: داربەڕوولە، داربەڕووەکان... هتد. کەم درەختیش هەیە لەسەر ئەم زەوی‌یە وەکوو بەڕوو بەرو بەرهەمی زۆربێت. زۆرمان ئەوەتان لەبیرە کە چۆن جاران، لە کاتی منداڵیماندا، بە ڕوومان دەخستە ژێر ژیلەمۆی ئاگری مەقەڵی یەوە بە مەبەستی پیشاندنو خواردنی، هەندێك جار چەند دانەیەك لەو بەڕووانە دەتەقینو دەردەپەڕینو دەیان دا لە سەرو گوێلاکی دانیشتووەکان، ئەمەش دەبووە مایەی پێکەنینو گاڵتەوگەپ. بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دار بەڕوو چ دایکێکی دڵسۆزو بەپیتو بەرەکەتە بۆمان، دەبا ئێمەش هەمیشە بایەخی پێ‌بدەین و لێ پارێزین .

موفتی پێنجوین دەفەرموێت:-

من کەدار مازووم هەبێ تا هەژدە بەر بگرێ بەریز

ئیتر بۆفیکری گوڵاڵەو داری هیندستان ئەکەم ئەم بەرانەش وەکوو:-

بەڕووو، مازوو، گەڵا، بەرەگەڵا، سیچکە، گەزۆ، قشکە (بۆبێستو خۆشی‌کردن) مۆتکەدار، کەڵنج، دەموکە (عەلەفی‌کەروێشکە)، لمۆزە بەرازە، مرو، قچو، لوتەوانە، گزگڵ، تسکل، عەلەفە، جەوت. کورد سێ ناوی میللی بۆ سێ جۆر لە بەڕوو داناوە:-

بەڕووار، مازووار، وێوڵ.


سەرچاوەکان:-

1—The ency cgopedio of the plant kindom Botanical editoy.
Anthony Huxley.
printed in Belgium
Publishcd - y Hamgon
London. New Yourk.. sydne. Toronto
Page: 139

٢-کتێبی «تصنیف الغابات»
تألیف الدکتور داود محمود داود کلیة الزراعة والغابات / جامعة الموصل. دار الکتب للطباعة والنشر ١٩٧٩ صحیفة ٢١١، ٢١٧، ٢١٨، ٢٢٤، ٢٢٦، ٢٢٩، ٢٣٧

٣-گۆڤاری (المعرفة) العدد «١٠٣»
الناشر شرکة ترادکسیم/ شرکة مساهمة سویسریة (جنیف) ص ١٦٤٠-١٦٤١

٤-معجم الشهابي في «مصطلحات العلوم الزراعیة» إنگلیزی- عربي/ مع مسرد عربي- إنگلیزی
إعداد أحمد شفیق الخطیب. مکتبة لبنان- بیروت/ الطبعة الاولی

٥ - الجمهوریة العراقیة/وزارة التربیة والتعلیم الافات الزراعیة/
للصفوف الثالثة للأعدادیات الزراعیة

٦ - کتاب (علم النبات) للصف الخامس العلمي/وزارة التربیة الطبعة التاسعة/١٩٨١/ ص١٥٥


### پەراوێزەکان

١-ئارمادا:- گەلەگەشتی‌یەك‌بوو، لەساڵی ١٥٨٨دا، ئیسپانیا ناردی بۆ جەنگاندن لە گەڵ ئینگلیزەکان، بەڵام ڕەشەباو گەلەکەشتی ئینگلیزەکان زوربەیان لەناوبرد.

٢-ترافلگار: نووکێکە لە زەوی ئیسپانیا بەسەر زەریای ئەتڵەسیدا دەڕوانێ، دەکەوێتە باکووری خۆر ئاوای تەنگاوی (جبل طارق)ەوە، لێرەدا لە ساڵی ١٨٠٥زدا، ئەمیراڵی ئینگلیزی بەسەر گەلە کەشتی فەڕەنسی‌و ئیسپانیدا زاڵبوو.

٣ - ڕووەکی تاك ماڵە (وحید المسکن (Monoeciovs)ئەو ڕووەکەیە کە گوڵی‌نێر(زهرة سداتیة) وگوڵی مێشی (زهرة أنثویة)ی تیادابێت، هەر یەکە لە سەر لاسکێکی جیاواز وەکوو لە ڕووەکی گەنمە شامیدا.

٤-گوڵی تاك ڕەگەز (أحادي الجنس (Unisexvag)ئەو گوڵەیە کە ئەندامی نێر یان ئەندامی مێ تیادابێت، واتە هەردووکیانی لە هەمان کاتدا تیا نەبێت، وەکوو گوڵی دار خورما.

٥- نووسەری ئەم ووتارە.

٦-ناوی‌هەندێك لەو سەیرانگەیانەیان کە لە دارستانی بەڕووە هەندێکیان گۆڕی پیاوچاکانیان تیادایە:-

پیری شەوکێڵ (سیتەك‌چوارتا)پیری کۆکە (ویڵەدەر- سلیمانی) پریەمەگرون (سلیمانی) شێخی باڵەکان (حاجی هومەران- هەولێر) پیراڵك (چوارتا) میری سور (خورماڵ) إبراهیم خەلیل (زاخۆ) کۆتەڵ (سورداش) حەوتەوانان (پێنجوین) هەیبەت سوڵتان (کۆیە) کۆکە ڕەشە (قەرەداخ).

Q

روشنبیری‌ی کشتی


سالا مۆلی
کردستان
۱۳۱۵
کردلری ایقاظ و تعمیل صنایعه تشویق ایچون شیمدیلك
اون بش گونده بر نشر اولنور کردجه غزته در
روز پنجشنبه‌ده ۳۰ ذوالقعده سنه ۱۳۱۵ پنجشنبه فی ۹ نیسان سنه ۱۳۱۴

عبد الله بابکر حمەاغا

# رۆژنامەو ڕێکخراوە کوردی‌یەکانی تورکیا لە سەردەمی یەکەم جەنگی جیهانیدا

یەکەم جەنگی جیهانی گۆڕانکاری‌یەکی ڕامیاری‌و کۆمەلأیەتی لە پێکهاتنی میللەتاندا بەرپا کرد. لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاری‌یانەدا چەند وولأتێك بەسەرۆکایەتی چینی بورژووا دامەزران. ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش لە خاکێکی فراوان‌و چەند خەڵکێك پێك هاتبوو کە لە بارەی نەتەوایەتی‌و ژیانی کۆمەلأیەتی‌یەوە لەیەکتر جیاواز بوون.

ئەو گۆڕانکاری‌یانەی لەو کاتەدا لە جیهاندا ڕووی دەدا بوون بەهۆی وریا بوونەوەی ئەو گەلانەی لەژێر دەسەلأتداری‌یەتی عوسمانیدا دەژیان. لەو سالأنەشدا بوو کە ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی بەرەو لەناوچوون دەچوو. ئەو میللەتانەی لەژێر دەسەلأتداری‌یەتی عوسمانیدابوون، هەریەکەو هەولیان دەدا کە سەربەخۆیی بۆخۆیان وەدەست بهێنن. لەبەرئەوە چەند ڕێکخراوێکی میللی‌یان دامەزراند. گەلی کوردیش یەکێك بوو لەو گەلانەی کە هەولی ڕزگار بوونیان دەدا.

لەو سەردەمەدا لە ئەستەنبوڵ چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی دەرچوون‌و چەند ڕێکخراوی کوردی دامەزران وە کوردەکانیش لەدەوری ئەو ڕێکخراوانەدا کۆبوبوونەوە. یەکێك لەو ڕێکخراوانە کورد تعالی جمعیتی «کۆمەڵەی پێشخستنی کورد» بوو. ئەو کۆمەڵەیە لەدوای شەڕ ڕاگرتنی مۆندرۆس،لە ئەستەنبوڵ دامەزرا. یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەو ڕێکخراوەیە، مەلا سعید بوو کە لەدواییدا بە سعیدی نورسی ناوبانگی دەرکرد. ئەوانی تریش میکیسلی هەمزەو خلیلی خیالی بوون[1]. شەڕ ڕاگرتنی مۆندرۆس لە ۳۰ی تەشرین یەکەمی‌سالی ۱۹۱۸ دا بەسترا. لەدوای ئەم شەڕ ڕاگرتنە لەشکری دەولەتی عوسمانی بلأوەی پی‌کرا وەئەو گەلانەی لەژێر فەرمانڕەوایی عوسمانیدا بوون لەگەل

چارەنووسی خۆیان بەجیٚ‌هێڵران .

ئەو ڕێکخراوانەی لە دوای شەڕ ڕاگرتنی موندرۆس دامەزران ، دەوڵەتی ئەو کاتە بەرێکخراوی گێرەشێوێن ناوی دەبردن . ئەمەش لە چەند نووسراوێکی مێژوویدا دەریان خستوە . بەڵام شتێکی ئاسایی بوو لەدوای شەڕ راگرتنی مۆندرۆس کاتێ کە لەشکرو دەوڵەتی عوسمانی بڵاوەی پی‌کرا ، ئەو گەلانەی کە لە ژێر فەرمانڕەوایی عوسمانیدا دەژیان دەیانەویست چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن . لە ئەنجامی ئەوەدا هەر یەکەو چەند ڕێکخراوێکی میللی‌یان دامەزراند . پرۆفیسۆر دوکتۆر تاریق زافەر تونایا[٢] لە کتێبی «پارتی‌یە سیاسی‌یەکانی تورکیا» دا بەم جۆرە باسی کورد تعالی جمعیتی کردوە : (لە ساڵی ١٩٠٨ دا ڕێکخراوێکی کوردی بەناوی «کورد تعاون جمعیتی» دامەزرا . ئەمەش بریتی بوو لە ڕێکخراوێکی چاکەخوازی‌و بەیاسای بنەرەتی‌و ئایدیۆلۆژی عوسمانی‌یەوە بەسترابوو . بەڵام کورد تعالی جمعیتی کە لەدوای شەڕ ڕاگرتنی مۆندرۆس ، لەو ساڵانەی ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی نزیکی لەناوچوون بوو دامەزرا ، بریتی بوو لە ڕێکخراوێك کە کوردی بە میللەتێکی جیاواز دادەناو ڕێکخراوێکی نەتەوەیی بوو وە مەبەستی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بوو) .

**ئەوە هەڵسەنگاندنێکی زۆر بەجیٚ بووە ، چونکە شتێکی ئاسایی بوو لەدوای شەڕ ڕاگرتنی مۆندرۆس ، ئەو میللەتانەی کە لەژێر فەرمانڕەوایی عوسمانیدا بوون هەوڵ بدەن قەوارەیەك بۆ خۆیان پێك‌بهێنن‌و ، لەدەورەی ڕێکخراوەکانی خۆیاندا کۆببنەوە .**

**کورد تعالی جمعیتی ، کارێکی گەورەی هەبوو بۆ پتەوکردنی بیروباوەری نەتەوایەتی . وەئەو ڕێکخراوەیە ڕۆڵێکی باڵاشی هەبوو بۆ پێکهاتنی جووڵانەوەی قۆچگیری . بەڵام لەبارەی ڕێنمایی‌و بەڕێوەبەرایەتی‌و بەردەوام بوونی جووڵانەوەکەوە ئەو کارێگەری‌یەی نەما ، ئەویش لەبەر چەند جیابوونەوەیەك بوو کە لەناو ڕێکخراوەکەدا ڕووی‌داو هەندێك لە ئەندامەکانی چوون بۆ دەرەوەی وڵات‌و هەندێکی تریشیان بەهۆی شەڕی یەکەمی جیهانی‌یەوە پەیوەندی‌یان لەگەڵ جووڵانەوەکە نەما .**

پرۆفیسۆر تاریق زافەر تونایا بۆزانینی ئەندامەکانی ڕێکخراوەکە ، گۆڤارەکانی ئەو کاتەو ، بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوەکەی پشکنیوەو چەند ناوێکی دەست کەوتوە . بەپی‌ی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەدوای یەکەم کۆبوونەوە ئەم کەسانەی خوارەوە بۆ بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکە هەڵبژێرراوون :

سەرۆك : سەید عبد القادری سەید عبد اللەی شەمدینانی . یەکەم جێگری سەرۆك : ئەمین عالی بەدرخان . دووەم جێگری سەرۆك : فەریق فؤاد پاشا . نووسەری گشتی : فەریق حمدی پاشا . ژمێریار : سەید عبد اللە . ئەندام : محمد علی بەدرخان ، محمد امین بێگی سلێمانی‌یەیی ، مامۆستا علی ئەفەندی ، شفیق ئارواسلی ، شکری بابانزادە[٣] ، فؤاد بابانزادە ، فتح اللە ئەفەندی ، محمد شکری سکبان .

**هەرچەندە لەو کاتەدا هەستی نەتەوایەتی بەتەواوی لەگەشەدا نەبوو ، بەڵام کورد تعالی جمعیتی لە ماوەیەکی کەمدا پەرەی‌سەندو بڵاوبۆوە .**

لە دوای تەواوبوونی ئیش‌وکاری یاسایی ڕێکخراوەکە ، سەرۆك سەید عبد القادر لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان‌و سعیدی نورسی‌و محمد شکری سکبان لە ئەستەنبوولّ سەریان لە قۆمیسەری ئەمەریکی‌و فەرەنسی‌و ئینگلیزی‌داو لەبارەی ئامانجی ڕێکخراوەکەوە گفتوگۆیان کرد . لەو چاوپێکەوتنەدا سعیدی نورسی بە قۆمیسەری ئەمەریکی ووت کە پێویستە وڵاتێکی کوردی دابمەزرێ‌و سنووری تاکو دەریا بیٚ بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی تردا هەبیٚ ، بەڵام قۆمیسەری ئەمەریکی ڕای لەسەر ئەو داخوازی‌یە نەبوو . ووتی بەپی‌ی یاسای ویلسون‌ی سەرۆك کۆمار ، بڕیاردراوە کە کۆماری ئەرمەنستان دابمەزرێ‌و بەشی زۆری کوردستانیش لە چوارچێوەی ئەو کۆمارەدا بیٚ . سعیدی نورسی‌یش بەم جورە وەڵامی قۆمیسەری ئەمەریکایی دایەوە : «ئەگەر کوردستان لە قەراغی دەریادا بوایە بەکەشتی‌یە جەنگی‌یەکانتان ئەو کارەتان وەئەنجام دەهێنا ، بەڵام لەبەرئەوەی کەشتی‌یە جەنگی‌یەکانی ئێوە ناتوانن بۆ شاخەکانی کوردستان بچن ، ناتانەویٚ ئەو کارە جی‌بەجیٚ بی‌ٚ».

**بە هەوڵدانی چەند لاوێك کەسەر بەرێکخراوی هێڤی (هیوا) بوون ، لە ساڵی ١٩١٨دا لە دیاربەکریش لقێکی کورد تعالی جمعیتی کرایەوە کە لەناو خەڵکی‌دا بە (یانەی کورد) ناوی دەرکردبوو .**

لەیەکەم کۆبوونەوەی ئەم ڕێکخراوەدا ، جمیل کازم پاشازادە بەسەرۆك‌و دوکتۆر جودت بێگ بە جێگری سەرۆك‌و کریم جرجیس زادە بە ژمێریار هەڵبژێرران . عمر بێگ‌و فیکری بیگ‌و اکرم بیگ‌یش بوون بە ئەندام‌و بەدەستەی بەڕێوەبەران هەڵبژێرران . لە یانەی کورددا کە نزیکەی هەزار ئەندامی هەبوو چەند ناوێکی بەناوبانگ وەکو دوکتۆر فؤادو پارێزەر محمد مهری‌ومامۆستا حمدی ئەندام بوون .

بەڵام لەدوایدا کورد تعالی جمعیتی لەناو خۆیدا دابەش بوو. گرووپێك هەبوو کەجیاوازی‌لە نێوانیانداو نێوان سەرۆك سەید عبد القادر پەیدابووو بیرو ڕایان لەگەڵ ئەو نەدەگونجا، لەبەرئەوە لە کۆمەڵەکە جیابوونەوەو بەناوی «تشکیلاتی اجتماعیة» وە ڕێکخراوێکیان دامەزراند. ئەو گرووپە دەستەیەکی بەڕێوەبەرانی پێك‌هێنا کە بریتی بوون لە دوانزە کەس. ئەمین عالی بەدرخان‌و شکری بابان‌زادەو دوکتۆر عبد الله جودت‌و اکرم جمیل پاشا لەو دەستەیەدا ئەندام بوون.

لە دوای ساڵی ١٩٠٨دا ڕێکخراوی «لاوە تورکەکان» و چەند ڕێکخراوی نەتەوایەتی تورکی دامەزران. پاشان میللەتەکانی تریش کە لەناو ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانیدا دەژیان، چەند ڕێکخراوێکیان بۆ خۆیان پێك‌هێنا. یەکێك لەوانە ڕێکخراو ی «هێڤی» بوو کە لەلایەن کوردەکانەوە دامەزرا. ئەو جۆرە ڕێکخراوانە لە ئەستەنبوڵ لەناو خوێندکاران‌و ڕۆشنبیراندا گەلێك پەسند کراو بوون. کۆمەڵەی هێڤی لە ساڵی ١٩١٢ دا کەوتە شێوەیەکی ڕەسمی‌یەوە. یەکەم ڕۆشنبیرو لایەنگری هێڤی، دوکتۆر محمد شکری سکبان بوو. هەر ئەویش بوو هەموو پێویستی‌یەکی دارایی ئەو ڕێکخراوەی جێ‌بەجێ دەکرد. عمر جمیل پاشا یەکەم سکرتێری هێڤی بوو. لقی یەکەمی لەلایەن تەیب علی‌یەوە لە ئەرزەڕۆم‌دا کرایەوە. (تەیب علی، لەدوایدا لە شۆڕشی شێخ سعیددا هاوبەشی دەکاو دەبێتە لێپرساوی کۆمەلەی خۆیبوون).

ڕێکخراوی هێڤی لە ساڵی ١٩١٣دا بەناوی (ڕۆژی کورد) ەوە گۆڤارێکی دەرکرد. ئەو گۆڤارەش لەلایەن عبد القادر بێگەوە بەڕێوەدەبرا کە خەڵکی سلێمانی بوو. بەشی تورکی‌یەکەی لەلایەن اسماعیل حقی بابان‌زادەو خاوەنی گۆڤاری اجتهاد دوکتۆر عبد الله جودت‌و ممدوح سلیم ڤانلی‌و یوسف زیا بیتلیسلی‌و کەمال فەوزی‌یەوە، بەشی کوردی‌یەکەشی لەلایەن نجم الدین حسین کەرکوکی‌و عبد الکریم سلێمانی‌یەیی‌و حمدی میکیسلی‌یەوە ئامادە دەکرا. پاشان گۆڤاری ڕۆژی کورد بەڕەسمی داخراو ڕێکخراوی هێڤی بەناوی (هەتاوی کورد)ەوە گۆڤارێکی تری دەرکرد.

بەدەست پێکردنی یەکەم جەنگی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤دا، بەڕێوەبەران‌و لێپرساوانی هێڤی بوون بەسەرباز لەبەرئەوە گۆڤارەکە بۆ ماوەیەك لەبڵاوکردنەوە وەستا بەڵام لەکاتی جەنگی جیهانیدا بەشێوەیەکی ڕێك‌وپێك کۆنگرەکانیان دەبەست. لەوکاتەدا سەید عبد القادرو ئەو خوێندکارو کرێکارانەی لە ئەستەنبول بوون بەپارە یارمەتی ڕێکخراوەکەیان دەدا. لەدوای ئەوە ڕێکخراوی هێڤی گۆڤاری (ژین)ی دەرکرد. ئەو گۆڤارەش پاشان بوو بەئۆرگانی تەشکیلاتی اجتماعیة، ئەو گرووپەی کە لە کورد تعالی جمعیتی جیابووبوونەوە.

لەو سەردەمەدا پیاوێکی بەناوبانگ هەبوو ئەویش حاجی موسای سەرۆکی عەشیرەتی کۆرچیخان بوو کە یارمەتی‌یەکی زۆری ڕێکخراوی هێڤي دەدا. حاجی موسا بەم ووتەیە ناوبانگی دەرکردبوو: «ئەگەر لاوی کورد کوورەیەك دروست بکەن ئێمە ئامادەین ببین بە دارو خۆمان لەو کوورەیەدا بسوو تێنین».

### پەراوێزەکان

(١) خلیلی خیالی، خەڵکی قەزای موتکی‌ی سەر بە پارێزگای بیتلیس بوو وەلە عەشیرەتی مۆدان بوو. زمان زانێکی شارەزا بوو. لەگەڵ زیا گوێکئاڵپ کە خەڵکی دیاربەکر بوو، لەسەر ڕێزمان‌و فەرهەنگی کوردی کاری کردبوو. زیا گوێکئاڵپ کاتێ کە لە ئەستەنبوڵ قوتابی بوو لەسەر بیروباوەڕی کوردایەتی‌و پێشکەوتنخوازی لە قوتابخانە دەریان کردبوو ئەویش ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ دیاربەکرو ئەو نووسراوانەی کە تایبەت بوون بە زمان‌و فەرهەنگی کوردی‌یەوە لەگەڵ خۆی هێنانەوە.

کە لە ساڵی ١٩٠٨دا لە سەلانیك کۆنگرەی لاوە تورکەکان بەسترا، زیا گوێکئاڵپ بە سیفەتی نوێنەری دیاربەکرەوە هاوبەشی لە کۆنگرەکە کرد بەڵام ئەو بیرو باوەڕەی لەکاتی قوتابیەتی‌دا هەیبو گۆڕاو هەڵگەڕایەوە تەنانەت بوو بە لایەنگرێکی تۆرانی. ئەو نووسراوانەیشی کە هێنابوویەوە بۆ دیاربەکر، کاتێ خلیلی خیالی داوای لی‌کرد نەیدایێ‌و سووتاندنی. بەڵام پێش ئەوەی هەڵبگەڕێتەوە چەند نووسینێکی بڵاوکردبۆوە وەهەتا ئێستاش هەر ماوە وەکو کتێبی «لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەربارەی عەشیرەتە کوردەکان» و چەند ووتارێکی تر.

سعیدی نورسی لە یەکێك لە نووسینەکانیدا بەم جۆرە باسی خلیلی خیالی کردووە:

«خلیلی خیالی ئەفەندی، یەکێکە لە دڵسۆزەکانی گەلەکەمان. ئەو دڵسۆزی‌یەی بە خزمەت کردن بە ڕێزمان‌و ئەدەبی کوردی‌یەوە بەجێ‌هێناوە. دانەری سەرفو نەحوو ئەلفو بێ‌یە کە بناغەی زمانە. لە ڕاستیدا گەلەکەمان پێویستی‌یەکی زۆری بەو جۆرە مرۆڤانە هەیە لەبەر ئەوە ئەو زاتە جێگای شانازی‌و ڕێز لێگرتنە، ئومێدەوارم ئەوانەی کە دەیانەوێ خزمەتی زمانی کوردی بکەن لەسەر ئەو بناغەیە بڕۆن‌و ئەو بناغەیە پتەوتر بکەن».

(٢) پرۆفیسۆر دکتۆر تاریق زافەر تونایا، مامۆستایە لە زانکۆی ئەستەنبوڵ، کۆلێجی یاسا. لەبابەت یاساو مێژووی نوێی تورکیاوە گەلێك نووسراوی هەیە.

(٣) شکری بابان زادە لە ڕۆژنامەی (ترجمان) ی تورکی نووسەرە. ئەو ڕۆژنامەیەش لە ئەستەنبوڵ دەردەچێ.

### سەرچاوەکان:


1 Koegiri Haik Hareketi 1919 — 1921 Komal Yayinlari Ankara 1975

2 Kürdistan Tarihinde Dersim.Nuri Dersimi Halep 1952.

# فیلیمەن و بۆسیس
# لە ئەفسانەی یۆنانی کۆنەوە

لە نووسینی (جۆن میلینگتن ورد) (The New Intermediate English Course) لە ئینگلیزیەوە مامۆستا محمد فرج حمه صالح سعید سەرپەرشتیاری زمانی ئینگلیزی کردوویەتی بە کوردی.

ڕۆژ خەریك بوو ئاوا دەبوو، ئێوارەیەك لە ئێوارەکانی کۆتایی پایز، شەش حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەر، دوو ڕێبواری ماندوو لایان دایە سەر جۆگەلە ئاوێك و لە ژێر دارێكدا لیێ دانیشتن. پێلاوەکانیان داکەندو قاچە تەپوو تۆزاوییەکانیان خستە ناو ئاوە ساردەکەوە. بەساڵاچووەکەیان شانێکی داداو لای کردەوە سەیرێکی ئەو دۆڵە فراوانەی کرد کە بە درێژایی ڕۆژەکە پیایا گەڕابوون. ئەمیان پیاوێکی تێك سمراوی بە هێزبوو، سەرێکی جوان و ڕیشێکی خوڵەمێشی هەبوو. تەماشای چرا دوورەکانی دەکرد کە یەك لە دوای یەك لە خانوو کۆختەکانی دۆڵەکەدا هەڵ دەکران، وبە هێواشییەوە بە هاورێکەی وت: پێویستە جۆرە سزایەکیان بدەین. هاوڕێیەکەی کە گەنجێکی باریکی قۆزبوو سەرێکی لە قاندو وتی: لە ڕاستیدا پێویستە.

ئەو ڕۆژە دوو پیاوەکە چەند میلێکی زۆریان بڕیبوو لە دۆڵەکەداو لەبەردەرگای هەموو خانوویەك و کۆختەیەکدا وەستا بوون و داوای خواردن و حەوانەوەیان کردبوو، کەچی لە هەموو لایەك دەست نرابوو بە ڕوویانەوە. هەندێ جار بەردیشیان تێ گرتبوون و تەنانەت هەندێ جاری تریش سەگیشیان تێ بەردابوون بۆ ئەوەی دووریان خەنەوە. بە ساڵاچووەکەیان قاچی لە ئاوەکە دەرهێناو پێلاوەکانی لە پێ کردەوەو وتی: با ملی ڕێگا بگرین و بڕۆین. تەنها یەك کۆختە ماوە لە دۆڵەکەدا کە سەرمان لێ نەدابێت. با بزانین لەوێ چی ڕوو دەدات، من لام وایە هیچ نەبێت تەنها خێزانێك ماوە کە ئەندامەکانی مانای میوانداری بزانن. ئەوی تریان وتی: لەم زەوی (فریجیە)یەدا، باوەڕناکەم هەبێت. بە ساڵا چووەکەیان وتی: با بزانین.

دووپیاوەکە دەستیان کردەوە بە ڕۆیشتن، لەم کاتەشدا وردە وردە تاریکی بەسەردا دادەهات. پاش ماوەیەکی کەم ڕووناکییەکی کزیان بەدیکرد لە سەر تەوقە سەری گردێك لەلای چەپیانەوە. بەرەو ڕووی چوون و بە گردەکەدا هەڵگەڕان. کە لێی نزیك بوونەوە بینیان ڕووناکییەکە لە کۆختەیەکی زۆر پەڕپووتەوە دەهات کە لە قوڕو پووش دروستکرابوو.

گەنجەکەیان وتی: باوەڕ ناکەم ئەمە هیچ سوودێکی بۆ ئێمە هەبێت. دەبێت دانیشتووانی زۆر هەژاربن، بەشی خۆشیان نیە کە بیخۆن، تاوەکو بەشی ڕیبوارانیشی لێبدەن.

کە نزیك بوونەوە پیاوێکی پیریان لە ناو دەرگای کۆختەکەدا بەدیکرد کە چاوی بە ڕێبوارەکان کەوت بە دەنگێکی خۆش و قووڵەوە

وتی: بەخێر بێن، ئەی نەناسراوەکان، لەوە دەچێت هیلاک بن. وەرنە ژوورەوە بخۆن و بخۆنەوەو پشوو بدەن. ناتوانین زۆرتان پێشکەش بکەین چونکە هەژارین بەلام زۆر خوشحالین کە بەشداریمان بکەن لەوەی کەخوا داویەتی. لە سەر ئەوەشەوە کاتیش زۆر درەنگە، وەختی سەفەرکردن نیە، فەرموون وەرنە ماڵەوە.

رێبوارە بە تەمەنەکەیان هەناسەیەکی هەلکێشاو سەیرێکی هاوڕێکەی کردو وتی: لە دوا قۆناغدا! ئینجا رووی کردە پیاوە پیرەکەی ناو دەرگاکەو وتی: ئێوە زۆر بەخشندەن، سوپاس بۆئێوە.

پیاوە پیرەکەش ناو دەرگای بەرداو رێگای میوانەکانی کرد کە بچنە ژوورێ. کۆختەکە بریتی بوو لە تەنها ژوورێك. پەتێك لە ناو قاپێکی رۆن زەیتووندا دەسووتاو ژوورەکەی رووناك دەکردەوە. ئەم قاپەش لە سەرمێزێکی ناقۆلا لە ناوەراستی زەوی یە رەقو تەقەکەی ژوورەکەدا دانرابوو. دوو شوێنی نوستنی دارین کە کەولی ئاژەلیان لەسەر راخرابوو لای دوو دیواری ژوورەکەوە دانرابوون، پارچە دارێکیش بە دووکەل کردنەوە لە ناو ئاگردانەکەدا دەسووتا.

کە ئەمان چوونە ژوورەوە پیرێژنێك بە رووی خۆشەوە لە بەریان هەستاو وتی: ئێوارەتان باش ئەی میوانەکان. بەخێربێن. من ناوم (بۆسیس)ەو مێردەکەشم کە ناوی خۆی پێ نەوتوون ناوی (فیلیمەن)ە، لەکاتی قسەکردندا پارچە داری ناو ئاگردانەکەی خۆش دەکرد. دارەکە کەمێك دووکەلی تری کردو ئینجا گڕی گرت، پارچە دارێکی تری هەلگرت لەو لیژنە دارە کەمەی کە لە تەنیشت ئاگردانەکەوەبوو. بە وریایی لەسەر دارە سووتاوەکەی داناو وتی: ئێستا گەلێك دلخۆشین بە هاتنتان، فەرموون دانیشن و پشوو بدەن. دوو شوێنی نوستنەکەی راکێشایە لای ئاگرەکەوە. فەرموون خۆتان گەرم بکەنەوە.

سەیرێکی میردەکەی کردو وتی: برۆ کەلەرمێك لە باخچەکە بکەرەوە و مەنجەلەکەش پرکە لە ئاو. ئەمەو گۆشتی بەرازو کەلەرمان دەبێت. دوو رێبوارەکەش دانیشتن، لە پاشدا پالکەوتن لەسەر شوێنی نوستنەکان.

بە تەمەنەکەیان دووبارە وتی: ئێوە زۆر بەخشندەن. ئەترسم جێگای نارەحەتی بین بۆ ئێوە.

پیرێژنەکە سەرێکی راوەشاندو وتی: نەخێر گەورەم هیچ کەسێك جێگای نارەحەتی نیە بۆ ئێمە. خواوەندە گەورەکان باشن بۆمان، بۆ منیش و بۆ مێردەکەشم. ئێمە هەژارین، بەلام فێریان کردووین کە بە خۆشی بژین. لەبەر ئەوە ئێمە پێمان خۆشە کە ئێوە بەشداریمان بکەن لەو شتە کەمەی کە هەمانە. ئێستا ببورن خەریکی نان ئامادەکردن دەبم. کەمێك بنوون بۆ خۆتان، کە خواردن ئامادە بوو خەبەرتان دەکەمەوە.

رێبوارەکان چاویان لێك ناو زۆری نەخایاند خەویان لێ کەوت. پاش دوو سەعات، فیلیمەنی پیرە مێرد خەبەری کردنەوەو پێی وتن: خواردن ئامادەیە. با بچینە سەر خوانەکە.

شوێنی نوستنەکان راکێشرانە لای خوانەکەوە کە لە ناوەراستی دا مەنجەلێك دانرابوو. چێشتەکە هەلمی لێ هەل دەستاو بۆنێکی خۆشی لێوە دەهات. بە کەوچکێکی دارینی گەورە پیرێژنەکە چوار قاپی پر کرد لە خواردن و مێردەکەشی چوار پەرداخی پرکرد لە مەی، ئینجا دانیشت و پەرداخەکەی خۆی بەرزکردەوە وتی: بەهیوای تەندروستی باشیتان.

ئەوانیش وتیان: تەندروستی باشی تۆش. پەرداخەکانی خۆیان خواردەوە.

فیلیمەن دەستی دایە سوراحی یەکە بۆ ئەوەی پەرداخەکان پر بکاتەوە، کەچی راچلەکی. سوراحی یەکە پر بوو هەروەکو یەکەم جار پێش ئەوەی پەرداخەکانی لێ پر بکرێت. بە سەرسامی یەوە چاوی بری یە سوراحی یەکە چونکە دەیزانی نەخۆی و نە ژنەکەشی پریان نەکردۆتەوە.

کاتێك دەیان خواردو دەیان خواردەوە هەر چواریان بێدەنگ بوون.

پاش ماوەیەکی کەم فیلیمەن دەستی دایەوە سوراحی یەکە بۆ ئەوەی پەرداخەکان پر بکاتەوە، کەچی قیژەیەکی کرد چونکە بینی دووبارە تا لێوەکەی پرە. ژنەکەی سەرێکی هەلبری. دوو رێبوارەکە هەر بەر دەوام بوون لە سەر نان خواردنەکەیان بێ ئەوەی سەر هەلبرن. فیلیمەن بە ترسەوە سەیرێکی ژنەکەی کردو ئینجا سەیرێکی سوراحی یەکەی کرد، ژنەکەشی هەر سەیری چاوی مێردەکەی دەکردو نەی دەزانی مەبەستی لە چی یە. پاش ماوەیەك ژنەکەی تێگەیشت کە هۆی سەرسامی مێردەکەی چی یە. ئەمیش هەستایە سەر پێو لە تەنیشت مێردەکەیەوە راوەستاو دەستێکی خستە ناو دەستی یەوە و دەم چاوی ئەمیش لە ترسانا سپی هەل گەرابوو. ئینجا رێبوارە بە تەمەنەکەیان سەری هەل بری و وتی: ها چی رووی داوە؟

فیلیمەن ماوەیەکی درێژ چاوی بری یە ئەم و دووبارە سەیرێکی سوراحی یە مەیەکەی کردەوە. بەهێواشی یەوە سەرێکی لەقاندو وتی: ئەبێ ئێوە خوداوەندبن، نابێ مرۆڤی ئاسایی بن.

ڕێبوارە گەنجەکەیان زەردەخەنەیەك گرتی‌و وتی: بەڵێ ڕاست دەکەیت. ئێمە خوداوەندین. سەری چەمانەوە بۆ لای هەڤاڵەکەی وتی: ئەمە (زیۆس)ە.

بۆسیس قیژەیەکی کردو وتی: ئای، نەخێر! زیۆس؟ گەورەی خواکان خۆی هاتبێتە ماڵی ئێمە!

بەڵێ منیش (هیرمیز)م.

ژن‌و مێردە پیرەکە سەریان نەوی‌کرد. فیلیمەن کەمەری ژنەکەی گرت‌و نزیکی کردەوە لە خۆی وەکو یەکێك بیەوێت بیپارێزێت.

فیلیمەن بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی: بۆچی هاتوونەتە لای ئێمە؟ بۆچی، ئێوەی گەورە، ئەم ماڵە هەژارەتان هەڵبژاردووە کە ڕێزی لێ‌بگرن؟

زیۆس دووبارە پەرداخەکەی نایەوە بەسەری‌یەوە ئینجا وتی: وەك خۆتان دەیزانن من پشت گیری‌کەری بەخشندەییم لە گەڵ گەلێك شتی باشەی تریش‌دا. ناو بە ناو لە (ئۆڵیمپەس)ەوە دێمە خوارەوەو خۆم لە بەرگی پیاوێکی ئاسایی‌دا دەگۆڕم. بۆ ئەوەی بزانم ئادەمیزاد چۆن لە گەڵ یەکتری‌دا ڕەفتار دەکەن. جا ئەو کەسەی چاکە دەکات پاداشتی دەدرێتەوە، خاوەنی دڵ ڕەق‌و خراپەش سزا دەدرێت. لای کردەوەو چاوی بری‌یە ئاگرەکە. ئەم زەوی (فریجیە)یە سزای خۆی وەرگرت. وەرن‌و بە چاوی خۆتان ببینن.

زیۆس هەستایە سەرپێ‌و هیرمیزیش لە گەڵیا هەستا. چوونە دەرەوە بەر مانگەشەوەکە. فیلیمەن‌و بۆسیسیش بە دوایاندا ڕویشتن. کە هاتنە دەرەوە قیژەیەکیان‌کرد لەوەی کە چاویان پێ‌ی کەوت.

هەموو دۆڵەکە بوو بووە گۆمێکی گەورەو دەدرەوشایەوە لە بەر تیشکی مانگەشەوەکەدا.

هەردوو پیرەکە چاویان بڕیبووە گۆماوەکە بە ترسەوە، بە هێواشی‌یەوە بە یەکتری‌یان وت: ئای زیۆسی هەرە مەزن!

زیۆس گوێ‌ی لەقسەکردنەکەیان‌بوو، لە وەڵامدا وتی: دانیشتووانی ئەم خاکە دەبوایە داڵدەیان بدایانایە، بەڵام چرووك‌و خراپ‌بوون. لەبەر ئەوە پێویست‌بوو سزایان بدەم بۆ هەتا هەتایە. بەڵام ئێوە مرۆڤی باشن. لاکەنەوە سەیرێکی خانووەکەتان بکەن.

دوو پیرەکە لایان کردەوەو قیژەیەکی تریان کرد.

کۆختە قورینە پەرپووتەکەیان بووبووە پەرستگایەکی مەرمەری سپی، پایەی باش باشی لە ژێرداو سەربانێکی ئاڵتوونیش بەسەر سەری‌یەوە.

زیۆس وتی: ئێستا ئەمە خانووی ئێوەیەو پاداشتی میوانداری‌یەکەتانە، بەڵام پێم بڵێن ئاخۆ هیچ شتێکی تر هەیە کە بتانەوێت یان پێویستان بێت کە بۆتانی بکەم؟

بۆسیس دەستی خستە ناو دەستی مێردەکەیەوەو هەر دووکیان بەبێ دەنگی وەستابوون‌و بەپەرستگاکەدا هەڵیان دەڕوانی.

هیرمیز وتی: ئێستا ئیتر بەجێتان دەهێڵین، وەڵامی زیۆسی مەزن بدەنەوە، هیچ شتێکی تر هەیە کە بتانەوێت یان پێویستان بێت؟

فیلیمەن بە هێواشی‌یەوە ڕووی کردە زیۆس‌و لێوەکانی کەمێك تەرکردو سەری دانەواندو وتی: شتێك هەیە لەوانەیە شتێکی دەروونیش بێت. بەڵام‌من‌و ژنەکەم بە یەکەوە زۆر بە دڵخۆشی ژیاوین. ئایا ئەوەمان پێ دەبەخشیت کە بە یەکەوە کۆچی دوایمان بکەین؟

زیۆس سەری لەقاندو وتی: خواستەکەتان دێتەدی. خواتان لەگەڵ. فیلیمەن‌و بۆسیس هەردووکیان بە دەم سوپاسەوە تەواو چەمانەوە، کە ڕاست‌بوونەوە خواوەندەکان لەبەر چاو نەمابوون.

ساڵ لە دوای ساڵ ئەم دوو پیرە پەرستگاکەیان بە پاك‌و خاوێنی ڕادەگرت لەبەر ڕێزی زیۆس.

ئێوارەیەکیان کە تەمەنی هەردووکیان لەسەرو سەد ساڵەوەبوو، کاتێك پەنجا یاردەیەك دوور لە پەرستگاکە وەستابوون‌و باوەشیان کردبوو بە یەکدا لەسەر قەراغی گۆماوە گەورەکەو هەڵیان دەڕوانی بەقەشەنگی‌و جوانی پەرستگاکەدا فیلیمەن وتی: دەزانی، ئەی خۆشەویستەکەم، من پیربووم‌و زۆریش هیلاکم وادەزانم تەواو ئامادەی مەرگم هەر کاتێك زیۆس بیەوێت.

ژنەکەشی ڕووی تێ‌کردو بە زەردەخەنەیەکەوە کە لە سەر دەم‌و چاوە چرچ و لۆچە بە ساڵاچووەکەی دیاری‌دا، وتی: بەڵێ منیش هەر وەکو تۆ ئامادەم. خۆزگە دەمان توانی ئاگاداری بکەین.

بەڵام پێویستی بەوە نەکرد. لە کاتێکدا بۆسیس قسەی دەکرد توێکڵی درەختێکی زەیزەفوون دەستی کرد بە ڕوان لەسەر بەژنی ئەم‌و توێکڵی دار بەرروویەکیش لە سەر بەژنی مێردەکەی. ئەمانیش ڕاوەستابوون ودەستیان خستبووە سەر شانی یەکتری بەبێ ئەوەی بزانن کەچی لە دەوریان ڕوو دەدات.

ئەمڕۆ خەڵکی لە هەموو لایەکەوە دێن بو تەماشاکردنی دار زەیزەفوونە ڕاست هەڵچووەکەو دار بەرروو مەزنەکە کە لە سەر یەك ڕەگ لەسەر قەراغی گومەکەی فریجیە ڕواون.



# لەبارەی فەلسەفەو سەرەتای پەرەسەندنی بیری فەلسەفییەوە

رەفیق غەفور

ئەگەر لە رووی بایۆلۆژییەوە بروانینە مرۆڤ ئەڵێین باڵاترین (ارق)و پەرەسەندووترین گیانەوەری سەر زەوییەو خاوەنی باڵاترین شێوەی مادەیە کە مێشکی (دماغ)یەتی. بەڵام بوونی مێشك لە خۆیدا نابێتە هۆی جیاکردنەوەی مرۆڤ لە گیانەوەرەکانی تر، چونکە ئەوانیش مێشکیان هەیەو هی هەندێکیان لە رووی قەوارەو چەندێتی خانەکانییەوە لە هی مرۆڤ کەمتر نییە، بەڵکو جیاوازییەکە ئەگەرێتەوە بۆ چۆنێتی مێشکەکەو پلەی ئەو دەورەی کە لە ژیانی هەر یەکە لە مرۆڤو ئاژەڵدا ئەیگێڕێ. مێشکی ئاژەڵ رۆڵی خۆگونجاندنو خۆرێکخستن لە گەڵ سروشتدا ئەگێڕێ، بەڵام مێشکی مرۆڤ ئەندامی سەرلەنوێ دروستکردنەوەو گونجاندنی سروشتە لەگەڵ مرۆڤدا.[1]

ئاژەڵ تەنیا بەهۆی غەریزەو کاردانەوەی سلبی بەرامبەر سروشت بەرێوە ئەچێ (وەك غەریزەی برسێتیو جنسو خۆرزگارکردنو.. هتد) کەچی مرۆڤ تەنیا گیانەوەرێکە کە خۆی لە گەڵ سروشتدا ناگونجێنێ، بەڵکو هەوڵ ئەدا ئەو لەگەڵ خۆیدا بگونجێنێو دەستی بە سەرا بگرێو بۆ خزمەتی خۆی بیرە خسێنێ، لەورێیەشەوە پەرە بەخۆیو ژیانی مرۆڤانەی خۆیبدا، چونکە «کاتێك مرۆڤ کار ئەکاتە سەر سروشتو ئەیگۆڕێ لەم رێیەشەوە سروشتی خۆی ئەگۆڕێ».

لەم پرۆسێسەشدا (عملية) دەماغ دەورێکی باڵا ئەگێڕێو پێبەپێی ئەم گۆرانە بەرەو پێشەوە ئەچێ.

کەواتە کە ئەڵێین مێشکی مرۆڤ باڵاترین شێوەی مادەیە مەبەست لە چۆنێتیو پلەی دەوری ئەو مێشکەیە لە ژیانی مرۆڤدا.

بەڵام ئایا مرۆڤ چۆن کار ئەکاتە سەر سروشتو ئەیگۆڕێ؟ یان ئەوەندە بەسە کە خاوەنی مێشکێکی پەرەسەندووە؟

بێگومان نەء... چونکە مێشك هەر چۆنێك بێت ناتوانێ بەتەنیا ئەو دەورە بگێڕێو ئەو کارە بکا. مێشك ئامێرێکی زانیی مرۆڤەو لە پاڵ کارکردنو بەرهەم هێناندا پەرە ئەسێنێ، کارکردنو بەرهەم هێنانیش واتا بوونی بابەتێکی تر لە دەرەوەی مرۆڤ، ئەو بابەتەش سروشتە کە مرۆڤ کاری تێئەکا، پێش ئەم کارتێکردنەش، مێشك پەرەسەندنێکی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەدیبوو.

هەستانە سەرپێی مرۆڤو بەکارهێنانی دەستەکانی رۆڵێکی گەورەیان لە پەرەسەندنی لەوەودوایدا دیو لێرەشەوە بەرەو بەرهەم هێنان هەنگاوینا. بەکارهێنانی دارو بەرد بە مەبەستی بەرهەم هێنانو دواییش دروستکردنی ئامێری بەرهەم هێنان ئەو سەرەتایەبوو کە مرۆڤی لە جیهانی ئاژەڵ جیاکردەوە. مرۆڤ دروستکەری ئامێرەو بۆ مەبەستی بەرهەم هێنانیش ئامێر دروست ئەکا. ئەتوانین بڵێین «رێگایەکی ناراستەوخۆیە بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجەی مرۆڤ هەوڵیان بۆئەدا، واتا هۆیەکی بەرهەمدەرە».

بەڵام ئامێریش هەر ئەوە نییە کە ئەو خۆی ئەتوانێ چی بکا، بەڵکو لە چۆنێتیو پلەی ئەو مێشکەدایە کە دروستی ئەکاو بەکاری ئەهێنێ.

کەواتە پلەی پەرەسەندنی مێشكو بەرهەم هێنانو بەكارهێنانی ئامێر پێ بەپێی یەك ئەڕۆنو گەشەكردنی هەریەكەیان كار لەوی تریان ئەكا.

بێگومان ئەم پرۆسێسەش نایەتەدی ئەگەر مرۆڤ تاكو تەراو دوور لە یەكتر بژین. بەڵكو بوونی كۆمەڵی مرۆڤایەتی زامنی بەدیهاتنو بەرەو پێشەوەچوونی پرۆسێسەكەی كردووە. چونكە چاككردنو بەرەو پێشەوە چوونی ئامێرو بەرهەم هێنان بە شێوەیەكی گشتی، تەنیا ئەنجامی تاقیكردنەوەی تاكە كەسان نەبووە، بەڵكو بەرهەمی لەیەك تێگەیشتنو لە یەك فێربوونی مرۆڤبووە، لێرەشدا زمان (ئاخاوتن) دەوری خۆی ئەگێڕێو شان بە شانی كاركردنو ئامێرو بیركردنەوە پرۆسێسی ئەم پێشكەوتنەی مرۆڤمان بۆ ڕوون ئەكاتەوە.

كەواتە هەر وەك چۆن زمان لە ئەنجامی پێكەوە ژیانو تێكەڵاوی خەڵكی‌یەوە دروست بووەو هاتۆتە گۆڕێ، بەو جۆرەش هۆیەكە بۆ كۆبوونەوەی خەڵكو هاریكاری لە نێوانیانداو پێكەوە بەستنی ڕۆژ لە دوای ڕۆژی مرۆڤ، هەر لە ڕێی زمانیشەوە خەڵكی ئەتوانن شارەزایی‌و دەسكەوتەكانی خۆیان بۆ نەوەكانی دوایی‌یان بگوێزنەوەو كاریان تێبكەن. پێش ئاخاوتن مرۆڤ نەیئەتوانی كار لە نەوەكانی دوای خۆی بكا لە سنوورێكی یەكجار تەسكا نەبێ[3]. ئەمەش لەڕێی هەندێك تاقیكردنەوەی سەرەتایی‌وە.

كاریگەری دیاردە سرووشتی‌و كۆمەڵایەتی‌یەكان لە ڕێی هەستكارەكانەوە ئەگوێزرێنەوە. بۆ مێشكی مرۆڤو مێشكیش ڕێكیان ئەخاو بە یەكیانەوە ئەبەستێ. لەو ڕێیەشەوە یارمەتی مرۆڤ ئەدا بۆ ی تێگەیشتنیانو شیكردنەوەیانو هێنانەدی بیرۆكەی جۆراوجۆر لە بارەیانەوە بەڵام زمان هۆیەكە بۆ بەرجەستە (تجسید)كردنی ئەو بیرۆكانەو گواستنەوەیانو ئاڵوگۆڕ پێكردنیان لە نێوان خەڵكدا. كەواتە زمانیش هەر بە دەورو بەرەكەوە بەستراوە بەڵام لەڕێی بیرەوە، بەم جۆرە زمان بریتی‌یە لە تەجریدی واقیعو خۆشی واقیعی ڕاستەو خۆی بیرە.

لە مێشكی مرۆڤدا مەڵبەندی تایبەت بە قسەكردن هەیەو ئەكەوێتە بەشی پێشەوەی لای سەرووی توێكڵی مۆخ، ئیشارەتی شتەكانیش بۆ ئەم مەڵبەندانە - كە هەر لە مێشكی مرۆڤدا هەن - ئەگوێزرێنەوەو سیستەمێك پێك دێنن كە پێی ئەوترێ سیستەمی دووەمی ئیشارەت (النظام الثانی للاشاره)[4] كە بریتی‌یە لە كۆمەڵێك هێما (رمز)ی جۆراو جۆرو واتای شتەكان دەرئەبڕێ. «بەهای ئەم هێما زمانیانەش لەواتاو ناوەرۆكو بایەخیاندایە»[5].

بەم جۆرە ئەبینین لە گەڵ دروستكردنی ئامێرو دەركەوتنی بیركردنەوەدا، ئاخاوتنیش دەركەوت، ئەم سێ لایەنەش پێوەندێكی ئۆرگانی پێكیانەوە ئەبەستێو هەر لایەیان كار لەوی تریان ئەكاو پەرەسەندنی هەر یەكێكیشیان بەندە بەوانی ترەوە.[6]

كەواتە بە شێوەیەكی گشتی ئەتوانین مرۆڤ (جگە لە پێكهاتنە بایۆلۆژی‌یەكەی) لەم خاڵانەی خوارەوەدا كۆ بكەینەوە:

١ - بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتی‌یەو لە ڕێی فێربوونەوەو لەناو كۆمەڵدا زیاتر گەشە ئەكاو بەرەو پێشەوە ئەچێ.

٢ - بەرهەم هێنی ئامێری بەرهەم هێنانە.

٣ - توانای بیركردنەوەو قسەكردنو سەرنجدان (التأمل)و پێشبینی كردن (التنبؤ)ی هەیە.

٤ - هەر ڕوو لە دەرەوەی خۆی ناكاو بە دەورو بەری‌یەوە خەریك نی‌یە. سەرنجی ناوەوەی خۆشی ئەداو بیر لە خودی خۆی ئەكاتەوەو لە خۆی تێئەگا.[7]

بێگومان خستنە ڕووی مەسەلەكە بەم شێوەیەو دەستپێكردنی باسەكە بە مرۆڤ خۆی لە خۆی‌دا شتێكی گرنگە، چونكە بابەتەكە بیری مرۆڤەو ئاشكراشە هیچ كاتێك بیرو بیركردنەوە لە مرۆڤ دانابڕێن، خۆ ئەگەر یەكێك لە مەرجەكانی بیر - هەروەك پێشتر باسمان كرد - بوونی بابەتێكی دەرەكی واتا مەوزوعی بێت، ئەوا مەرجەكەی تریان مێشكی مرۆڤە، ئەم دوو مەرجە بنەڕەتی‌یەی كرداری بیركردنەوەش (عملية التفكير) پێوەستێكی ئۆرگانی (عضوي) بە یەكیانەوە ئەبەستێو بە نەبوونی هەر لایەكیشیان مەحاڵە بە هیچ شێوەیەكو لە هیچ كاتو شوێنێكدا هیچ (بیر)ێك هەبووبێت.

بەڵام ئایا لە كەیەوەو بۆ چ مەبەستێك مرۆڤ بیری كردۆتەوە؟ ئایا یەكەم پرسیارێك كە ڕوو بەڕووی بۆتەوەو داوای وەڵامو بیركردنەوەی لێكردووە كامە بووە؟

ئاشكرایە یەكەم كێشەیەك كە بەرەو ڕووی مرۆڤ بۆتەوە ململانێی بووە لە گەڵ سرووشتدا، لە پێناوی مانەوەی خۆی‌و درێژەدان بە ژیانی. جا لە گەڵ ئەم ململانێ ناهاوتایەشدا گەیشتە ئەو ڕاستی‌یەی كە سرووشت - بەشێوەیەكی گشتی - (دارو بەردو ئاوو ئاسمانو خۆرو بارانو... هتد) هەموو ئەو شتانەی ڕۆژانە مامەڵەی لەگەڵ ئەكردنو پێوەندی پێیانەوە هەبوو، شتێكن لە دەرەوەی ئەون، سەربەخۆن لە بوونی ئەو. ئەوەی یارمەتی جێگیر بوونی ئەم ڕاستی‌یەشی لە مێشكی‌دا دا



فلاتون

دوو هۆی سەرەکی بوون یەکەمیان چالاکیو کاری رۆژانەو مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکانی دەوروبەردا، دووەمیشیان دیاردەی مردن بوو.[٨]

مرۆڤ بەهۆی کارکردنە شتەکانی سرووشتو بەکار هێنانی ئامێرەوە هەستیکرد کە شتێکە سەربەخۆیە لەو شتانەیترو، تەنانەت ئەو ئامێرانەی دروستیان ئەکاو بەکاریان ئەهێنێ وەك کەڵبەو چنگو شاخی هەندێك گیانەوەری ترنین کە بە خۆیانەوە نووساون، بەڵکو شتێکن سەربەخۆن لەبوونی ئەو، هەروا کاتێك کە ئەیدی کەسانی تر ئەمرنو شتەکانی سرووشتیش هەروەك خۆیانن جارێکی تریش ئەوەی بۆ دەرکەوت کە بوونی ئەم سەربەخۆیە لە سرووشت.

بێگومان دەرككردن بەم ڕاستییەو خۆدۆزینەوە لە سرووشتدا هەنگاوێکی گەورەو گەشەکردنێکی چۆنێتی بوو بە نیسبەت مرۆڤەوەو ڕوو بەڕووی گەلێك پرسیاری تری کردەوە.

کەواتە لە سەر جەمی ئەوەی لەمەوپێش باسمان کرد ئەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئەم مرۆڤە لەو ساتەوەی خۆی لەم گەردوونە بەرینو فراوانەدا دیوەتەوەو کەسێتی خۆی ناسیوە مەحکوم بووە بەوەی بیر بکاتەوە، بەو پێیەش کە «جەوهەرێکی کۆمەڵایەتییەو بوونەوەرێکی بەرهەم هێنە ئەتوانین لەم سنوورەداو بەم مانایە بڵێین بیرکردنەوە بە شێوەیەکی ناچاری (ضروري)و لە نزمترین ئاستیدا سیفەتێکی خۆرسکی (فطری) مرۆڤ بووە.

**لە هەستکردنو سەرنجدانەوە بەرەو بیرکردنەوەی مەنتقی.**

هەستکردن بە شتو دیاردەکانی دەوروبەر شتێکی حەتمییەو لە ئیرادەی مرۆڤ بەدەرە. مرۆڤیش بیەویو نەیەوێ ناتوانێ خۆی لە کاریگەری شتەکان بدزێتەوە، کرداری هەستکردنیش کاتێك دێتەدی کە لە لایەکەوە ئەندامی هەستکار هەبێت، لە لایەکی تریشەوە شتێك هەبێت کار لەو هەستکارە (حاسة) بکات. لێرەشدا مرۆڤ هەیە کە خاوەنی ئەندامە هەستکارەکانەو لەهەمان کاتیشا سرووشتێك هەیە کە ئەو مرۆڤەی تیادا ئەژی. کەواتە هەستکردن پرۆسێسێکی ناچارییەو خۆ دزینەوە لێی مەحاڵە. یەکەم قۆناغی زانینیش بە هەست کردن دەست پێئەکا، هەستکردن یەکەم پلەی زانینەو بنچینەیەتی، لە ڕووی فسیۆلۆژیشەوە واتا کاریگەری شتەکانی دەورو بەر لەسەر دەمارە بێ شومارەکانی ئەندامە هەستکارەکانی مرۆڤ کە بە هەموو لایەکی لەشدا بڵاوبوونەتەوە، ئەرکیشیان ئەوەیە کە ئەم کاریگەرییانە بۆ ناوچەو مەڵبەندە مۆخییە هەستییەکانی تایبەت بە هەر یەکە لە ئەندامە هەستکارەکان بگوێزنەوە.[٩]

ئەم کاریگەرییانەش لە قۆناغێکی تردا کۆمەڵێك زانیاری هەستیی (الحسي)یان سەبارەت بە شتە هەستپێکراوەکان لە مێشکی مرۆڤدا گەڵاڵە کردووە. ئەم حەتمییەتەش وای لە مرۆڤ کردووە کە هەڵوێستێکی بەرامبەر ئەو شتانە هەبێت.

هەڵوێستی مرۆڤ لە سەرەتادا تەنیا سەرنجدانی زیندووی دیاردەو ڕووداوەکان بووە، سەرنجدانی زیندووش واتا کاریگەریی ئەو شتانەی لە دەورو بەری مرۆڤ بووینو ئەو دیاردانەی سەریان سوورهێناوە، کاریگەرییەکی سلبی نەبووەو نەبۆتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لەبەریان هەڵبێ، یان خۆی بدا بە دەستیانەوە، یان گوێیان نەداتێ، بەڵکو لە ڕێی هەستکارەکانییەوەو بە هۆی تاقی کردنەوە عەفەوییەکانی ڕۆژانەیەوە چەردەیەك زانیاری هەستییان لای مرۆڤ دروست کردووەو وایان لێ کردووە کە زیاتر سەرنجیان بدا، بەڵام لەوەودوا ئەم سەرنجدانە زیندووەو ئەو زانیارییە هەستیانەی لای مرۆڤ کۆبووبوونەوە گەلێك بیرۆکەی ئاڵۆزیان لە مێشکیدا هێنایە دیو یارمەتی ئەوەیاندا کە بە هۆی دووبارەو چەند بارە بوونەوەیانەوە خاڵی هاوبەشو سیفەتی لێکچوو لە نێوانیاندا ببینێو واتا گشتییەکانی شتەکان بدۆزێتەوە، لەم ڕێیەشەوە بناغەی بیرکردنەوەیەکی موجەرەدو زانینی مەنتقی (المعرفة المنطقية) لە ئاستێکی نزمدا دارێژێ. ئەگەرچی بیرکردنەوەو زانینە مەنتقییەکەش لەم قۆناغەدا هەر لە سنووری ئەو دیاردەو ڕووداوانەدا بوو کە ڕاستەوخۆ بە هۆی هەستکارەکانییەوە دەرکی پێ کردوونو دەبوایە ڕاستەو خۆش سوودیان لێ وەرگرێ. لەبەر ئەوەش تەنیا لە گۆشەی ئەم سوود لێ وەرگرتنە ڕۆژانەیەوە سەرنجی داونو هەوڵی داوە لێیان تێبگا.

بەم جۆرە سەرەتای کاری ئامانجیاری (الهادف)و پێشبینی کردن لای مرۆڤ بە شێوە سەرەتاییەکەی دەستی پێکردو سنووری بیرکردنەوەی فراوانتر بوو، بەڵام لێرەشدا ئەبێ ئەوە بڵێین کە زانینی هەستیی (المعرفة الحسية)و زانینی مەنتقی (المعرفة المنطقية) دوو جەمسەری لێك دابڕاوو دوور لەیەکتر نین، بەڵکو دوو قۆناغی یەك کردارن ئەویش بیرکردنەوەی تیۆری (النظري) یە کە لەسەر بنچینەی چالاکی کردەییو بەرهەم هێنان دێتە دی.

بێ گومان پەرەسەندنی مرۆڤو گەیشتنە قۆناغی بیرکردنەوەی موجەرەدو کاری ئامانجیاریو پێشبینی کردن شتێکی کتو پڕ نەبووەو هەروا بە ئاسانیو لە ئانو سەعاتو چەند رۆژێکدا نەهاتۆتە دی، بەڵکو بەری رەنجی هەزاران ساڵو ئەنجامی کەڵەکە بوونی هەموو تەقەلاو تێروانینو سەرنجە زیندووەکانی مرۆڤ بووە کە لەمەودای بەرهەم هێنانو چالاکی رۆژانەی خۆیدا بە دەستی هێنا بوون. جگە لەوەش ئەم پەرەسەندنەی بیری مرۆڤ بەمانایەکی ترو لەسەردەمێکی دواتردا هاوکاتی ئەو گۆرانکاریيانە بووە کە لە کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا هاتوونە دیو پێ بەپێی ئەم گۆرانو بەرەو پێشەوە چوونەش بیری مرۆڤ بەرەو پێشەوە چووە، سا ئەگەر ئەم پێشکەوتنەش لەسەر حسابی مرۆڤایەتی‌یەکەی بووبێ، چونکە دوای ئەوەی شێوازی بەرهەم هێنان فراوانتر بوو، کۆمەڵی مرۆڤایەتیش زیاتر پێشکەوتو پێکهاتنی کۆمەڵایەتی گۆرانی بە سەردا هات، دوای ئەوەی گەلێك دیاردەو پرسیاری ئاڵۆزو دوور لە دەسەڵاتو توانای شی‌کردنەوەی ئەوکاتەی مرۆڤ خۆیان کوتایە خەیاڵو مێشکی‌یەوەو ئەویش توانای بەسەر شی‌کردنەوەو لێکدانەوەیاندا نەئەشکاو زمانو ئاخاوتنیش لەرووی تەجرید کردنەوە زیاتر بەرەو پێشەوە چوون، ئیتر وورده وورده بیری غەیبیو خەیاڵی دوور لە واقیع کەوتنە تێروانینی مرۆڤەوە،

بە جۆرێك کە لەبیریدا هێزە نادیارو لە ئاسابەدەرەکان کەوتنە حوکمی گەردوونو سەر لەبەری ئەو دیاردانەی روویان ئەدا جا ئەم تێ‌گەیشتنە چەواشەیەش لە واقیع و خۆ خستنە ژێر رکێفی هێزە دەرەکیو خەیاڵی‌یەکان کە هەر ئەم تێگەیشتنە ئافەریدەی کردبوون لەوەو دوا زیاتر لە ئەفسانەکاندا خۆیان دی‌یەوە. ئەفسانەش ئەوکاتەو بەپێی ئەقڵی ئەو سەردەمە راستی‌یەکی مەنتقی بووە لە هەمان کاتیشا ویستو ئارەزووی خەڵکی دەرئەبریو وەڵامی زۆر لە پرسیارە گەورەکانی مێشکی مرۆڤی لەخۆ گرتبوو، جگە لەوەش ئەو حاڵەتانەی نەمر ئەکرد کە لای مرۆڤ گرنگ بوونو مرۆڤ خۆی تیادا ئەدۆزینەوە، وەك گەرانەوەی ژیانێکی ئەبەدی لە جیهانێکی تراو دابین کردنی ئاسوودەیی‌یەك کە خەونی مرۆڤ بوو، هەر بۆیەش رەگەزو سەرەتای ئەفسانەکان لە شتە واقعی‌یەکانەوە یان شێوەی شێواوی ئەو شتانەوە دەستیان پێ کردووەو پەرەیان گرتووە. ئەوەتا ئەو ئەفسانانەی سەبارەت بە گەردوونو دروست بوونی مرۆڤ ئەدوێن هەر هەموویان بە شێوەیەکی گشتی باسی بنەرەتە مادی‌یەکەی ئەم دروست بوونو پێکهاتنەیان کردووە. هەروەك لای بابلی‌یەکان خواوەندەکانو مرۆڤ لە خۆشەویستی نێوان ئاوی شیرین (ئەبسۆ)و ئاوی سوێر (تیامات)



ئەرەستۆ

دروست بوون، [١٠] یان لە ئەفسانەکانی گەلانی تردا جیهان هەمووی لە هێلکەیەکی گەورەوە هاتۆتە دەرەوە، یان لای ئەسکەندنافی‌یەکان سەرچاوەی مرۆڤ لەشێکی گەورەو زەبەللاح بووە، لای میسری‌یە کۆنەکانیش کە جێماوە فرعەونی‌یەکان – ئەگەر بەشێوەیەکی سادەش بووبێ – باسی ئەو بنچینە مادی‌یەیان کردووەو رایان وابووە کە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان لە ئاوی ساردەوە یان لە هەواوەکە لە هەموو شوێنێکدا هەیە دروست بوون. [١١]

بێ‌گومان بە هۆی جیاوازی نێوان کاری بیرو بازووەوە دروستکەرو پاڵەوانانی ئەم ئەفسانانە بلەو پایەیەکی تایبەتی‌یان لە کۆمەڵدا هەبووەو لەزۆر رووەوە ئەفسانەکان خزمەتی ئامانجەکانی خۆیانی ئەکرد، ئەگەر چی کۆمەڵێك پرسیاریان لە مێشکی مرۆڤدا دروست کردو بەرەو بیرکردنەوەی قووڵترو هەنگاونان بەرەو بە دیهێنانی ئەوەی ئەفسانەکان باسیان کردووە هاندا.

بەڵام لێرەدا ئەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەفسانەکان لە بارەی تواناو لە خۆگرتنی پرسیارو وەڵامی ئاڵۆزو جۆراو جۆرەوە چوون‌یەك نەبوون، هەر بۆیەش هەندێکیان هەرزوو پووکانەوەو لەبیرچوونەوەو هەندێکی تریشیان



دیکارت

ئەتوانم بڵێم تا ئەمرۆش مێشکی مرۆڤیان جەنجاڵ کردووە.

ئەمە سەبارەت بەو دەورەی ئەفسانە گێڕاوی‌یەتی بەڵام لە هەمان کاتیشا هەنگاوی ڕێکخستن‌و پێکهێنانی گەلێك زانیاری تر دەنرا، سەرتاپای مێژووی مرۆڤایەتیش تا ئەمرۆ هەر بەم دوو ڕێچکەیەدا تێ پەڕیوە، یەکێکیان ڕێ‌ی خۆبەدەستەوەدان‌و هەڵاتن لە واقیع‌و خۆدانە دەست قەدەر بووە، ئەوی تریشیان ڕێ‌ی گەڕان بەدوای گرێ‌ی نهێنی‌یەکان‌و هۆو ئەنجامی دیاردەو ڕووداوە واقیعی‌یەکان بووە[١٢]، چونکە هەرچەندە بیرکردنەوەی مرۆڤ لە هەندێ لایەنەوە دووربێ لە واقیعەوەو دوای خەیاڵێکی نەزۆك کەوتبێ ناچار ئەبێ لەبەر ژیانی ڕۆژانەی خۆی‌و پێویستی‌یەکانی ڕۆژانەی بیر لە شتە واقیعی‌و مەوزوعی‌یەکان بسکاتەوەو لە ژیان‌و بەرهەم هێناندا هەنگاو بنێ. جا لەسەر ئەم بنچینەیەش – پێویستی‌یەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵك – سەرەتای زانستەکان دەرکەوتن (زانستی فەلەك‌و پزیشکی‌و ماتماتیك‌و... هتد) کە ئەنجامی سەریەك نانی هەموو بیرکردنەوەو تێڕوانینە واقیعی‌یەکانی مرۆڤ بوون بەڵام ئەبێ ئەوەش بڵێین کە نە ئەم زانستانە ئەو کاتە ئەم ناوانەیان هەبووەو نە ناویشیان زانست بووە، بەڵکو تەنیا لە سنووری مومارەسەکردن‌و لێکدانەوەی ئەو لایەنانەدا بوون کە لەوەوداو ناوی ئەم زانستانەیان لێ نراو یان بە واتایەکی تر بوونە بنچینەیەك کە کۆمەڵی مرۆڤایەتی لە قۆناغێکی دوا تردا و بە هۆی پێشکەوتنی بیری‌یەوە توانی ڕێکیان بخاو هەریەکەیان بەرەو پێڕەوو لێکدانەوەی لایەنێکی تایبەتی ژیانی سرووشتی‌و کۆمەڵایەتی ئاراستە بکاو هەریەکەشیان بە پێ‌ی ئەو بوارەی کاری تیادا ئەکەن ناو بنرێت.

بەم چەشنە ئەم سەرەتا زانستی‌یانەو ئەفسانە ئەو کاتە تەواوی هەڵوێست‌و بیرکردنەوەی مرۆڤیان سەبارەت بەژیانی سرووشتی‌و کۆمەڵایەتی دەرئەبڕی.

**پەیوەندی ئەم سەرەتا زانستی‌یانە بە فەلسەفەوە**

وەك وتمان کۆبوونەوەی چەردەیەك زانیاری لە بارەی دیاردەو ڕووداوەکانەوە لای مرۆڤ‌و سەرهەڵدانی سەرەتا زانستی‌یەکان، ئەنجامی ئەو هەوڵ‌و تەقەلایانەی مرۆڤ بوو کە بۆ زانینی واقیعی سرووشتی‌و کۆمەڵایەتی دابوونی، ئەنجامی سەریەك‌نانی هەموو ئەو بیرکردنەوەو هەڵوێستانەی مرۆڤ بوون کە لە مەودای بەرهەم هێنان‌و چالاکی خویدا بە دەستی هێنابوون. زانستیش سەرجەمی ئەو یاسایانەیە کە دیاردەیەك یا چەند دیاردەیەکی لێکچوو بە ڕێوە ئەبەن (وەك زانستی فیزیك کە سەرجەمی ئەو یاسایانەیە دیاردە فیزیکی‌یەکان لێك ئەدەنەوە). واتا کۆمەڵە شتێکی هاوبەش یا کۆمەڵە حالەتێکی لێکچوو لە نێوان دیاردەکاندا دەبنە هۆی پێکهێنانی یاسایەك کە هەموویان بچنە ژێر ڕکێفی‌یەوە وەك یاسای پاراستنی بارستە (حفظ الكتلة)و بارگەی کارەبایی‌و یاسای ڕاکیشان (الجاذبية)و.. هتد، کە هەر یەکەیان لە چەند دیاردەیەکی جۆراوجۆرا دەور ئەبینن. ئەم یاسایانەش مەوزوعین‌و لە ڕووی کارکردنیشەوە لە پرۆسێسێکی حەتمی‌دا دەوری خۆیان ئەبینن. واتا مرۆڤ دروستیان ناکاو ناتوانێ بیانگۆڕێ. بەڵکو ئەیاندۆزێتەوەو دەست بەسەر کارکردنیاندا ئەگرێت. ئەم یاسانە بە جۆرێکی ئەوتو لێکەوە نزیکن‌و خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە کە ئەتوانن پێکەوە شتێکی تر پێك بێنن ئەویش زانستە. واتا هەریەکە لە زانستەکان کۆمەڵێك یاسایان لەخۆ گرتووە. یاساکانیش مەوزوعین‌و لەواقیعێکی مەوزوعی‌دا کاری خۆیان ئەکەن‌و بیری مرۆڤیش بە هۆی ووشەو زمانەوە تەجریدیان ئەکاو لە قالبێکی تیوری‌دا دایان ئەڕێژێتەوە. وەك وتمان یاساکان بە شێوەیەکی ناچاری کاری خۆیان ئەکەن‌و دەوری مرۆڤیش لێرەدا دۆزینەوەی ئەو یاسایەو دەست بەسەراگرتنی ئەو ناچاری‌یەیە.

بەڵام هەروەك چون یاساكانی هەریەكێك لە زانستەكان پووختەی ئەو حاڵەتە هاوبەش و لێك چووانەن كە لە نێوان دیاردەیەك یان چەند دیاردەیەكدا هەن و ئەو زانستە لێكیان ئەداتەوە. بەو جۆرەش لە نێوان هەموو زانستەكاندا حاڵەتی لێكچوو پێوەندی جۆراو جۆرو هاوكاریگەرهەن. چونكە هەرچەندە دیاردەكان بەرووكەش تاك و تەراو لێك دوورین بەڵام لە بنەڕەتدا هەموویان پێكەوە بەستراون و كار لەیەك ئەكەن، زانستەكانیش شێوەی موجەرەدی ئەو دیاردانەن. كەواتە ئەوانیش پێكەوە بەستراون و هاوكاریگەرن لە یەكتر ئەمەش لەبەر ئەوەی بنچینەی هەموویان یەك شتە كە جیهانی مەوزوعی‌یەو لە رووی تەجریدیشەوە هەموویان زادەی مێشكی مرۆڤن.

كەواتە لێرەدا ئەبێ جۆرە یاسایەكی تر هەبێت كە ئەم هەمەك (الكل)ە لێك بداتەوەو لە یاسای هەریەكە لەزانستەكانی تر فراوانترو هەمەلایی تربێت و هەموویان بگرێتە خۆی. ئیتر لێرەداو لە ئەنجامی كەڵەكە بوون و دۆزینەوەی ئەو حاڵەتە هاوبەشانەی لە نێوان دیاردە سرووشتی و كۆمەڵاتی‌یەكاندا هەن زانستێك دێتە گۆری كە فەلسەفەیە.

بەڵام نابێ بەو سادەیی‌یە لە مەسەلەكە بگەین كە زانستەكان لەپێشدا درووست بوون و ئینجا فەلسەفە هاتۆتە گۆری، چونكە وەك وتمان ئەوكاتە نە ئەم سەرەتا زانستانە ئەم ناوانەیان هەبووەوە نە ناویشیان زانست بووە. بەڵكو بە چەندان سەدە لەوەودوا ناوی زانستیان لێ نراو زۆریان پێ چوو تا پێرەوو ئامانجیان دەست نیشان كراو لە چوارچێوەی فەلسەفە هاتنە دەرەوە. بۆ نموونە ئەو كارانەی لە بواری نەخۆشی و نەشتەرگەری‌دا ئەكران تەنیا وەك كردار واتا وەك مومارەسە هەبوون و ناونەرابوون كاری پزیشكی یان زانستی پزیشكایەتی هەروەك لەبواری بیناسازی و ماتماتیكدا مەسەلەكە هەر مومارەسەبووەو باس لەوە نەبووە كە مەسەلە ژمارەیی‌یەكان ناویان زانستی ماتماتیكە، بەڵام ئێمە كە بەچاوی ئەمرۆ لەو پەرەسەندنە مێژوویی‌یەی فەلسەفە ئەدوێین دارشتنەكە بەم شێوەیە دێتە بەرچاو، دەنا بیری فەلسەفە زۆر لەوانە كۆنترە، نەك هەر ئەمەش بەڵكو ئەم سەرەتا زانستیانە خۆیان بیری فەلسەفین و وەك شێوە – تەجریدی‌یەكەیان لە چوارچێوەی فەلسەفدا باس كراون، بەڵام فەلسەفە وەك زانستێكی خاوەن پێرەوو ئامانج و بابەتی تایبەتی خۆی لەسەردەمێكی دواتردا ناونراو گەیشتە ئەو قۆناغەی حسابی زانستێكی سەربەخۆی بۆ بكرێ.

بەم جۆرە ئەبینین فەلسەفە كاتێك سەری هەڵدا كە چەردەیەك زانیاری زانستی (المعرفة العلمیة) دژ بە باوەڕی كوێرانە لای مرۆڤ كۆبۆوە، سەرەتاو سەرهەڵدانی فەلسەفەش واتا خەست بوونەوەی ململانێ لە گەڵ باوەڕی كوێرانەدا[١٣].

با جارێكی تریش ئەوە بڵێینەوە كە هەموو ئەو تەقەلایانەی مروف



سەبارەت بە بیركردنەوەی لە ژیانی رۆژانەی خۆی و لە بوارەكانی پێــ پزیشكایەتی و فەلەك و ماتماتیك و هتد ئەتوانین ئەمرۆ وایان دابنێین كە سەر ئەم زانستانە بوون، بەڵام هەموو ئەم سەرەتایانەو ئەفسانەو هەموو تیرۆ لێكدانەوەكانی مرۆڤ سەبارەت بە ژیانی سرووشتی و كۆمەڵایەتی.. هەموویان لە چوارچێوەی بیری فەلسەفی‌دا خۆیان ئەبیننەوە.. كەواتە ئەت بڵێین فەلسەفە «زانستێكە لە یاسا هەرە بەرین و هەمەلایی‌یەكانی سرووش كۆمەڵ و بیری مرۆڤ ئەدوێ».

بەڵام ئایا بۆچی فەلسەفە زانستە؟

بو ئەوەی لە زانستیتی فەلسەفە بگەین پیویستە پێش هەموو شتێك بنچینانە بزانین كە هەر زانستێكی لەسەر دائەمەزرێت. یان بە واتایەكی پیویستە ئەم پرسیارە بكەین:

لە سەر چ بنچینەیەك ئەم لایەنە جۆراو جۆرانەی بیرو چالاكی مرۆڤ ناون زانست؟

١ – هەر وەك لەمەوبەر وتمان زانستەكان لە بنەڕەتدا پێكەوە بەستر سەرچاوەی هەموویان – بەشێوەیەكی گشتی – یەك شتە كە سرووشتە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ كە هەموویان یەك شتن و یەك كار ئەكەن. بەڵكو یەكەیان سەربەخۆیی‌یەكی نیسبی‌یان هەیەو لە بوارێكی تایبەتی‌دا بەبە



کانت

ی هەیە کە لیّ ی ئەکۆلیّتەوەو شی ئەکاتەوەو یاساکانی ئەدۆزیّتەوە، زانستی
ث لە دیاردە فیزیکی یەکانی وەك ووزەو بارستەو راکیّشانو کیمیاش لە
ۀزە کیمیایی یەکانو کارلیّك کردنیانو زانستی ئابووریش لە بەرهەمو
زی بەرهەم هیّنانو دابەش کردنی بەرهەمو.. هتد ئەکۆلیّتەوە، هەروا
ستەکانی تریش هەریەکەیان لایەنیّکی تارادەیەك دیاریکراوی خۆیان هەیە
کاری تیادا ئەکەن.

بەم جۆرەش فەلسەفە بوارو بابەتی خۆی هەیە کە لیّ ی ئەتویّژیّتەوەو شی
ئەوە ئەویش وەك پیّشتر وتمان دۆزینەوەو شیکردنەوەی فراوانترینو
ـلایی ترین ئەو یاسایانەیە کە حوکمی سرووشتو کۆمەلّو بیری مرۆڤ
ن بە مەبەستی گۆرینی ژیانو کارتیّکردنی، بەو پیّ یەش کە یاساکانی
ـەفە فراوانو هەمەلایین، ئەبیّ بابەتەکەش فراوانترینو هەمەلایی ترین
ت بیّ، کەواتە بواری فەلسەفە هەموو گەردوون ئەگریّتەوە بەژیانی
رشتیو کۆمەلاّیەتی یەوە.
لیّکدانەوەی فەلسەفیش لە ئاستی مەسەلە گشتیو هەمەلایی یەکاندا ئەبیو

لایەنە تەسكو جۆراو جۆرەکان جیّ دیلی بۆ زانستەکانی تر.

٢ – هەر یەکە لە زانستەکان یاسای تایبەتی خۆیان هەیەو ئەو دیاردانەش کە ئەو زانستە لیّ یان دەکۆلیّنەوە لەژیّر رکیّفی ئەو یاسایانەدا بەریّوە ئەچن، بەم جۆرەش فەلسەفە یاسای تایبەتی خۆی هەیەو هەر لە بوارە فەلسەفی یەکەدا دۆزیونی یەوەو، بابەتی فەلسەفەش بە پیّ ی ئەو یاسایانە بەریّوە ئەچیّ. بەلاّم هەروەك چۆن بابەتی فەلسەفە هەموو سرووشتە بەم پیّ یەش یاساکانی لە هەموو سرووشتدا کاری خۆیان ئەکەن. کەواتە یاسا فەلسەفی یەکان لە بوارە زانستی یە تایبەتی یەکانیشدا دەوری خۆیان ئەگیّرنو زانستەکان بە پیّوەندی نیّوان هەموو دیاردەکان ئاشنا ئەکەن، بایەخی هەمەلاییو فراوانی ئەم یاسا فەلسەفی یانەش لیّرەدا دەرئەکەویّ.

٣ – بیّ گومان یاسا زانستی یەکان دروست نەکراون بەلّکو هەر یەکەیان لە بواری زانستەکەدا دۆزراونەوەو خراونەتە قالّبیّکی تیۆری یەوە بایەخیشیان لەوەدایە کە جاریّکی تر بخریّتەوە کارو لە ژیّر رکیّفی هوشیاری مرۆڤدا کارەکانیان ئەنجام بدەن، ئەمەش بە شیّوەیەکی عەفەویو کویّرانە نایەتە دی بەلّکو ئەبیّت هەر زانستیّك پیّرەویّکی خۆی هەبیّت تا بتوانیّ ئەو دەورەیان پیّ بگیّریّ، پیّرەویش (المنهج) واتا ریّبازو شیّوازی چۆنیّتی بەستنەوەیان جاریّکی تر بەواقیعەوە.

بەم پیّ یەش فەلسەفە بۆ ئەوەی دەوری خۆی بگیّریو ئەویاسایانەی لەمەودای پەرەسەنیدا دۆزیونی یەو ئەیاندۆزیّتەوە جاریّکی تر لە ژیّر رکیّفی ئەقلّی مرۆڤدا بخریّنەوە کار بۆ بەدیهیّنانی چۆنیّتی یەکی تر ئەبیّ پیرەوی تایبەتی خۆی هەبیّت.

٤ – هەر یەکە لە زانستەکان کۆمەلیّك چەمك (مفهوم)ی تایبەتی خۆیان هەیە کە تەعبیر لە لایەنەکانی ئەو دیاردانە ئەکەن کە ئەو زانستە کاریان تیّدا ئەکا وەك: چەمکی پارەو بەرهەمو ئامیّر... لە زانستی ئابووریداو چەمکی جوانیو تەناسقو.. لە ئیستا تیکاداو ئەتۆمو تاودان لە فیزیکدا... هتد. هەروا فەلسەفەش کۆمەلّە چەمکیّکی تایبەت بە خۆی هەیە وەك کاتو شویّنو بزووتنەوەو شیّوەو ناوەرۆكو ریّکەوتو ناچاری (الضرورة)و.. هتد.

٥ – هیچ زانستو بیرو چالاکی یەکی مرۆڤ هەروا لە خۆوەو بیّ هودە نەهاتوتە گۆریّ، بەریّکەوتیش نەگەیشتوونە ئەم قوناغ ئاستەی ئەمرۆیان، بەلّکو پیّویستیو ناچاری سەپاندوونیو هەر ئەم حەتمیەتەش دریّژە بەمانەوەیانو

بەرەو پێشەوە چوونیان ئەدا. کەواتە هەریەکە لەم لایەنە بیریو چالاکی‌یە کردەیی‌یانەی مرۆڤ ئەرکو ئامانجی خۆیان هەیە... جا ئایا ئەبێ ئەکو ئامانجی فەلسەفە چی‌بێت؟.

راستی‌یەکی بەلگە نەویست هەیە کەزۆر جار وتراوە تەوەو پیویستیشە بووترێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بە نرخترین شتە لەم گەردوونەدا، لە بەرئەوە ئەگەر بلێین (هەموو شتێك لە پێناوی مرۆڤدا) رەنگە زۆرمان نەووتبێ.. خۆ ئەگەر هەر چالاکی‌یەکی مرۆڤانە بگرین چ زانستی یا فەلسەفی یا ئەدەبیو هونەریو یاهەر چالاکی‌یەکی کردەیی (العملي)و لە سێ رووەوە بۆی بڕوانین دەبینین بەلای کە مەوە لە دوو حاڵەتدا مرۆڤ بنچینەیەتی: یەکەمیان ئەوەی بە چالاکی‌یەکە هەڵدەستێو ئەنجامی ئەدا مرۆڤە، دووەمیان ئەوەی چالاکی‌یەکەی ئاراستە ئەکرێو لە خزمەتی‌دایە هەرمرۆڤە، سێ‌یەمیشیان بابەتەکەیە واتا ئەوەی چالاکی‌یەکە لێ‌ی ئەدوێ لە زۆر حاڵەتدا هەر مرۆڤە وەك لە زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکانو فەلسەفەو زۆربەی زانستو کارە هونەریو ئەدەبی‌یەکانی‌تر! دیارە.

کەواتە مرۆڤ – بە شێوەیەکی گشتی – خوی تەوەری بیرکردنەوەی خۆیەتی. بەم جۆرەش ئەرکی فەلسەفە کە بەشێکی چالاکی‌و هوشیاری مرۆڤە ئەوەیە کە یاسا مەوزوعی‌یەکانی سرووشتو کۆمەڵ بدۆزیتەوەو بۆ خزمەتی مرۆڤ بیانرەخسێنیو هەوڵی گۆڕینو پێشخستنی باری ژیان‌بدا، بەڵام ئاشکرایە گۆڕانو بەرەو پێشەوە چوون واتا درووست‌بوونو سەرهەڵدانی نوێو پووکانەوەو رەتکردنەوەی کۆن. جا ئەم ململانی‌یەی نێوان کۆنو نوێش دیسانەوە لە فەلسەفەدا رەنگ ئەداتەوەو فەلسەفە بۆ دوو جەمسەری (قطب) دژ بەیەك دابەش ئەکا، هەر جەمسەرەش تەعبیر لە بوونو قەوارەی ئەو دوولایەنە دژبەیەکە ئەکا لە قۆناغێکی دیاری کراوا، لە هەمان – کاتیشا بە شێوەی پەیوەندی نیوان ئەو دوو لایەنە دەرئەکەوی. کەواتە هیچ کاتێك مرۆڤ بێ فەلسەفەو هیچ فەلسەفەیەکیش بێ لایەنگر نەبووە، با دامەزرێنەرانی ئەو رێبازە فەلسەفی‌یەش پڕوپاگەندەی بێ‌لایەنی فەلسەفەکەیان بکەن، چونکە هەر ئەم بی‌لایەنی‌یەو ئەم قسەیە خوی لایەنێکە، بە تەواوی وەك باسکاڵ ئەڵێ: «ئیمە کاتێك کە نکوڵی لە فەلسەفە ئەکەین ئەم هەلوێستە خۆی لە خۆی‌دا فەلسەفەیەکە».

یان وەك کارل یاسبرز ئەڵی: «هەڵاتن لە فەلسەفە مەحاڵە». (١٤)

**بەم چەشنە ئەبێ هەر بە فەلسەفەیەك فەلسەفەیەکی تر رەت بکرێتەوەو هەر فەلسەفەش وەڵامی فەلسەفە بداتەوە.**

**کەواتە لێرەدا گەیشتینە ئەوەی کە فەلسەفەش وەك هەمووزانە زانستە، نەك هەر ئەمەش بەڵکو هەموو زانستەکانی تري لە ئامێ بێ‌گومان پەرەسەندنی هەر لایەکیشیان - فەلسەفەو زانستەکانی تر - یەکترەوەو، هەر یەکەیان کار لەوی تریان ئەکا.**

## پەراویزەکان


١ – جون لویس / الانسان ذلك الكائن الفريد
ترجمة / د. صالح جواد كاظم / دار الرشيد – بغداد ١٩٨١
٢ – هەمان سەرچاوە
٣ – جون لويس – الانسان والارتقاء – ترجمة.عدنان جاموس – د:
.١٩٧٠
٤ – د. نورى جعفر – الفكر، طبيعته وتطوره، بغداد – ١٩٧٧
٥ – هەمان سەرچاوە.
٦ – جون لويس – الانسان والارتقاء.
٧ – حسام الالوسي – بواكير الفلسفه قبل طاليس، او من الميثولو
الفلسفة عند اليونان،
المؤسسة العربية للدراسات والنشر – بيروت – ١٩٨١.
٨ – د. طيب تيزيني – مشروع رؤية جديدة للفكر العربي الاسلامى فى
الوسيط. دار دمشق – ١٩٧١.
٩ – نوري جعفر – الفكر.
١٠ – اساطير بابلية / ترجمة سلمان التكرينى – النجف ١٩٧٢.
١١ – تشارلز لونغ – ما الميثولوجيا – ترجمة مجيد الماشطة – افاق عربي
(١) السنة الثانية عشر.
١٢ – حسام الالوسى – بواكير الفلسفة
١٣ – تيودور وايزرمان – تطور الفكر الفلسفى – ترجمة سميركرم – دار
– بيروت ١٩٧٧.
هەروەها ئەم سەرچاوانەش.
١ – ه . فرانكفورت، ه. أ فرانكفورت، جون . ١ ولسن.
جاكوبسن: ماقبل الفلسفة – ترجمة جبرا ابراهيم جبرا ط (١)
٢ – د. حسين حربه – الفكر اليونانى، قبل افلاطون – دار الفارابى – بـ
.١٩٨١
٣ – محرر شفيق شبا – في الادب الفلسفي – بيروت ١٩٨١.

كۆكردنەوەو ئامادەكردنی: سعد الله اسماعیل شێخانی

# چەند نموونەیەك لە بیروباوەڕی فۆلكلۆری كوردەواری

ئەگەر بەوردی سەرنجێك بدەینە خەرمانەی كەلەپووری كوردەواریمان تووشی زەمەندو زەندۆڵی قوڵی بێ بنی زانستی‌و زانیاری دەبین، چونكە بیروباوەڕی كۆنینەی كوردەواری وەك خاكێكی زۆر بەپیت‌و بەرەكەت دەبێ بژالگی گوڵی گەنم‌و جۆیەكانی بگاتە نێو دەستی سەپانی دەست ڕەنگین.

بۆیە دەمەوێ خزمەتێكی تری نەتەوەكەم بكەم بە خستنە ڕووی چەند بیرو باوەڕی ڕێك‌و پێك كە هەمیشە وەك یاسایێكی ڕێكخراو كەوا ساڵەهای ساڵە پەیرەو كراوەو لەسەری دەڕۆن كە ئەویش چەند بارێكی ئازایەتی‌و زیرەكی‌و بیرتیژی‌و دامەزراندنێكی چاك نیشان دەدات‌و هەندێكیش لەوانەیە هەر لە وتن‌دا خۆش‌و لەبار بووەو لەگەڵ بیرو باوەڕ تاقیان كردۆتەوە.

• بۆ خۆ پاراستن لە چاوەزار (بەچاو چوون) (نەفەس) چاوپیسی لە كوردەواری جگە لە نوشتەو دوعا ئەم شتانەی خوارەوەش بەكار هاتوون: —

١ — لەپكەشینە (پیرۆزە) لە شان‌و ناوچەوانی منداڵ دەدوراو قایم دەكرا.

٢ — قەرسەقول‌و سەرگین‌و توێكلی هێلكەی ژێر مریشكە كورك لەسەر ڕەوسەی (خەرمانی) دەغڵ‌و دان گەنم‌و جۆ دانەوێڵە دادەندرا.

٣ — گوو سەگیان لەناو شتێك دەدوری‌و لە كورتان‌و ناوچەوانی وڵاخ دەدوراو قایم دەكرا.

٤ — كۆنە ناڵی وڵاخیان لە سەردەرەی خانوو ئۆتۆمبیل‌و شتی گەورە هەڵدەواسی، چونكە دەڵێن شەیتان لە شتی وەكو ناڵ دەترسێ‌و ناوێرێ ڕوو لەو شوێنانە بكات ناڵی لێ درابێ.

٥ — چەقاندنی هێسكی كەللەی سەری وڵاخ لەناو باخچەو بێستان‌و خەرمانی سەر ڕێگا كە جگە لە چاوپیسی وەك داوڵ بۆ ترساندنی باڵندەو ئاژەڵە زیان بەخشەكانیش بەكار دەهات.

لەم حاڵانەی كە باسمان كرد بیرۆ باوەڕیان وابوو كە چاوپیسی هەر بە پیسی لادەچێ بەڵام خاڵی گرینگ ئەوەیە كەوا بەكارهێنانیان سەرنجی سەرنج دەر لە شتە سەرەكیەكە دەگۆڕێ بۆ شتە بچووكەكە كە سەیری ڕەوسەكەی دەكرد یەكسەر قەرسەقولەكە سەرنجی ڕادەكێشا بۆیە ئاگای لە زۆری‌و كەمی خەرمانەكە نەدەماو بەڵكو بێزیشی لێ دەبووەوە.

یان بینیی هێسكی كەللەی سەر ئەگەر هی وڵاخیش بوایە ترسی مردنی لە دڵی بینەردا پەیدا دەكرد.

• بۆ حەز لێك كردن‌و بە یەكتری گەیشتن‌و سەركەوتن لە كارو فرمانی ڕۆژانە جگە لە نوشتەو دوعاو چوونە سەر گۆڕی پیاو چاكان‌و خێر لە خۆگرتن ئەمانەش بەكار هاتوون.

١ — هەڵگرتنی هێسكی پەپولە سولەیمانە (پەیامبەری حەز لێك كردنی سولەیمان پێغەمبەرو بلقیس بووە).

٢ — هەڵگرتنی جگە گورگ، (گورگ هەرچەندە كەوا درندەو ترسناكە بەڵام لە ڕاوكردندا زیرەك‌و ئازایە ئەویش وادەزانن كە بەهۆی هێسكی جگی چۆكیەوەیەتی). ئەمەش بۆ ئەوەبوو تاكو خەڵكەكە گورگ بكوژن كە دوژمنە گەورەی مەڕو ماڵاتە.

• ئەوەی ئاو لەناو لاباڵی شەمشەمە كوێرە بخواتەوە بیرتیژو زیرەك دەبێت. شەمشەمە كوێرە چاوەكانی بێ هێزن، بە ڕۆژی ڕوناك نابینن كەچی بە شەوی تاریك دەچێتە ڕاوو دەگەڕێتەوە ناو كونەكەی خۆی.

دیارە پێشینان هەستیان بە زیرەكایەتیەكی شاردراوەی شەمشەمە كوێرە كردووە، ئەویش بە هۆی دەنگ‌و دەنگ دانەوەو زۆر بەهێزی هەستی بیستنیەتی لەوانەیە ڕاداریش هەر لەسەر ئەم بیرە داندراوە (نووسەر).

• كەڵەباب لەپاش ڕۆژ ئاوابوون تا ماڵ خەوتنان بانگ بدات دەڵێن: — (كەڵەبابی ژن زیزان) واتە كابانی ماڵ تووشی ئاژاوەو شەڕو تۆران دەبێت.

كەڵەباب دەستورێكی تایبەتی هەیە لە بانگ‌دان لە كاتەكانی شەودا وەك نیوەشەوو پارشێوو بەیانی، مەلا بانگ دانی بەیانیانی كەلەشێر هۆیەك بووە بۆ زانینی كاتەكانی شەو جا ئەم كەڵەبابە گێلەی شەوی لێ دەگۆڕێت‌و ئەم دەستورە تێك دەدات بۆ ئەوە باشە كابان لێی بترسێ‌و سەری ببڕێت.

• ئەو ماڵەی پەلكە نانی (لەتەنان)ی زۆر لە ماڵدا بڕژێت خودا هەژارونەبوونیان دەكات، ئەوەی پێ لە پەلكەنان بنێت خودا چاوی كوێر دەكات. دەڵێن: پەلكەنان حەفت پەڕی لە قورئان گەورەترە.

زۆر جاریش سوێند بە نان دەخورێت لە جیاتی قورئان، بۆ ئەوە بووە تا خەڵكەكە دەست بەنانەوە بگرن‌و نرخی بزانن چونكە خۆراكێكی سەرەكی

ئادەمیزادە.

**• مێش هەنگوین مێش بوەو فرمێسکی چاوی پێغەمبەرێکی خواردۆتەوەو بوە بە هەنگوین، هەنگوین خواردنی بەهەشتەو حەفت دەرد دەپەڕێنێ.**

**هەر کەسێك مێش هەنگوین بکوژێت یان شانەی (پورەی هەنگ) تێك بدات وەك ئەوە وایە کە قورئان بسوتێنی، (تا گرنگی بە بەخێو کردنی هەنگ بدەنو سوودی لێ وەربگرن).**

**• کوشتنی یان تێك دانی هێلانەی پەرەسێلکە (تەیری مەکەو مەدینە،) مالی کاول دەبێتو کەس لە مالی نامێنێ، (پەرەسێلکە قورئان دەخوێنێ).**

**پەرەسێلکە ژیانی لەسەر زیندەوەرە زیان بەخشەکانە، هەروەها مەلێکی بێ زیانو زەرەرە دەلێن پەرەسێلکە دەلێ:**

**ئاوی دەبەم لە مەدینێ**
**قوری دەبەم لە قورەشینێ**
**هەرچی هێلانەم لێ تێك دەدا،**
**کەسیان لە مالیدا نەمینێ.**

• حاجی لەق لەق کوشتن یان هێلانە تێکدانی وەك کوشتنی حاجیێك وایە دەلێن: —

(حاجی لەق لەق حاجی بوەو گەنم کڕ بوە درۆی کردوەو فێلی لە پێوانەی گەنم کردوە خوداش ڕقی لێ هەستاوەو لەسەر شێوەی مرۆڤی لابردووە).

نەکوشتنی حاجی لەق لەق بۆ زۆر بونیانو... خواردنی کوللەو مارو زیندەوەرە زیان بەخشەکانە.

دەلێن: — (قەلەڕەشکەش درۆزن بوەو خودا رووی ڕەش کردوە) درۆ کردنو فێلبازی دۆو نەریتی زۆر ناشیرینن هەر کەسێك بیانکات خودا ڕقی لێ دەبێتەوەو خەلکیش خۆشی ناوێ.

• ئەوەی پشیلە بکوژێت مالی بێ کابان دەمێنێتەوە چونکە پشیلە پشتی ملی ئەو مارەی گرتووە کە ویستویەتی بە پێغەمبەری خوداوە بدات لەکاتی نوێژکردندا. تا پێغەمبەر لە نوێژ بۆتەوە، ژیانی پشیلە لەسەر مشكو جرجو شتی زیان بەخشە جا نەهێشتنیان سوودی مرۆڤی تیدایە.

• ئەوەی سەگێك بکوژێت کارەساتی دلتەزێنی دێتە ڕێگەو خودا ئازاری دەدات، دیارە سەگ گیاندارێکی مالی (کەوی) بە ئەمەکەو پاسەوانی مرۆڤو مەرو مالات دەکات.

دەلێن سەگ دەلێ: — خودایە خاوەنەکەم حەفت کوری کارکەری هەبێ ئەگەر هەریەکە نانێکم بدەنێ لە ڕۆژێکدا ئەوا حەفت نانم دەبێ.

کتك دەلێ: خودایە لە مالێك دا بم تەنها پیرەژنێکی کوێری تێدابێ تا بتوانم خواردنی لێ بدزم. ئەم ووتەیە نیشانەیە بۆ بە ئەمەکی سەگو چاو برسیەتیو بێ ئەمەکی پشیلە.

• ئەگەر هاتو ژنێك زگی هەبوو مێردەکەی مرد دەبوایە لە کاتی بلند کردنی تەرمی پیاوە مردووەکە ژنەکەی سێ جار بەژێر تەرمەکەیدا بڕۆیشتبایە ئینجا هەموو کەس دەیزانی کە ئەو ژنە سکی هەیە، تاکو خەلکەکە دوای مردنی مێردەکەی بوختانی پێوە نەکەنو بزانن ئەو زگە لەو پیاوەیە.

• لەکاتی پارە ژماردنو ڕەوسە برکردندا ناوی ژمارەی سێزدە نالێنو دەلێن: (زیادە) تاکو شتە ژمارداراوەکە بەرەکەتی تێبکەوێو کەم نەکات، ژمارەی سێزدە بە ژمارەیەکی بەد داندراوەو خۆی لێ دەپارێزن.

بەلام ژمارەی سێو ژمارەی حەفت بە ژمارەی باشو پیرۆز زاندراوە.

• دەلێن: ئەگەر مەڕ سینگی لە بای زستان کرد ئەوا بەهاری خۆش دەبێ، ئەگەر پشتی تێ کرد ئەوا قڕی تێ دەکەوێو گیاو گول کەم دەبێ.

• دەلێن: کابان بەشەو جێگایەك بمالێت پێشتر سەری گەسکەکەی بە ئاگر دەکات ئنجا دەست بە مالینی جێگایەکە دەکات. گوایە جنۆکە شەو بلاودەبنەوە بەلام کە ئاگریان بینی ئەو جێگایە چۆل دەکەن.

• دەلێن ئێواران زوو نانی مەخۆن نەوەك مێوانتان بێ، بەیانیان زوو نان بخۆن نەوەك هاوارتان بۆ بێ.

• أ — هەر کەسێك حەفت مار بکوژێت بۆی بە حەجێك دەنوسرێت.

بەتایبەتی ماری شینەگانگێوی ژەهردار، تاکو ماری زیان بەخش لەناو ببرێ.

ب — لە بەهاران لە کاتی جووت بوونو زاوزێ کردن هەرکەس دوو ماری جوتی (ئاشقەو ماشقە)ی پێکەوە دیت دەبێ هەردووکیان بکوژێت ئەگەر مارێکی کوشتو یەکی دەرباز کرد ئەوە مارە نەکوژراوەکە بە دوای ئەم کەسەدا دەگەڕێت چەند گوندو جێگا بکات بە دوایدا دەڕوات تا تۆلەی دلدارەکەی دەسێنێتەوەو پێوەی دەدات.

ج — هەر هەمان شتە بەرامبەر کوشتنی بێچوو هێلکەی ماری کورك کڕ ئەگەر دایکانەکەشی نەکوژرێت.

د — ماری ڕەش لە زۆر ناوچەدا ناکوژرێت دەلێن: مارەکانی تر دەخواتو دژایەتی مرۆڤ ناکات ئەگەر ئازار نەدرێت.

هـ — ماری ناو گۆڕستانو سەر مەزارگەی پیاو چاکان لە زۆر ناوچەدا ناکوژرێت دەلێن پارێزگاری گۆڕستان دەکات.

**• ئەم بابەتە فۆلکلۆریەم لەم بەرێزانە وەرگرتووە:**

حاجی حوسێن نەبێ، صدر الدین نور الدین، فتح الله شیخانی..

• مامۆستا کەریم شارەزا، داود محەمەد شرۆلێ پێداچونەتەوەو هەندێ نادروستیان بۆ دروست کردوم.

• ئەم بیرو باوەڕە فۆلکلۆریانە بەراورد کراوە لە گەل ئەم کتێبانە

١ — ڕشتەی مرواری، علاء الدین سجادی، تاقی کراوەکانی کوردی.

٢ — باوەڕی کۆن، ئومێد ئەحمەد، سلێمانی، ١٩٨١.

٣ — سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە، لقی نەقابەی مامۆستایانی لقی هەولێر.

٤ — دابو نەریتی کوردەواری، محمود بایەزیدی، د. شکریە رسول وەری گێڕاوەتە سەر کوردی.

٥ — لەگەل سەرجەمی ئەم گۆڤارو ڕۆژنامانە: هەتاو، ژین، دەنگی مامۆستایان، کاروان، بەیان، ڕۆژی کوردستان، هاوکاری...

• ○

شانۆگەریی ژمارە

شانۆگەری لە پەردەیەکدا



# شەوێکی باراناوی

○

نووسینی: أسماعیل أكبر محمد

و: طاهر صالح سعيد

○

(ژووری ئونیلیٹ)

ژوورەکە دوو جێگەی نوستن‌و مێزێکی بچکۆلەی تیایە.. لە دەرەوە باران ئەبارێت.. دەنگی هەورە بروسکە دەبیسترێت . جارجار بە هۆی بروسکەکەوە ژوورەکە ڕۆشن ئەبێتەوە..

دەرگای ژوورەکە لەسەرخۆو بە وریایی‌یەوە ئەکرێتەوە.. پیاوێك دێتە ژوورەوە، کە تەمەنی لە دەوروبەری چل سالی دایە، ژوورەکە ڕووناك ئەکاتەوە.. بە ئارامییەکەوە ئاهێك هەڵئەکێشێت.. مشەماکەی دائەکەنێت.. بێ هوودە بە دووای عەلاگەیەك دا ئەگەڕێت.. بزمارێکی بچووك بە دیوارەکەوە ئەدۆزێتەوە ..سەر لە نوێ ئاهێك هەڵئەکێشێتەوە.. گڵۆپەکە ئەکوژێنێتەوە.. خۆی ئەکات بەژێر جێگەیەکیاندا.. برووسکە ژوورەکە ڕۆشن ئەکاتەوە.. پیاوەکە بە دەم ترسەوە ڕائەپەڕێت.. سەیری پەنجەرەکە ئەکات.. پەردەکە دائەداتەوە .

دەنگی لیزمەی بارانەکە لە دەرەوە بەتین‌تر ئەبێت .

دووای تاوێك دەرگای ژوورەکە ئەکرێتەوە .

پیاوەکە: (بەخێرابێ هەڵئەستێت) کێ‌یە؟ ئەوە کێ‌یە؟

لاوێك کە لە تەمەنی بیست‌و پێنج ساڵیدایە دێتە ژوورەوە.. ژوورەکە ڕۆشن ئەکاتەوە..

لاوەکە: (بە دەم داکەندنی مشەماکەیەوە) ببوورە.. وا دیارە هەراسانم کردیت..

پیاوەکە: (دێتەوە سەر خۆی) نەخێر.. هەرگیز.. «بێ دەنگی» بارانەکە هەر بە خوڕ ئەبارێت؟

لاوەکە: بەڵێ

پیاوەکە: چەند قینم لە زستانە

«لاوەکە بەدوای عەلاگەیەکدا ئەگەڕێت مشەماکەی پیا هەڵواسێت»

پیاوەکە: خۆت ماندوو مەکە.. عەلاگەی تیا نی‌یە.. بە دووای شتێکی تردا بگەڕێ مشەماکەی پیا هەڵواسیت .

«هەراسانی پێوە دیارە.. لە سووچێکی ژوورەکەدا چاوی بە بزمارێك ئەکەوێت.. هەناسەیەکی ڕەحەتی ئەدات»

لاوەکە: (دوای ئەوەی گڵۆپەکە ئەکوژێنێتەوە خۆی ئەکا بەناو جێگەکەدا) زۆرم هەراسان کردیت؟

پیاوەکە: نەخێر.. نەخێر

لاوەکە: هەست ئەکەم ژوورەکە تاریکە؟

پیاوەکە: ڕاستە

لاوەکە: چەند لە تاریکی بێزارم

پیاوەکە: منیش

لاوەکە: تۆ سەرو مڕ لێرەی؟

پیاوەکە: نەخێر چەند دەقیقەیەك پێش تۆ هاتووم

لاوەکە: ئوتێلێکی کۆنە

پیاوەکە: بێگومان

لاوەکە: لەوە ئەچێت زۆر ماندوو بیت (باوێشك ئەدات)

پیاوەکە: من . ڕاستە.. لەوە ئەچێت تۆش ماندووبیت (باوێشك ئەدات)

لاوەکە: شەوباش

پیاوەکە: شەوباش

«بێ دەنگی..»

لەدەرەوە دەنگی برووسکە دێت.. چەخماخە لە پشت پەردەکەوە ژوورەکە ڕوناك ئەکاتەوە ..دەنگی پرخەی لاوەکە بەرز ئەبێتەوە .

پیاوەکە بەپەلە ڕائەپەڕێت.. چراکە هەڵ‌ئەکات لاوەکە: (بەترسەوە) ئەمەچییە؟ ئەوەکێیە؟

پیاوەکە: (ئەڕوانێتە بن میچەکە) هیچ نی‌یە.. هیچ نی‌یە .

لاوەکە: چی‌بوو؟ چی ڕوویدا ؟

پیاوەکە: تەنیا.. (بێ‌دەنگ ئەبێت).. «ئەڕوانێتە بن میچەکە»

لاوەکە: «لەسەر جێگەکەی دائەنشێت» تەنیا چی؟

پیاوەکە: «چاوی هەڵئەگلۆفێت»وام زانی‌دووپشك بە بن میچەکەوەیە

لاوەکە «بە دەم ترسەوە هەڵئەستێت» چی؟

پیاوەکە: ووتم.. وابزانم

لاوەکە: (سەر زەوییەکەو ژێر نوێنەکان ئەگەڕێت)گەورە بوو؟

پیاوەکە: وابزانم.. وابزانم وابوو

لاوەکە: ڕەنگی چۆن بوو؟

پیاوەکە (بیرئەکاتەوە) ڕەنگی.. نازانم.. وابزانم ڕەنگی نەبوو

لاوەکە: چۆن!؟

پیاوەکە: (جارێکی‌تر چاوی هەڵئەگلۆفێت) ڕەنگە بە هەڵەدا چووبم

لاوەکە: (بە سووچەکاندا ئەگەڕێت) تۆ دڵنیایت؟

پیاوەکە: لە چی؟

لاوەکە: کە بەهەڵەدا چوویت؟

پیاوەکە: (بەدەم بیرکردنەوەوە) ڕەنگە.. بەهۆی چاوەکانمەوە بوو بێت «چاوی هەڵئەگلۆفێت» ..ئەڕوانێتە بن میچەکە

لاوەکە: بەلام.. (ئەوەستێت)

باشە.. لەوانەیە سیسرك..یان مار بووبێت

پیاوەکە: (بە دوو دڵی‌یەوە) بەلام وابزانم کە ئەوە...

لاوەکە: (بەتوورەیی‌یەوە) وا ئەزانیت یاخود دڵنیایت..؟

پیاوەکە: بەڵکو.. بەڵکو. دڵنیام

لاوەکە: دووپشکێکت دیبێت؟ «چاوەکانی دەبڕێتە بن‌میچەکە بە دووایدا ڕووەو دیوارەکەو بەپێچەوانەوە»

پیاوەکە: ووتم.. ڕەنگە

«کەمێك بێ دەنگی»

لاوەکە: بەهەرکەسێوە بات ئەیکوژێت

پیاوەکە: من لە دووپشك ئەترسم

لاوەکە: چاوەڕووانی چی ئەکەیت؟

پیاوەکە: (بەشلەژاوی‌یەوە) چی؟ چی‌بکەین؟

لاوەکە: باژوورەکە بگەڕێین..«دەکەونە گەڕان»

پیاوەکە: ڕەنگە.. چووبێتە کونێکەوە

لاوەکە (ئەڕوانێتە بن میچەکە) هیچ کونێك ئەبینیت؟

پیاوەکە: (تێ ڕائەمێنێت) نەخێر

لاوەکە: ڕەنگە کەوتبێتە خووارەوە

پیاوەکە: (بەترسەوە) لە کوێ.. گیرفانەکانی ئەپشکنێت»

«بێدەنگی.. بەجووتە ئەگەڕێن»

لاوەکە: بیستوومە کە یەکێك بە دووپشك مردووە

پیاوەکە: (بەحەپەساوی‌یەوە) بەڕاست!؟

لاوەکە: بە خێرایی پێوە ئەدات

پیاوەکە: بە.. بەخێرایی!؟

«پیاوەکە بەرەو لای مشەماکەی ئەچێت»

لاوەکە: بۆ کوێ؟

پیاوەکە: ئەچمە دەرەوە

لاوەکە: بارانە.. ڕەنگە ئوتێلێکی نزیکیشت دەست نەکەوێت

«دەنگی چەخماخە.. باران بە خوڕ دەبارێت..»

پیاوەکە: (بە دوو دڵی‌یەوە.. مشەماکە ئەکاتەوە بە شوێنی خۆیدا) بەلام لێرەدا

بە دیوارەکەدا هەڵئەگەڕا .

«هەدووکیان بەردەوامن لەگەڕاندا»

لاوەکە: وابزانم بەهەڵەدا چوویت؟

پیاوەکە: ڕەنگە

لاوەکە : (بەتووڕەیی‌یەوە) بەڵکە بە دڵنیایی‌یەوە

پیاوەکە (بیرئەکاتەوە ڕەنگە.. (بێدەنگی) ڕاستە

لاوەکە: (بۆ جارێکی تر ئەچێتەوە ناو جێگەکەی) لە بیرت نەچێت گڵۆپەکە بکوژێنەرەوە

پیاوەکە: (بەترسەوە) گڵۆپەکە بکوژێنمەوە؟!

لاوەکە: بەڵێ

پیاوەکە: بەلام.. ئەی دووپشکەکە؟

لاوەکە (بە ماندوێتی‌یەوە) بە جەهەنەم.. ماندووم

پیاوەکە: ووتت ژەهرەکەی کوشندەیە

لاوەکە: (لە ژێر جێگاکەوە) هەندێ دووپشك.. هەموویان نا

پیاوەکە: کەواتە بە ڕوناکی دائەنیشم .

لاوەکە: (ڕاست ئەبێتەوەو دائەنیشێت) بە ڕوناکی خەوم لێ ناکەوێت

پیاوەکە: هەر ئەمشەو.. تکات لێ ئەکەم

لاوەکە: (سوورە لەسەر قسەکەی) بەڕوناکی خەوم لێ ناکەوێت.. پێویستە بەیانی فەحسی چاوت بکەیت

پیاوەکە: (دەست بە چاویا دێنیت) چاوم!؟

لاوەکە: بێگومان

پیاوەکە: بەڵام بەڕوونی شت دەبینم

لاوەکە: من وای نازانم

پیاوەکە: بەڕاست گومانت لە چاوەکانمە؟

لاوەکە: (بەبێزاری‌یەوە) تکات لێ ئەکەم قسەکردن سوودی نی‌یە.. پێت ئەڵێم کە بچیت بۆ لای دوکتۆرێکی چاو.. (سەری دائەپۆشێت)

پیاوەکە: (هەڵدەستێت‌و بەدەوری خۆیدا چاو ئەگێرێت . پاشان ئەڕوانێتە بن میچ‌ودیوارەکان) چاکتر وایە بچم بۆ لای دوکتۆرێکی چاو

لاوەکە: (لە ژێر جێگەکەوە) زۆر چاك دەکەیت

«چراکە ئەکوژێنێتەوە.. خۆی ئەکاتەوە بەژێر جێگەکەدا»

«پێی ئەچێت.. لە دەرەوە دەنگی چەخماخەدێت.. بروسکە ژوورەکە ڕۆشن ئەکاتەوە..

پرخەی لاوەکە بەرز ئەبێتەوە»

پیاوەکە ڕاست ئەبێتەوەو دائەنیشێت.. ئەڕووانێتە بن میچەکە.. چاوی هەڵئەگلۆفێت..

بەخێرایی ڕائەپەڕێت‌و چراکە هەڵئەگیرسێنێت . ئەڕووانێتە بن میچەکەو هەناسەبرکێ‌یەتی‌لاوەکە پرخەی دێت.

پیاوەکە لێی وورد ئەبێتەوە (بەتوڕەیی‌یەوە) بە بن میچ‌و دیوارو زەوی‌یەکەدا ئەڕوانێت

پیاوەکە: (دەوەژێنێتە قاچەکانی لاوەکە) هەستە.. هەستە

لاوەکە: (بەپشۆکاوی‌یەوەڕائەپەڕێت) چی‌یە؟ چی ڕووی داوە؟

پیاوەکە: (ئیشارەت ئەکات بۆ بن میچەکە) لەویا.. دیسانەوە دیمەوە

لاوەکە: (چاو هەڵئەگلۆفێت) دڵنیایت؟

پیاوەکە: بەڵێ.. بەڵێ

لاوەکە: هەمان دووپشك؟

پیاوەکە: کت‌ومت خۆی بو.. بە هێواشی ئەجوولایەوە .

لاوەکە: (بە دەم باوێشك‌دانەوە) ئەی چیت کرد؟

## پیاوەکە: بەگورجی راپەریم و هەلگیرساند

لاوەکە: ئەویش خۆی شاردەوە!؟

پیاوەکە: بەڵێ.. لەوانەیە.. بەربوبێتەوە سەر زەوی‌یەکە.. یان سەر جێگاکان

لاوەکە: بەڵام نەختێك لەمەوبەر زۆر گەراین بەدوایدا بێ سوود بوو

پیاوەکە: برووام پێ‌بکە دووپشکێکی زل بوو

لاوەکە: ئەبێ لە کوێ خۆی شاردبێتەوە؟ با بەدووای کونێك دا بگەرێین.. رەنگە چوبێتە ناوی‌یەوە

«بەدوواییا ئەگەرێن..»

پیاوەکە: ئەمرووانی‌یە بن میچەکە.. لەسەر خۆ ئەرۆیشت

موچورکم پیاهات.. وتت بەیەك پێوەدان دەکوژێت (دەوەستێت)

بەپەلە هەڵسام.. زۆر بەگورجی گڵۆپەکەم داگیرساند

«ناو جێگاکانیان ئەگەرێن»

لاوەکە: تۆ بۆ نزیك‌بینی‌و دووربینی چۆنی؟

پیاوەکە: بەخۆمەوە نەدیوە بۆ لای هیچ دوکتورێك چووبم

لاوەکە: (بەتوورەیی‌یەوە) بەڵام ئەی ئەو دووپشکە دووا براوە.. بۆ.. بۆ وا بەخێرایی گوم دەبێت

پیاوەکە: بە دەم بیرکردنەوەوە) باشە.. ئەتەوێت بروام پێ‌بکەیت؟

لاوەکە: بروات پێ بکەم!

پیاوەکە: با جێگاکانمان بگۆرینەوە

لاوەکە: (کەمێك رارابە) باشە.. «گڵۆپەکە ئەکوژێنێتەوە»

«هەریەکەیان لە شوێنی ئەوی‌تریان رائەکشێت»

«ماوەیەك تێ نەپەرێت.. سەر لە نوێ دەنگی پرخەی لاوەکە بەرز ئەبێتەوە»

دەنگی هەورو چەخماخە لە دوورەوە ئەبیسترێت. باران بە خور ئەبارێت. پیاوەکە راست ئەبێتەوەو لەسەر جێگەکەی دائەنیشێت.. بە تاریکی ئەروانێتە سەعاتەکەی.. سەری بائەدا.. سەیری بن میچەکە ئەکات.. رائەکشێت. دەنگی تەقە دێت.

پیاوەکە رائەچڵەکێت.. هەڵئەستێت‌و دائەنیشێت.. هەناسەبڕکێیەتی.. بە دەزری خۆیدا ئەروانێت.. ئاور بەلای پەنجەرەکەدا ئەداتەوە.. چاو لەسەر

بن میچەکە رائەگرێت. دیسان رائەکشێتەوە.. لە رارەوەکەوە دەنگی پێ‌دێت..

راست ئەبێتەوەو دائەنیشێت.. گوێ هەڵئەخات.. دەنگەکە نامێنێت.

هەناسەیەکی رەحەتی ئەدات.. لێی رائەکشێتەوە.

کری‌و بێدەنگی درێژە ئەکێشێت

پرخەی لاوەکە بەرزو نزم ئەبێتەوە

یەك لە دووای یەك دەنگی لێدانی دەرگای ژوورەکە یەت

پیاوەکە: (بەدەنگێکی بەزرەوە) ئەوە کێ‌یە؟

(لاوەکە هەڵئەستێت)

لاوەکە: ئەو هاوار هاوارەت لە چی‌یە؟

پیاوەکە: (هەڵئەستێت‌و بە پێوە ئەوەستێت) ببورە.. نەخێر.. دەرگاکە ئەکرێتەوە

دەنگ: (لەودیوەوە) ژووری بیست‌ویەك

پیاوەکە: (لەژوورەوە) نەخێر

دەنگەکە: ببوورە

دەرگاکە دائەخاتەوە.. گڵۆپەکە هەڵئەکات

لاوەکە: (لە ژێر جێگەکەیەوە) چاکتر وایە گڵۆپەکە بکوژێنیتەوە

لە ژێر جێگەکەوە خۆی گرمۆڵە ئەکات

بێ دەنگی‌یەکی بەردەوام.. دەنگی پرخە بەرز ئەبێتەوە.

دەنگی هاواری ئافرەتێك.. پیاوەکە لەناو جێگەکەیەوە قەڵەمباز ئەدات.. رووەو لای پەنجەرەکە ئەچێت‌و پەردەکە لا ئەدات.. سەری ئەنێت بە شووشەکەوە..

رۆشنایی هەورە تریشقەکە ژوورەکە رووناك ئەکاتەوە.

باران بەخور ئەبارێت.

لەسەر نووکی پێی ئەگەرێتە دوواوە.

ئەروانێتە بن میچەکەو ئینجا زەوی‌یەکە.. ئەچێتەوە ناو جێگەکەی..

بێ دەنگی‌یەکە بەردەوامە.. پرخەکە لە بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەدایە.

جار جار سووکە دەنگێك لە رارەوەکەوە دێت.. دنیا هێمنە.. هەورە بروسکە ژوورەکە رۆشن ئەکاتەوە.. دەنگی هەورە تریشقە یەت.. بێدەنگی

لەپرا.. پیاوەکە لەسەر جێگەکەیەوە باز ئەدات.. گڵۆپەکە هەڵئەکات.. بە توندی

چاوی هەڵدەگڵۆفێت‌و هەناسە برکێ‌یەتی

پیاوەکە: (بەدەنگێکی بەرز) بروا ناکەم.. بروا ناکەم.

پرخەکە نامێنێت.

لاوەکە( بەلەتردانەوە هەڵئەستێت)لام‌وایە دیسانەوە وون بووەوە

پیاوەکە(بە دڵێ نیایی‌یەوە) بڕوام پی‌بکە بە بن میچەکەوە بەسەر جێگەکەی تۆوە بینم .

لاوەکە: جێگەکەی من ؟

پیاوەکە: بەڵێ.. بەڵێ

لاوەکە: دڵێ نیایت؟

پیاوەکە: بڕوام پی‌بکە

لاوەکە: بەلاّم لەسەر جێگەکەی تۆ بو.و(ئەڕوانێتە بن میچەکە)

پیاوەکە: ڕەنگە جی‌گۆڕکی‌ی کردبێت .

لاوەکە: (بە ووریایی‌یەوە ئەڕوانێتە بن میچەکە) لەوە ئەچێت ئەم شەو خەوم لێ نەکەوێت .

پیاوەکە: بنویت‌ودوویشك بە سەر سەرتەوە بێت .

لاوەکە: ئەگەر ئەزانیت کە من چەند ماندووم (باوێشك ئەدات)

پیاوەکە: هەروەها منیش (باوێشك ئەدات) . بڕوام پێبکە.. بەلاّم بە پێوەدانێکی هیچو پووچ بمرم (بێدەنگ ئەبێت)

لاوەکە: تۆ ئەڵێی چی؟ توانایی بیرکردنەوەم نەماوە .

پیاوەکە: بانەخەوین

لاوەکە: (بە دوو دڵی‌یەوە) تابەیانی؟!

پیاوەکە: (ئەڕوانێتە سەعاتەکەی) بەتەواوی نیوەی شەوە.. ئەتوانین بەدەم قسە کردنەوە ئەم ماوەیە بەسەر بەرین ..

لاوەکە: (باوێشك ئەدات) چاکە.. (بێدەنگ ئەبێت) تابەیانی.. نا من ماندووم .

پیاوەکە: تەنیا شەوێکەو ئەبڕێتەوە .

«ئەڕوانێتە بن میچەکە» قسەی قۆڕە من یان تۆ بە پێوەدانی دوپشکێك بمرین .

«بێدەنگی»

لاوەکە: (بەدەم پیاهەڵڕووانینەوە) ئەڵێی چی؟

پیاوەکە: کە بمرین.. من.. یان تۆ

لاوەکە: بمرم؟!

پیاوەکە: لەو بڕوایەدای لە کاتێکی‌وادا فریامان کەون، پێت نەووتم کەسێك بە ژەهری‌دووپشك مردووە؟

لاوەکە: (بیری ئەکەوێتەوە) لەوانەیە.. وایە.. هاوڕێیەکم ئەمەی پی‌ ووتم .

پیاوەکە: کارێکی دڵێ تەزێنە مرۆڤ لە تەمەنی لاویدا بمرێت .

«بێدەنگییەکی کەم»

لاوەکە: هەندێ جار واهەست ئەکەم.. (ئەوەستێت).. هەندێ جار وا هەست ئەکەم کە مردنم پێ خۆشە .

پیاوەکە: هەمووومان.. هەندێ جار وا بیرئەکەینەوە.. (ئەڕوانێتە بن میچەکە) بەلاّم مردنێکی‌وا هیچ‌وپووچ‌نا.. بڕوام پی‌بکە..

«لاوەکە بەترسەوە ئەڕوانێتە بن میچەکەو ئینجا زەوی‌یەکەو پاشان جێگەکە»

پیاوەکە: با تا بەیانی بمێنینەوە یان.. با بڕۆین .

«دەنگی لێزمەی باران یەت»

لاوەکە: «ئەڕوانێتە سەعاتەکەی» ئوتێلێکی نزیکمان دەست ناکەوێت.. کاتیش زۆر درەنگە .

پیاوەکە: چاکە با پێکەوە دانیشین.. باس لە شتێك بکەین.. هەر باسێك بێت «بێدەنگی..»

لاوەکە: (بەدەم بیرکردنەوەوە) باشە.. (باوێشك ئەدات) با بە نۆرە بخەوین .

(بۆ جارێکی‌تر باوێشك ئەدات) با لەپێش‌دا من بنووم

پیاوەکە: (بە دوو دڵی‌یەوە) زۆر باشە.. بەلاّم

(لەپڕ کارەبا دەکوژێتەوە)

پیاوەکە: (بە ترسەوە) چی بو؟

لاوەکە: (بەدەنگێکی ترس ئامێزەوە) وا دیارە بارانەکە کاری کردۆتە سەر تەلی کارەباکان .

پیاوەکە: (دەنکێ شقارتە هەڵئەکات) ئێستە چی بکەین؟

لاوەکە: پێویستمان بە مۆمە..

پیاوەکە: (دەنکێ شقارتە هەڵئەکات) ئەچم بۆ لای ئوتێل‌چی‌یەکە ..ڕەنگە ئەو مۆمی لابێت .

(لەوەدایە بچێتە دەرەوە)

لاوەکە: (بەدوو دڵی‌یەوە) بوەستە (ئەوەستێت)

پیاوەکە: هەر ئێستا ئەگەڕێمەوە

لاوەکە: بەلاّم تاریکە.. (بێدەنگ ئەبێت)

پیاوەکە: شقارتەت پی‌یە؟

لاوەکە: نەخێر

پیاوەکە: چاکە.. شقارتەت بۆ بەجێ ئەهێڵم . من وورده وورده ڕێ بەدی ئەکەم .

«ئەچێتە دەرەوەو پاشان دێتەوە ژوورەوە»

پیاوەکە: ڕاڕەوەکە زۆر تاریکە . بێ شقارتە ڕێ بەدی ناکەم. چارچی‌یە؟

لاوەکە: (بە دوو دڵی‌یەوە) با تۆزێك چاوەڕووان کەین.. بەڵکە کارەباکە بێتەوە .

**پیاوەکە: (دەنکی شقارتەی‌تر هەڵئەکات و ئەڕوانیتە بن میچەکە)**

ئەی دوپشکەکە.. لەو بڕوایەدا نیت بگەڕێتەوە؟

**لاوەکە: (بەترسەوە) لات وایە بگەڕێیتەوە؟!**

پیاوەکە: ئەو لە ڕوناکی‌یا دەرناکەوێت.. دوپشکێکی سەیرە .

«هەورە تریشقە ژوورەکە ڕۆشن ئەکاتەوە..» دەنگی تەقینەوەیەکی دوور.. بە جووتە ڕائەپەڕێن»

(پیاوەکە دەنکێ شقارتەی‌تر هەڵئەکات)

لاوەکە: چی بکەین؟

پیاوەکە: (بەدەم بیرکردنەوەوە) با پێکەوە بچینە دەرەوە.. پێکیشەوە بگەڕێینەوە .

«بێدەنگی..»

پیاوەکە: بیر لەچی ئەکەیتەوە؟

لاوەکە: باشە

(دەنکێ شقارتەی‌تر هەڵئەکات)

بە جووتە ئەچنە دەرەوە.. لە ڕاڕەوکەدا دەنگیان ئەبیسترێت، لە پڕ کارەبا دێتەوە .

دووای تۆزێك خۆیان ئەکەنەوە بە ژووردا

پیاوەکە: با بە چاکی ژوورەکە بپشکنین .

(گۆشەکانو بن میچەکەو زەوی‌یەکەو پاشان ناو جێگەکە ئەگەڕێن)

هەردووکیان: (بەیەك دەنگ) هیچ دیارنی‌یە .

دەنگی بروسکەدێت «بێ دەنگی...»

دەنگی ئوتومۆبێلی ئیسعاف لە دوورەوە یەت. بەیەکتریدا هەڵئەڕووانن. پێکەوە سەیری بن میچەکە ئەکەن

پیاوەکە: (بە توورەیی‌یەوە) بێهوودەیە.. ئەبێت تا بەیانی ئەمە شوێنمان بێت «بێدەنگی..»

پیاوەکە: تۆ ئەڵێی چی؟

لاوەکە: چا ..چاکە

پیاوەکە: (ئەڕووانێتە سەعاتەکەی) نزیکی یەکە

دەنگی فیشەك لە دوورەوە دێت.

بەیەکتریدا هەڵئەڕوانن (بێدەنگی..)

لاوەکە: چا... چاکە.. (بێدەنگ ئەبێت)

پیاوەکە: با قسە بکەین.. (ئەڕوانێتە بن میچەکە)

(لاوەکەش ئەڕوانێتە بن میچەکە)

پیاوەکە: چاکە.. لە دایك بووم.. لە

(دەنگی هاتو هاوارێکی دوور.. هەردووکیان ڕائەچڵەکێن)

پیاوەکە: (هێمن ئەبێتەوە) وابزانم ئاگات لە خۆت نییە؟

لاوەکە بە دەوری خۆیدا ئەڕوانێت پاشان سەر هەڵئەبڕێت ڕووەو بن میچەکە .

دەنگی بەیەك دادانی دوو ئۆتۆمۆبیل «بێدەنگی..»

پیاوەکە: لەشاری... لە دایك بووم

لاوەکە: (هەڵئەڕوانێت)

پیاوەکە: چیتە؟

لاوەکە: بڕوانە.. بڕوانە

ئەڕووانێتە دیوارەکەو پاشان بن میچەکە

پیاوەکە: (بەترسەوە) بڕووانمە کوێ؟

لاوەکە: (بەدەنگێکی خنکاوەوە) دوپشکەکان.. دوپشکەکان

پیاوەکە: (بە توندی چاوی هەڵئەگلۆفێت.. بەسەر سامی‌یەوە سەرنج ئەدات) هیچ نابینم.. کوا؟ کوا؟

لاوەکە: (بەترسەوە) وانزیك ئەبنەوە.. وا نزیك ئەبنەوە

(بەخێرایی بەرەو لای مشەماکەی ئەچێت.. بە گورجی لەبەری ئەکات) ووریابە.. ووریابە «بەخێرایی ئەچێتە دەرەوە»

پیاوەکە: (بە شڵەژاوی‌یەوە) هیچ نابینم.. نابینم

(بە بن میچو دیوارەکەدا هەڵئەڕوانێت) .

بەخێرایی بەرەو لای مشەماکەی ئەچێت.. بەگورجی قۆڵی پیائەکات.. دەرگاکە بە توندی بە دوای خۆیا دائەخاتەوە .

گڵۆپەکە ئەکوژێتەوە .

تاریکایی .

**لە (مسرحيات من مشهد واحد )ی (اسماعيل أكبر محمد)ەوە وەرگێڕراوە**




راپۆرت

# ساڵێکی تریش لەگەڵ بەرهەمە چاپکراوو یارمەتی دراوەکانی ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاواندا

* بەشی یەکەم *

ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان. وەکو دەزگایەکی پسپۆر لە کاروباری رۆشنبیریو لاوان لە ناوچەی کوردستاندا، هەموو ساڵێك چالاکانە بەشێکی ئەو ئەرکە پیرۆزەی خۆی کە لە بواری دەوڵەمەندکردنو، بوژاندنەوەی ئەدەبو کەلەپوری کوردیدا پێی سپێردراوە، رادەپەڕێنێو. بەلایەنی کەمیشەوە ساڵێ «٤٠ -- ٥٠» کتێبی تازەی هەمەجۆر دەخاتە سەر خەرمانەی ووشەی کوردی. ئەو کتێبانەیش یا ئەوەتا لەسەر ئەرکی ئەمیندارێتی چاپ دەکرێن، وەیا دەستی یارمەتی بۆ نووسەرەکانی درێژکراوەو. هەلی ئەوەیان بۆ رەخساوە کە بەرهەمەکانیان وەبەرچاوی خوێنەران بکەونو. لەنێو چواردیواری ناهومێدیدا نەمێننەوە.

هەر بەم بۆنەیەشەوە واچاکە بە خوێنەرە ئازیزەکانی راگەیەنین کە ئەمیندارێتییە هەر لە ساڵی «١٩٧٨»ەوە کە یەکەمین ساڵی راپەڕاندنی ئەم کار بووە. تاوەکو ئەم ساڵو ئەم ژمارەیەی کە لەم راپۆرتەدا خستوومانەتە روو گەیێ «١١٠» کتێبی چاپکراو لەسەر ئەرکی ئەمیندارێتیو. «٢٠٢» کتێبی یارمەتی دراو

هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی. ئەمە جگە لە هەندێ کتێبو نامیلکەی دیکە کە بۆنە نەتەوایەتیو نیشتمانییەکاندا بڵاوبوونەتەوە. بەڵام لەرووی هونەریو مەر تایبەتییەوە نەخراونەتە نێو خانەی ئەو کتێبانەی کە لە راپۆرتەکاندا باسکراو

ـلایەکی تریشەوە ئەم ئەمینداریتی‌یە هەر لە دوا مانگەکانی ساڵی «١٩٨٢»ەوە تاوەکو ئیمڕۆش گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی‌ی مانگانە بە ناوی «کاروان»ەوە دەردەکات‌و، ئەمساڵ پی‌ی ناوەتە ساڵی شەشەم‌و، تا کۆتایی ساڵی «١٩٨٧»، «٥٩» ژمارەی لێ چاپکراوە، لەگەڵ «٤» بڵاوکراوەی هەمەجۆری گۆڤارەکە، کە دووانی بە زمانی عەرەبی بوون‌و دووانیشی بە زمانی کوردی بوون، هەروەها لە تەمووزی ساڵی «١٩٨٥»ەوە دیسان بەردەوام رۆژنامەیەکی هەفتانەی تایبەت بە کاروباری وەرزشەوە بە زمانی کوردی بڵاودەکاتەوە بەناوی «کاروانی وەرزش»ەوە، کە پاشکۆی گۆڤاری کاروانە‌و. تا کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمی «١٩٨٧»، «      » ژمارەی لێ دەرچووە.

شانبەشانی بایەخدان بە باری رۆشنبیری، ئەم ئەمینداریتی‌یە لایەنی وەرزش‌و لاوەو. گورج‌وگوڵی هونەرکاری‌و یارمەتیدانی دەزگاو یەکێتی‌و کۆمەڵە هونەری‌و ئەدەبی‌و رۆشنبیری‌یەکانی دیکەیشی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو بەپی‌ی تواناو بە شێکی گەورەوە بەتەنگ ئەو لایەنانەوە بووەو، دەستی یارمەتی‌و هاوکاری بۆ درێژ کردوون. بۆ ئەوەی بتوانن ئیش‌و کارەکانیان بە چاکترین شێوە ئەنجام بدەن.

لە کۆتایی راپۆرتی ئەمساڵیش‌دا دەڵێم ئەو بایەخەی ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستانی خاوەن خودموختاری داویەتی‌یە کاروباری رۆشنبیری‌و لاوان مایەی خۆشحاڵی‌و رێزلێنانە، هەر بەم بۆنەیەشەوە، نابێ ئەو دەورە جوانەی ئەمینداری گشتی‌و جێگرەکەی فەرامۆش بکەین، کە بە هەموو توانایەکیانەوەو، بەبێ دریغی‌کردن دەست واڵان لەبەردەم پێشکەش‌کردنی یارمەتی بێ سنوور، بۆ هەموو ئەدیب‌و نووسەرو رۆشنبیرێکی کورد، کە بیانەوێ خزمەتی میوەی رەسەنی کوردی بکەن‌و، کتێبخانەی کوردی زیاتر برازێننەوەو دەوڵەمەندتری بکەن..

هەر بەم بۆنەیەشەوە، وا ئەمساڵیش باسی ئەو کتێبانە دەکەین کە ئەمینداریتی لەسەر ئەرکی خۆی چاپی کردوون‌و ئەوانەیش کە یارمەتی نووسەرەکانی داوە، بەو هیوایەی بەشێکی ئەو خزمەت‌گوزاری‌یە بخەینە بەرچاوی خوێنەرو نووسەرانی کوردو. ئەو برایانەیش کە بە کاروباری لێکۆڵینەوەو بیلیۆگرافیاوە خەریکن سوودی لێ وەربگرن، ئەمەیش کورتەیەکی ئەو کتێبانەیە کە بە تەواوی لە چاپخانە دەرچوون‌و، کەوتوونەتە کتێبخانەکانەوە...

ا: کتێبە چاپکراوەکان «کوردی‌و عەرەبی»، ساڵی ١٩٨٧

| ژ | ناوی کتێبەکان | دانەرەکانیان |
|---|---|---|
| ١ | دیوانی شیعری دیلان | محمد صالح دیلان<br>ئا: عبدالله عزیز خالد |
| ٢ | مەقی ئەحمەدی دارەشمانە | ن: محمد فیدا ئا: کاوە فیدا |
| ٣ | یارێت کوردی / ب١ | محمد حسن بناڤی |
| ٤ | خرۆشان‌و رامان | علی فتاح دزەیی |
| ٥ | لەبواری فەرهەنگ نووسیی کوردی‌دا. | د. ئەورەحمانی حاجی مارف. |
| ٦ | فەرهەنگی ئیریەن ڤاچ | محمد أمین هەورامانی |
| ٧ | لەژێر رەشماڵی عیراق مەزن‌دا | مصلح مصطفی جەلالی |
| ٨ | دیوانی بێ‌بەش | ملا مسعود بێ‌بەش |
| ٩ | راپەرینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠ | وە: د. کاوس قەفتان |
| ١٠ | گوڵزار | شێخ طاهری شووشی |
| ١١ | وەرزش لە کۆنەوە تا ئەمرۆ لە هەولێر | مەزۆ لەشکری عزیز |
| ١٢ | دڵدارێکی کوچ‌کردوو | قوباد بەهرەوەر |
| ١٣ | دوژمنی گەل | وە: محمد فریق حسن |

**عەرەبی**

| ژ | ناوی کتێبەکان | دانەرەکانیان |
|---|---|---|
| ١٤ | حوادث العالم / ج١ . | مصطفی حاجی علی ئامێدی |

ب : کتێبە یارمەتی‌دراوەکان «کوردی‌و عەرەبی»، ساڵی ١٩٨٧

| ژ | ناوی کتێبەکان | دانەرەکانیان |
|---|---|---|
| ١ | چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر. | هیمداد حسێن |
| ٢ | حەیرانۆك «سترانا لێریکی». | احمد عبدالله زەرۆ |
| ٣ | سەرەتایێك بۆ تێگەیشتنی هونەری تەشکیلی. | وە: نەژاد عەزیز سورمێ |
| ٤ | فس فس پاڵەوان | وە: سەعید یەحیا |
| ٥ | هۆشیاری. | فؤاد طاهر صادق |
| ٦ | ئەفسانە.. لاوك.. گۆرانی | ئا: ئەسعەد عەدۆ |
| ٧ | سێ شانۆگەری. | وە: رەووف بێگەرد |
| ٨ | یۆلیۆس قەیسەر | وە: علی عثمان یعقوب |
| ٩ | یادی سجادی. | ئا: دلێر علاء الدین سجادی |
| ١٠ | ل خەلکی تەحلێ ل من شرینێ. | عبد الرحمن مزوری |
| ١١ | ئەگەر دنیا | عبد العزیز خەیات |
| ١٢ | گەرووی بازیان. | شفیقە علی حسێن «لەیلان». |
| ١٣ | گوڵێك لە رەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری. | داود محمد شرۆڵ |
| ١٤ | گوندەکەمان. | طاهر صالح سعید |

| ژ ناوی کتێبەکان | دانەرەکانیان |
| --- | --- |
| ١٥ –خەج و سیامەندو مەلەکان. | ناظم دلّبەند |
| ١٦ –رەگەکان. | مدحت بێخەو |
| ١٧ –دابڕان. | محمد خدر مولود |
| ١٨ ڕێبین. | سامیە محمد |
| ١٩ –دەنگێ مە. | کۆمەڵە نووسەرێك |
| ٢٠ –میر زۆرۆ. | ئا: سەگڤان یوسفی |
| ٢١ –ڕۆحی مەولانا خالید. | ئا: محمود احمد محمد |
| ٢٢ –اقتران النیرین في مجمع البحرین. | لێکۆڵینەوەی: محمد علی قەرەداغی |
| ٢٣ –سترانێت شەڤەرۆکا. | حجی جعفر |
| ٢٤ –پێوەند. | عثمان حمد احمد |
| ٢٥ –دیوانی ئەسیری | مستەفا عەسکەری |
| ٢٦ –زەوی ئاسن و ئاسمان مس | وە: شکور مستەفا |
| ٢٧ –«١٠٠» ناوداری جیهان. | وە: ئەسعەد قەرەداغی |

**• عەرەبی یەکان**

| | |
| --- | --- |
| ٢٨ –مدینه أربیل – دراسة في جغرافیة الحضر | د. هاشم خضیر الجنابی |
| ٢٩ –اطاعة الاوامر واثرها في المسؤولیة الجزائیة | د. حکمت موسی سلمان |

## أ ٭ کتێبە چاپکراوە کوردی یەکان:

### ١ – دیوانی شیعری دیلان:

بریتی یە لە زوربەی زۆری شیعرەکانی مامۆستای شاعیری ناسراوی کورد «محەمەد صالح دیلان» کە لە دووتوێی بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکراونەتەوە، ئەم بەرهەمە بەچێژو پێزەی دیلانی شاعیر. کاك «عەبدوڵڵا عەزیز ئاگرین» ئامادەی کردووەو لێی کۆڵیوەتەوەو پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە. هەروەها دکتۆر «مارف خەزنەدار»یش لە لاپەڕە «٤٧»دا، لەژێر سەردێری «لەباتی پێشەکی» کە لە ٢٨ی ئەیلوولی ١٩٦٨دا نووسیویەتی. لەهەندێ لایەنی شیعرەکانی «دیلان» دەدوێ..

ئەم دیوانە شیعرە بریتی یە لە «٤٠٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣ × ١٦ سم»ەو. لە چاپخانەی «سومر» لەبەغدا لەچاپدراوە. لە کتێبخانەی نیشتمانیی لەبەغدا ژمارە «٤٤٦»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و. نرخی دوو دینارەو. پێنج هەزار دانەیشی لێ چاپکراوە. کاك «ئازا حسیب قەرەداغی» نەخشەی بەرگ و کارە هونەری یەکانی ئەنجامداوە. کاك «ناظم دلّبەند»یش سەرپەرشتی ی چاپکردنی کردووە.

ئەوەی شایانی باسە ژمارەی سپاردنی ئەم کتێبە بۆ ساڵی «١٩٨٦» دەگەڕێتەوە، بەڵام لەبەر هەندێ کێشەو گرفتی چاپەمەنی ساڵی «١٩٨٧» کەوتۆتە کتێبخانەکانەوەو بڵاوبۆتەوە..

### ٢ – فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە:

داستانێکی مێژوویی یە خوالێخۆشبو «محمد فیدا» نووسیویەتی و، «کاوە»ی کوڕی نووسەر ئامادەی کردووە بۆ چاپ و، پێشەکی یەکی خنجیلانەیشی بۆ نووسیوە.

ئەم داستانە «٩٢» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «١٩ × ١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «کنعان» لەبەغدا لەچاپدراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لەبەغدا ژمارە «٢٠٤»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، سێ هەزار دانەیشی لێ چاپکراوە، کاك جەعفەر بەرزنجی سەرپەرشتی ی چاپکردنی کردووە..

### ٣ – یارێت کوردی:

بابەتێکی بەپێزی ناوچەی بادینانەو، نووسەر کاك «محمد حسن بناڤی» ئەرکێکی زۆری لەگەڵدا کێشاوە، تاوەکو توانیویەتی ئەو کۆمەڵە زۆرەی لەیاری یە کەلەپووری یەکان بەوێنەوە خستۆتە بەردەستی خوێنەرانی کورد، ئەڵبەتە ئەم جۆرە ئەرك و کۆششەی نووسەران خزمەتێکی چاکە بۆ پاراستنی کەلەپووری نەتەوەکەمان.

ئەم کتێبە «٢٤٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢ × ١٦ سم»ەو، لەچاپخانەی «ڕۆشنبیری و لاوان» لەهەولێردا لەچاپدراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە، «٢٤٧»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ و، نرخی دینارو نیوێکەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە..

ئەوەی شیاوی باسە «د. نافع ئاکرەیی» پێشەکی بۆ ئەم کتێبە نووسیوەو، نووسەریش لە کۆتاییدا فەرهەنگۆکێکی بۆ ووشە گرانەکان ئامادەکردووەو، لە لاپەڕە «٢٣٨»دا بڵاوی کردۆتەوە.. وەکو دەردەکەوێ ئەم کتێبە بەرگی یەکەمەو، لەوانەیە بەرهەمی دیکەی بەدوادا بێ...

### ٤ – خرۆشان و ڕامان:

سێهەم بەرهەمی چاپکراوی مامۆستای نووسەرو شاعیر «علی فتاح دزەیی»یە، بریتی یە لە «٦٠» پارچە شیعری هەمەجۆر، لەوانە «١٤» هەڵبەستی لەسەر کێشی عەرووزە، شاعیر دیوانەکەی بەمجۆرە پێشکەش دەکات وە دەڵێ: «دیاریی بێ بۆ ئەو دڵانەی کە گیرۆدەی جوانین و لێوڕێژی خۆشەویستی ی نەتەوەو نیشتمانن». هەروەها پێشەکی یەکی تێروتەسەلی لەبارەی شیعرەکانی نێو دیوانەکە نووسیوەتەوەو، ئەو ڕێبازەی روونکردۆتەوە کە لە شیعردا پەیرەوی کردووە.

خرۆشان و ڕامان، «١٩٤» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢٫٥ × ١٦٫٥سم»ەو، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری و لاوان» لە هەولێر لەچاپدراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٤٢٥»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ و، نرخی یەك دینارەو، «٣» هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

دەرهێنانی هونەری و نەخشەی بەرگەکەی کاکی هونەرمەند محمد زادە ئەنجامی

داوەو، کاك «علي خورشید»یش سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە.

## ٥ – لەبواری فەرهەنگ نووسی کوردی‌دا:

بەرهەمێکی دیکەی بەپێزو چڕوپڕی مامۆستای دکتۆر «ئەورەحمانی حاجی مارف»ە، کە جگە لە پێشەکی دە ووتاری بە زمانی کوردی‌و ووتارێکی بە زمانی عەرەبی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

نووسەر لە پێشەکی‌یەکەیدا پەنجە بۆ ئەوە دەکێشێ کە ئەم ووتارانە ناوەناوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان‌دا بڵاوبوونەتەوە، بەڵام بۆ ئەوەی لە پەرش‌و بڵاوی‌و فەوتان ڕزگاریان بکات کردوونی بەم کتێبەو خستوونی‌یەتە بەردەستی خوێنەرانی کورد.

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٢٠٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣ × ١٧سم»ەو، لە چپخانەی «الزمان» لە بەغدا لەچاپدراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٥٠٣»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی یەك دینارەو، سێ هەزار دانەی لێ چپکراوە.

## ٦ – فەرهەنگی ئیریەن ڤاچ:

کتێبێکی بەپێزی مامۆستای نووسەر «محمد أمین هەورامانی»یە، بریتی لە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردی لەنێوان هەندێ ووشەی گاتەکان‌و، هاوئاوازو هاو واتایان لە زمانی کوردی‌ی ئەمڕۆدا. نووسەر لەسەرەتادا ڕوونکردنەوەیەکی بۆ بەرهەمەکەی نووسیوە. ئینجا دێتە سەر ناوەڕۆکی کتێبەکەو، یەکە یەکە بابەتەکان دەخاتە ڕووو لێیان دەکۆڵێتەوە.

مامۆستا هەورامانی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەی سوودی لە «٣١» سەرچاوەی کوردی وەرگرتووە، لەگەڵ دە سەرچاوەی عەرەبی‌و، «١٥» سەرچاوەی بێگانە. ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆ کردنە ئەوەیە، ئەم کتێبە لەسەرەتادا لە زنجیرەی کتێبە یارمەتی‌دراوەکان بوو، بەڵام لەپاشان بڕیاری ئەوەی بۆ درا کە وەبەر زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکان بکەوێ، ئەگەرچی لەسەر بەرگەکەیشی نووسراوە یارمەتی دراوە.

ئەم فەرهەنگە «٣٤٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٢ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «سومر» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٥٨٠»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی دوو دینارو نیوەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

برای هونەرمەند کاك «عبد القادر علي مەردان» سەرپەرشتی‌ی چاپ‌و دەرهێنانی هونەری کردووە.

## ٧ – لەژێر ڕەشماڵی عیراق مەزن‌دا:

ئەم کتێبەی کاك «مصلح جەلالی» سەرجەمی ئەو کۆمەڵە ووتارو نووسینانەیە کە نووسەر ساڵی ١٩٨٧ لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان‌دا بڵاوی کردوونەتەوەو، چوار بەشی سەرەکی‌یان لە کتێبەکەدا پێکهێناوە کە ئەمانەن:

- بەشی یەکەم: شۆڕش‌و ڕۆشنبیری کوردی‌و گەلی کورد.
- بەشی دووەم: یادو بیرەوەری.
- بەشی سێیەم: لە ئاسۆی سیاسەتەوە..
- بەشی چوارەم: خومەینی شەڕخوازو عیراق سەرکەوتوو.

ئەم کتێبە «٣٢٤» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢١ × ١٥سم»ەو، لە چاپخانەی «سومر» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٥٨١»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی دینارو نیوێکەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە. بەرگی کتێبەکە بە تابلۆیەکی قەشەنگی هونەرمەند محمد عارف سیامەنسووری ڕازاوەتەوە.

## ٨ – دیوانی بێبەش:

چاپی دووەمی سەرجەمی شیعرەکانی «مەلا مسعود»ی بێبەشە، بە هەموو بابەت‌و چەشنەکانی‌یەوە، تەنیا داشۆڕین نەبێ.. شاعیر ئەم دیوانەی پێشکەش کردووە بە «گیانی پاکی نالی‌و شێخ ڕەزاو هەموو کەڵە ڕابەرانی شیعر».

لەلاپەڕە «٥»دا کاك «محمود زامدار» ووتەیەکی کورتی نووسیوە دەربارەی چاپکردنی دیوانەکەو ڕۆڵی بێبەش لەبواری شیعری کلاسیکی کوردی‌دا. پاشان بێبەش بە لاپەڕەو نیوێك پێشەکی باسی ژیان‌و بەرهەمەکانی خۆی دەکا. ئینجا شیعرەکانی نووسراونەتەوە.

ئەم دیوانەی بێبەش «٢١٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری‌و لاوان» لە هەولێر چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٦٧٥»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی یەك دینارەو دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە. کاك «سەعید یەحیا»ی خۆشنووس سەرجەمی دیوانەکەی بە خەتی دەست نووسیوەتەوەو سەرپەرشتی‌ی چاپکردنیشی کردووە.

## ٩ – ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠:

کتێبێکی مێژوویی بەنرخە نووسەری سۆڤیەتی دوکتۆر جەلیلی جەلیل نووسیویەتی‌و، دوکتۆر کاوس قەفتان لە زمانی ڕووسی‌یەوە وەری‌گێڕاوەو، پێشەکی بۆ نووسیوە، ئەوەیشی ڕوون‌کردۆتەوە کە ئەم کتێبە ئەتروحەی دکتۆراکەی نووسەرە کە لە ساڵانی شەستدا نووسیویەتی‌و بڕوانامەی دکتۆرای پێ وەرگرتووە.

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٢٥٦» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣ × ٥ر١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «الزمان» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لەبەغدا ژمارە «٧٣٠»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی دینارو نیوێکەو سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە..

وەکو لە دوا لاپەڕەدا دەردەکەوێ د. کاوس وەرگێڕانی ئەم کتێبەی لە «٢٣ / ١٢ / ١٩٨٥»دا تەواو کردووەو، سوودیشی لە کۆمەڵە سەرچاوەیەکی زۆر وەرگرتووە.

## ١٠ – گولزار:

بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە ئایینی‌یەیەکە زانای ئایینی «شێخ طاهری شووشی» دایناوە، برای بەڕێز «حمزة طاهر شووشی» کە کوڕی نووسەرە ئامادەی کردووەو لێی کۆڵیوەتەوەو کورتە پێشەکی‌یەکی بۆ نووسیوە، ئەم بەرهەمەی «شێخ طاهر» چوار

بەرگی تریشی بەدوادا دێ‌و. هەر هەموویشی لەبارەی ئاینەوەیە. ئەوەی زیاتریش سەرنج ڕادەکێشێ نووسەر هەموو دەست‌خەتەکانی بەو خەتە خۆشەی خۆی نووسیوەتەوە کە نموونەی لەم بەرگەدا هەیەو، بڵاوکراوەتەوە..

ئەم کتێبە «٣٢٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣ × ١٦سم»ەو لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری‌و لاوان» لە هەولێر چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٧٩٧»ی سالی «١٩٨٧»ی دراوەتی‌و، نرخی «دوو دینارە»و دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە، کاك «سرهند محمد سعد الله»ش سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە.

## ١١ – وەرزش لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ لە هەولێر:

بەرهەمێکی بەپێزی پڕ لەزانیاری‌یە دەربارەی وەرزش لەشارە دێرینەکەی هەولیردا لەکۆنەوە تاوەکو ئەم ساڵانەی دوایی. ئەم کتێبەی کاك «مەزۆ لەشکری عەزیز» بەری هەوڵ‌و کۆششێکی پیرۆزە بۆ دەستنیشان‌کردن‌و نووسینەوەی مێژووی وەزرش لە شاری هەولێردا، ئەو شارەی بەدەیەها وەرزشکاری دیارو لێهاتووی پی‌گەیاندووە، ئەمە جگە لەو ئەرك‌و ماندووبوونەی دانەر دیویەتی بۆ وەدەست خستنی ئەو هەموو زانیاری‌و، وێنە دەگمەنانەی لەم کتێبەدا بڵاوی کردوونەتەوە.

ئەم چاپکراوە «٤٨٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢ × ١٦٫٥سم»ەو، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری‌و لاوان» لە هەولێر چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١٠٦٥»ی سالی «١٩٨٧»ی دراوەتی‌و، نرخی دینارو نیوێکەو، «١٥٠٠» دانەی لێ چاپکراوە.

## ١٢ – دڵدارێکی کۆچ‌کردوو:

بریتی‌یە لە کۆمەڵە شیعرێکی کاك «قوباد بەهرەوەر»ی شاعیر، تێکرا شیعرەکان لە نێوان ساڵانی «١٩٧٤و ١٩٨٦»ەوە نووسراونەتەوە، ئەم کتێبە نەوبەرەی بەرهەمەکانی شاعیرە، کە بە چاپکراوی دەکەوێتە کتێبخانەی کوردی‌یەوە، لە لاپەڕە «١٥٨»دا شاعیر ناوی پێنج بەرهەمی تریشی بردووە کە ئامادەی کردوون لەچاپیان بدات. ئەمە جگە لەوەی کە ناوەناوە بەرهەمی هەمەجۆر لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا بڵاودەکاتەوە..

ئەم کتێبە «١٦٠» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «١٨ × ١٣٫٥سم»ەو، لە چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان لە هەولێر لە چاپدراوە، کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١١٩١»ی سالی «١٩٨٧»ی داوەتی‌و، نرخی یەك دینارەو، سێ هەزار دانەیشی لێ‌چاپکراوە.

## ١٣ – دوژمنی گەل:

شانۆنامەیەکی بەپێزی نووسەری «نەرویجی»، «هینریك ئیبسن»ە، برای چیرۆك نووس کاکە محمد فریق حسن لە زمانی عەرەبی‌یەوە وەریگێڕاوە. کاك «ئەحمەد سالار»ی هونەرمەندیش بە شێوەیەکی جوان‌و تێرو تەسەل لە لاپەڕە «١٩٧ تا – لاپەڕە ٢٠٩»، شیکردنەوەیەکی ووردی لەبارەی ئەبسن‌و، ناسینی شانۆی ئەبسن‌و، هونەری دارشتن‌و دروست کردن لە شانۆی ئەبسن‌دا، نووسیوە، ئەم نووسینەی سالار ئەگەرچی لە سەر بەرگی کتێبەدا نووسراوە پێشەکی، بەڵام وادیارە هەڵەیەکی هونەری تی‌کەوتووەو، کەوتۆتە دواوەی کتێبەکە، لەگەڵ ئەوەشدا نووسینەکە نرخ‌و تام‌و بۆی خۆی پاراستووە.

ئەم کتێبە «٢١٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢٫٥ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «سومر» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١٥٠٤»ی سالی «١٩٨٧»ی دراوەتی‌و، نرخی یەك دینارەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو، لە سەرەتای سالی «١٩٨٧»دا کەوتۆتە بازارەوە..

## ب – کتێبە چاپکراوە عەرەبی‌یەکان:

### ١ – حوادث العالم ج(١):

بەشی یەکەمی ئەو کتێبەیە کە مامۆستا «مصطفى حاجي علي ئامێدی» بە زمانی عەرەبی دایناوە، لەم بەشەدا نووسەر ڕووداوەکانی جیهان لە سالی یەکەمی زایینی‌یەوە باس دەکا تاوەکو دەگاتە سالی ١٩٦١»ی زایین، جگە لەم بەشە نووسەر سێ بەشی دیکەیشی ئامادەکردووە بۆ چاپ، کە لەبەشی چوارەمدا تاکو سالی «١٩٧٦»ی گرتۆتەوە، هیواخوازین نووسەر ئەو سێ بەشەی تریش بەچاپ بگەیێنێ‌و، دیدەی خوێنەرانی پێ ڕۆشن بکاتەوە.

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «١٧٦» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣٫٥ × ١٦٫٥سم»ەو، لە چاپخانەی «زانکۆی موصل» چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١٩»ی سالی «١٩٨٧»ی دراوەتی‌و، نرخی «٥٠٠» فلسەو «٣» هەزار دانەی لێ چاپکراوە. کاك سیروانی بەکر سامی نەخشەی بەرگی بۆ کێشاوەو، سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە.

## ج – کتێبە یارمەتی‌دراوە کوردی‌یەکان:

### ١ – چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر:

دووەمین بەرهەمی چاپکراوی کاك «هیمداد حسین»ەو، بریتی‌یە لە چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر.

لە پێشەکی ئەم کتێبەدا مامۆستای خوالێ‌خۆشبو «کامەران موکری» بەچەند دێرێك ئەرکی کۆکەرەوەی ئەم بەرهەمەی پەسند کردووە، لەتەك ئەویش‌دا مامۆستا محمد معروف فتاح پیرۆزبایی لی‌کردووە. لە لاپەڕەکانی دواییش‌دا ئاماژە بۆ ئەو کەسانە کراوە کە سوودیان لێ وەرگیراوە. هەروەها فەرهەنگۆکێکیش لەگەڵ بەرهەمەکەدا بڵاوکراوەتەوە، بۆ ئەو ووشانەی لەدەشتی هەولێر بەکاردێن‌و لەشوێنانی تر شێوەی فۆنەتیکەکەیان جیاوازە.

ئەم کتێبە «١٤٤» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢١٫٥ × ١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١٣٥٠»ی سالی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو هەزار دانەی لێ چاپکراوە. کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە.. ئەم کتێبە مێژووی سالی

«١٩٨٦»ی بەسەرەوەیە بەڵام کاتی خۆی بەدەستمان نەگەیشت بۆیە لە ڕاپۆرتی ئەو ساڵەدا ناومان نەبردووە.

### ٢ – حەیرانۆك «سترانا لیریکی»:

بەرهەمێکی تری برای نووسەرو فۆلکلور دۆست کاك «احمد عبد الله زەرۆ»یە کە بە زمانی کوردی‌یەو، بە شێوەی کرمانجی‌ی سەرووە، کاك احمد ئەمجارەیان لایەنی لیریکی واتە سۆزی گرتووە بە نیسبەت ئەو گۆرانی‌و لاوکانەی کە لە هەرێمی بادینان باون‌و دەماودەم لەبۆنە تایبەتی‌یەکاندا دووبارە دەبنەوەو دەگوترین. نووسەر ئەم بەرهەمەی لەچەند کەسانێکی شارەزا وەرگرتووەو کۆی‌کردۆتەوەو، لێ‌ی کۆڵیوەتەوەو، پێشەکی بۆ نووسیوە، لە کۆتاییشدا پەنجەی بۆ کەسانە درێژکردووە کە بوونەتە سەرچاوەی ئەم کارەی کە بایەخی تایبەتی خۆی هەیەو پرسوودە، ئەمە جگە لەو فەرهەنگۆکەی بۆ ووشە گرانەکانی درووست کردووە.

ئەم کتێبە «١١٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٤ × ١٦ر٥سم»ەو، لە چاپخانەی «الزمان» لەبەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١٠٨»ی ساڵی «١٩٨٧» دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە، کاك «ئازا حەسیب قەرەداغی»ش نەخشەی بەرگەکەی بۆ کردووە.

### ٣ – سەرەتایەك بۆ تێگەیشتنی هونەری تەشکیلی:

برای شاعیرو نووسەر کاك «نەژادی عەزیز سورمێ» ئەمجارەیان بابەتێکی هونەریی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە.. ئەم بەرهەمەی کە وەرگێر پێشەکی‌و پەراوێزی بۆ نووسیوە، لە نووسینی «حسن سلێمان»ەو، بە زمانی عەرەبی بڵاوبۆتەوە. وەرگێر لە پێشەکی‌یەکەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆ ئەم بابەتە هونەری‌یەی هەڵبژاردووەو، بایەخی پێ‌داوە، لەگەڵ زۆر لایەنی دیکە کە پێویست بەوە دەکات بە ووردی بخوێنرێتەوە.

ئەم کتێبە «٣٢٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «حسام» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «١٩٦»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «دوو» دینارەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «ئازا حسیب قەرەداغی» کارە هونەری‌یەکانی ئەنجامداوەو، کاك «عبد القادر علي مەردان» سەرپەرشتی چاپی کردووەو، وەرگێر هەر خۆی نەخشەی بەرگەکەی دروست کردووە..

### ٤ – فس فس پاڵەوان:

شاکارێکی نووسەری تورك «عەزیز نەسین»ە، کاك «سەعید یەحیا» وەریگێڕاوە، ئەم کتێبەی وەرگێڕ «١٤» چیرۆکی کوردی گرتۆتە خۆی، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی نووسەر دەربارەی یەکەم نووسینی کە بڵاونەکراوەتەوە..

ئەم بەرهەمە بەپێزەی نەسین گەلێ بابەتی کۆمەڵایەتی لە شێوەی گاڵتەجاری‌دا دەخاتە ڕوو، وەرگێڕیش بە کوردی‌یەکی تەڕو پاراو پێشکەشی خوێنەرانی کردوون.

ئەم کتێبە «٢٤٨» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «١٨ر٥ × ١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «کنعان» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٢٠٣»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی دینارو ڕوبعێکەو، پێنج هەزار دانەی لێ چاپکراوە، وەرگێڕ هەر خۆی کارە هونەری‌یەکانی ئەنجام داوە، کاك «جەعفەر بەرزنجی»ش، سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە..

### ٥ – هۆشیاری:

ئەم کتێبەی مامۆستا فؤاد طاهر صادق کۆمەڵە زانیاری‌یەکی بەسوودی گرتۆتە خۆ لەبارەی هۆشیاری‌و گرنگی‌و بەنرخی‌یەکەی، شێوە سەرەکی‌یەکانی وەکو «کۆمەڵایەتی، نەتەوایەتی، چینایەتی، زمانەوانی، خۆناسین، تەندروستی» پەیوەندی بە وورە، کات‌و سەربەستی‌و هەڵوێستەوە..

نووسەر دوای چوار لاپەڕە پێشەکی دەچێتە سەر باسکردن‌و شی‌کردنەوەی جۆرەکانی هۆشیاری، کاك فؤاد بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە سوودی لە «٣٤» سەرچاوەی ئینگلیزی‌و، «٧٨» سەرچاوەی عەرەبی وەرگرتووە.

ئەم کتێبە «١٥٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣ر٥ × ١٦ر٥سم»ەو، لە چاپخانەی «الارشاد» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٢٠٩»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی یەك دینارەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

### ٦ ئەفسانە.. لاوك.. گۆرانی:

ئەم چاپکراوە فۆلکلۆری‌یە بریتی‌یە لە کۆمەڵێك هەقایەت‌و، لاوك‌و گۆرانی کە کاك «ئەسعەد عەدۆ» ئامادەی کردوون‌و ڕێکی خستوون، کاك «ئەسعەد» بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە سوودی لە چەند کەسانێکی بە تەمەن‌و شارەزای جیهانی فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووە، کە لە لاپەڕە «١١٣»دا ناوی بردوون، هەروەها لە لاپەڕە «١١١»دا فەرهەنگۆکێکی بۆ ئەو ووشە گرانانە ڕێك خستووە کە لە ناوەرۆکی کتێبەکەدا هاتوون.

ئەم کتێبە «١١٦» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠ر٥ × ١٥سم»ەو، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری‌و لاوان» لە هەولێر چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٢٣١»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٥٠٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی دروست کردووەو، ئامادەکاری بەرهەمەکەیش هەر خۆی سەربەرشتی‌ی لەچاپدانی کردووە..

### ٧ – سێ شانۆگەری:

بەرهەمێکی دیکەی برای چیرۆك نووس «ڕەووف بیگەرد»ە، لە عەرەبی‌یەوە وەریگێڕاوە، ئەم کتێبە بریتی‌یە لەم سێ شانۆگەری‌یە «شازادە خانمی ناشیرین، دیدەنی، گۆرانی ماڵ‌ئاوایی» کە هی ئەم نووسەرانەن: «نووسەری چیکی، ك.م. فاولو، لولا ئاناگنوستاکی، چیخۆف». هەرسێ شانۆگەری‌یەکەیش بە زمانی عەرەبی بڵاوبوونەتەوە.

ئەم کتێبە «١٣٦» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠ × ١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «علاء» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٣٤٣»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٦٥٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاک «محمد زاده»ی هونەرمەند خەتەکانی سەر بەرگی نووسیوەتەوەو، خوشکە چیمەن ئیسماعیل ڕەشان»یش نەخشەی بەرگەکەی دروست کردووە.

**٨ – یۆلیۆس قەیسەر:**

شانۆنامەیەکی نووسەری بەناوبانگ «ولیەم شەکسپیر»ە، کاک «عەلی عوسمان بەختیار» لە زمانی ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە. ئەم شانۆنامەیە بریتی لە «٥» بەشی سەرەکییە. هەر بەشەی لەچەند پەردەیەك پێکهاتووە. وەرگێڕ دەقی ئەم شانۆنامەی لەگەڵ دەقێکی تری ئینگلیزیدا بەراورد کردووە جگە لەو دەقەی کە لێی وەرگێڕاوە. هەروەها لە کۆتاییدا فەرهەنگۆکێکی بۆ ووشە گرانەکان دروست کردووە.

ئەم کتێبە «٢٥٠» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٢٠ × ١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «ئەدیب»ی بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی ژمارە «٣٥٤»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ‌و نرخی یەك دینارەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاک «محمد زاده»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، کاک «عبد القادر علی مەردان»ی هونەرمەندیش سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە..

**٩ – یادی سجادی:**

ئەم کتێبە بریتییە لە سەرجەمی ئەو ووتارانەی کە لە ئاهەنگی چلەی کۆچکردوو مامۆستا «علاء الدین سجادی»دا خوێنراونەتەوە، یا بە بۆنەی کۆچکردنی‌و لەیادی‌دا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە.

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا «سەجادی» یەکێك بوو لەو کەڵە نووسەرانەی کە تا دوێنێ ئەدیب‌و نووسەرو ڕۆشنبیرانی کورد بەوپەڕی شانازییەوە یادی دەکەنەوەو، تا هەتایە ئەستێرەیەکی گەشەو بە پرشنگداری دەمێنێتەوە. «سەجادی» لە ١٣ ١٢ ١٩٨٤دا ماڵ‌ئاوایی لێکردین‌و، بە هێمنی‌و بە نەفسێکی بەرزەوە سەری نایەوە. بەڵام خزمەتە مەزن‌و دەوڵەمەندەکەی ئەو بۆ ووشەی شیرینی کورد هەر بە نەمری دەمێنێتەوە.

ئەم کتێبە کە «دلێری کوری مامۆستا سجادی» کۆیکردۆتەوەو ئامادەی کردووە، بریتییە لە «١٩٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٤ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «أشبیلیة» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٣٥٦»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و نرخی دینارو ڕوبعێکەو، چوار هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

**١٠ – ل خەلکی تەحلیٚ ل من شرینیٚ:**

دووەمین بەرهەمی برای شاعیر کاك «عبد الرحمن مزوری»یە ئەم شاعیرە یەکەمین بەرهەمی لە ساڵی «١٩٨٠»دا، بەم ناونیشانە بڵاوکردەوە «ژ ئەڤینا چراێن کەڤن». بەڵام وەنەبێ مزوری تا ئێستا تەنها ئەم دوو بەرهەمەی پێشکەش بە خوێنەران کردبێ، بەڵکو بەردەوام بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی بابەت‌و بەرهەمی بەپێزو چڕو پڕی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە. ئەڵبەتە بەم کارەیشی خزمەتێکی پیرۆزی ووشەو ئەدەبی کوردیی کردووە.

ئەم بەرهەمەی نووسەر جگە لە «نووسینێك بەناوی «پاشگوتن» کە لە لاپەرە «٩٣»دا بڵاوکراوەتەوە، «٩» پارچە هۆزانیشی گرتۆتە خۆ کە لە نێوان ساڵانی «١٩٨١ – ١٩٨٥» نووسراونەتەوە.

ئەم دیوانەی شاعیر «١٠٤» لاپەرەی قەبارە بچووکی «١٦،٥ × ١١،٥سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٣٦٦»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «نەزار بەزاز»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، کاك «محمد سلیم سواری»ش، سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە.

**١١ – ئەگەر دنیا:**

یەکەمین بەرهەمی برای شاعیر «عبد العزیزی خەیات»ە، کە بە شێوە زمانی کرمانجیی سەروو بڵاوکراوەتەوە.

شاعیر ئەم چەپکە هۆزانەی پێشکەش بە هەموو کچ‌و کوڕێکی ڕۆشنبیر کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی گڕی خۆشەویستیی ووڵات لەنێو دڵیاندا بەردەوام کڵپە دەسەنێ..

ئەم چەپکە هۆزانەی خەیات بەشێکی زۆریان وەکو گۆرانیی لە ئێستگەو تەلەفزیۆن تۆمار کراون...

ئەم کتێبە «٨٤» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «١٩،٥ × ١٥سم»ەو، لە چاپخانەی «اسعد» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی‌لە بەغدا ژمارە «٤٥٧»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە، هونەرمەندی گەنج، «زیرەك» نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، شاعیر هەرخۆیشی سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە..

**١٢ – گەرووی بازیان:**

بەشی یەکەمی هۆنراوەکانی خوشکی شاعیر «شفیقە علي حسین – لەیلان»ە، کە «١٦» هۆنراوەی هەمەجۆری گرتۆتە خۆ، لەگەڵ «٦٩» پەراوێز بۆ ڕوونکردنەوەو شی‌کردنەوەی ئەو ووشەو ناوانەی کە لە هۆنراوەکاندا هاتوون. شاعیر هەرخۆی پێشەکییەکی کورتیلەی بۆ دیوانەکەی نووسیوە، لەکۆتاییشدا سوپاسی ئەوکەسانەی کردووە کە یارمەتییان داوە لە بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمەیدا، خوشکە لەیلان بەر لە بڵاوکردنەوەی ئەم بەشەی هۆنراوەکانی کتێبێکیشی بڵاوکردۆتەوە بەناونیشانی «گوڵ گەشتێك بە ناوچەکانی کوردستاندا».

ئەم بەرهەمەی خوشکە لەیلان بریتییە لە «٨٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣،٥ × ١٧سم»ەو، لە چاپخانەی ئۆفسێتی سەرکەوتن لە سلێمانی‌دا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٤٥٨»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٥٠٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «جمال عبدول» نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، کاك «نەوزاد تۆفیق»ی خۆشنووسیش سەرجەمی ئەم دیوانەی بەدەست نووسیوەتەوە.

**١٣ – گوڵێك لە ڕەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری:**

ئەم کتێبە فۆلکلۆرییە بەنرخەی مامۆستای ئازیز کاك «داود محمد شرۆل»، کەلەبەرێکی گەورەی مەیدانە بەرفراوانەکەی کەلەپووری نەتەوایەتیمان پڕ دەکاتەوە، کاك داود بە پێشەکییەکی تێرو تەسەل مەبەستی سەرەکیی خۆی ڕاگەیاندووە

لەبارەی هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردەواری، ئینجا بەدرێژی هەموو ئەو کەرەستەو کەلو پەلانە دەخاتە ڕوو کە لە بواری جووتو جوتیاری‌و، وەبەرهەم هێنانی دانەوێڵەو دەغڵ‌و دانڏا بەکار دەبرێن. لە کۆتاییشدا فەرهەنگۆکێکی خنجیلانەی بۆ ووشە گرانەکان دروست کردووە.

ئەم کتێبە «١٦٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣ × ٥ر١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٤٩٣»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی دینارو ڕوبعێکەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند بەرگی کتێبەکەی ڕازاندۆتەوەو ناونیشانی نووسیوەتەوە، کاك «غالب»ی خۆشنووسیش ناوی هەموو ئەو کەرەستەو تابلۆیانەی نووسیوەتەوە کە لەگەڵ باسەکاندا بڵاوبوونەتەوە، نووسەر هەر خۆیشی سەرپەرشتیی لەچاپدانی کتێبەکەی کردووە.

## ١٤ – گوندەکەمان:

برای چیرۆك نووس کاك «تایەر ساڵح سەعید» دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٣ و ١٩٧٩ دوو کۆمەڵە چیرۆکی بڵاوکردەوە، **یەکەمیان**: بەناوی «لەگەرووی مەرگەوە»، **دووەمیشیان**: «کاروان‌و ئەستێرە» کە چیرۆکی منداڵانە، وا جارێکی دیکە کۆمەڵە چیرۆکێکی تری پێشکەش بە منداڵانی کورد کردەوە کە ئەم چیرۆکانەی گرتوونەتەوە: «ماسی‌یە بچکۆلەکە، مانگ‌و منداڵەکان، کانیاو، گوندەکەمان، فاقە، شەڕە کەڵەشێر، دار سێو، تۆڕو ماسی».

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی نووسەر بریتی‌یە لە «٧٢» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠ × ١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «علاء» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٥١٢»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و نرخی «٥٠٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

وێنەکانی ناوەوە برای هونەرمەند کاك «نوری اسماعیل» دروستی کردوون‌و، نووسەر هەر خۆی سەرپەرشتیی لەچاپدانی کتێبەکەی کردووە.

## ١٥ – خەج‌و سیامەندو مەلەکان بۆ باوەشی یەکدی دەگەڕێنەوە:

ئەم بەرهەمەی «ناظم دڵبەند»ی نووسەر لە دوو نواندنی تەلەفزیۆنی پێکهاتووە، کە کاتی خۆی لەلایەن تیپە هونەری‌یەکانی هەولێرەوە پێشکەش کراون‌و، لە دوایشدا بۆ تەلەفزیۆنی «تأمیم» تۆمار کراون.

نووسەر دەقی یەکەمی لە کەلەپووری کوردەواری‌یەوە وەرگرتووەو، لە شێوەی شانۆنامەیەکدا دایڕشتووە، بۆ ئەوەی تیپە هونەری‌یەکان سوودی لێ وەربگرن.

ئەم بەرهەمەی نووسەر «٢٨٠» لاپەڕەی قەبارە بچووکی «٥ر١٦ × ١٢سم»ەو، لە چاپخانەی «الزمان» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٥١٩»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی دینارو نیوێکەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

نەخشی بەرگ‌و، دەرهێنانی هونەریی لەلایەن کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند ئەنجام دراون.

## ١٦ – ڕەگەکان:

بێخەوی شاعیر تاوەکو ساڵی ١٩٨٤ ئەم چوار دیوانە شیعرەی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە، «زەنگی کاروان – شیعر – ١٩٥٩، ڕابەری ژیان شیعر – ١٩٦٨، ورشەی ئاوات – شیعر – ١٩٧٣، داربەڕوو – شیعر – ١٩٨٤».

وا لە سەرەتای ساڵی «١٩٨٧»یشدا، جارێکی تر بێخەوی شاعیر کتێبخانەی کوردیی بەسەرکردەوەو، دیاری‌یەکی دیکەی بەناوی «ڕەگەکان»ەوە پێشکەشی خوێنەران کرد. ئەوەی شایانی باسە شاعیر «٥» بەرهەمی تریشی ئامادە کردووە بۆ چاپ کە لایەنەکانی مێژووو، فۆلکلۆرو لێکۆڵینەوەو زمانەوانی دەگرنەوە.. دەبێ ئەوەش بڵێین کە دیارترین شیعری نێو ئەم دیوانەی بێخەو، بەناوی «هەولێر – ی دێرین»ەوەیەو، شیعرێکی مێژوویی‌یە بە کورتی دەربارەی شاری هەولێرە بەر لە پێنج هەزار ساڵ تاوەکو کۆتایی ڕژێمی پاشایەتی...

ئەم چاپکراوە «٨٨» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢١ × ٥ر١٤سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە؟ لە کتێبخانەیی نیشتمانیی ژمارە «٥٧٤»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٦٠٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە. «محمد زادە»ی هونەرمەندیش نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، ناونیشانی بۆ نووسیوە..

## ١٧ – دابڕان:

«ووشەکان دەخنکێن، هێشوو، پچڕان یا گەڕانەوە، نەترووکان، بالوکە، خەونی بەیانی»، شەش کورتە چیرۆکن «محمد خدر مولود» نووسیونی‌و، لە دوو توێی بەرگێکی خنجیلانەدا کۆی کردوونەتەوەو، پێشکەشی خوێنەرانی کردوون. ئەم کورتە چیرۆکانەیش یەکەمین بەرهەمی نووسەرن کە وەکو کتێب بڵاوی کردوونەتەوە.

ئەم کتێبە «٨٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢١ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «سومر» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٥٨٢»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٥٠٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «نامق علي» هونەرمەند نەخشەی بەرگ‌و وێنەکانی ناوەوەی کتێبەکەی دروست کردوون، کاك «محمد زادە»ی هونەرمەندیش ناونیشانی بەرگی نووسیوەتەوە.

## ١٨ – ڕێبین:

یەکەمین بەرهەمی کچە کوردی شاعیرو وەرزشکار خوشکە «سامیە محمد»ە، کە لە «٣٠» پارچە شیعری هەمەجۆر پێکهاتووە، دوا شیعریشیان «ڕێبین»ە، کە کردوویەتی‌یە ناونیشانی دیوانەکەی.

کاك «ممتاز حەیدەری» بە شەش لاپەرە کورتە پێشەکی‌یەکی لە شێوەی شی‌کردنەوە لەبارەی ژیان‌و شیعرەکانی خوشکە «سامیە» نووسیوەتەوەو، هیوای ئەوەی خواستووە کە ئەم دیوانەی شاعیر ببێتە ژمارەی تاقیکردنەوە..

«ڕیبین» بریتی‌یە لە «٨٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیریی‌و لاوان» لە هەولێر چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٦٠٤»ی ساڵی «١٩٨٧» دراوەتێ‌و، نرخی «٥٠٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

دەرهێنانی هونەری‌و نەخشەی بەرگی ئەم کتێبە کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند

ئه‌نجامی داوه‌و، «نازم دڵبه‌ند»یش سه‌رپه‌رشتی‌ی له‌ چاپدانی کردووه‌.

**١٩ – ده‌نگێ مه‌:**

زنجیره‌ی سێ‌هه‌می ئه‌و به‌رهه‌مه‌ ئه‌ده‌بی‌و روشنبیری‌یه‌یه‌ که‌ کۆمه‌ڵه‌ ئه‌دیبێکی پارێزگای دهوك ئاماده‌یان کردووه‌و، به‌ هاریکاری ئه‌میندارێتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان چاپکراوه‌.

له‌م ژماره‌یه‌دا ئه‌م نووسه‌رانه‌ به‌رهه‌میان بڵاوکردۆته‌وه‌: «عبد السلام صالح دۆسکی، عبد الرحمن مزوری، د. نورا چه‌واری، عبد السلام علي، شکری شهباز، خالد حسین، محمد عبد الکریم چه‌لکی، حکمت هروری، اسماعیل مصطفی، صبیح محمد حسن، جلال مصطفی، صدیق شرۆ، تیلی امین، بائیزێ عه‌مه‌ر، بابێ پاڵه‌ی، مه‌جیدێ حه‌سۆ، ئه‌مینێ ئوسمان، فاضل عمر».

به‌رهه‌مه‌کانیش ئه‌م لایه‌نانه‌ی گرتۆته‌وه‌: «لێکۆڵینه‌وه‌، هۆزان، چیروك، شانۆ»، هه‌ر هه‌موو به‌رهه‌مه‌کانیش به‌ شێوه‌ زمانی کرمانجی‌ی سه‌روو نووسراون.

ئه‌م چاپکراوه‌ «١٥٢» لاپه‌ڕه‌ی قه‌باره‌ گه‌وره‌ی «٢٣٫٥ × ١٦٫٥سم»ه‌و، له‌ چاپخانه‌ی «الحوادث» له‌ به‌غدا له‌ چاپدراوه‌، له‌ کتێبخانه‌ی نیشتمانیی له‌ به‌غدا ژماره‌ «٦٠٥»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوه‌تێ‌و، نرخی «٥٠٠» فلسه‌و، دوو هه‌زار ڕانه‌ی لێ چاپکراوه‌..

**٢٠ – میر زۆرۆ:**

کۆمه‌ڵه‌ چیرۆکێکی منداڵانه‌، نووسه‌ری ناسراوی کورد «محمد أمین بوز أرسلان» به‌ تیپی لاتینی چاپی کردوون، کاك «سگڤان یوسڤي» به‌ تیپی عه‌ره‌بی گوێزاویه‌ته‌وه‌ سه‌ر شێوه‌ زمانی کرمانجی سه‌روو، له‌ کۆتاییشدا فه‌رهه‌نگۆکێکی بۆ ووشه‌ گرانه‌کان دروست کردووه‌.

ئه‌وه‌ی شایانی باسه‌ «بوز ئه‌رسه‌لان»ی نووسه‌ر گه‌لێ به‌رهه‌می دیکه‌ی به‌چاپ گه‌یاندوون، ئه‌م کتێبه‌یش یه‌کێکه‌ له‌وان که‌ له‌ ساڵی «١٩٨١» له‌ ووڵاتی سوید» چاپی کردووه‌.

ئه‌م کتێبه‌ «١١٢» لاپه‌ڕه‌ی قه‌باره‌ گه‌وره‌ی «٢٣٫٥ × ١٦٫٥سم»ه‌و، له‌ چاپخانه‌ی «دار الحریة» له‌ به‌غدا چاپکراوه‌، له‌ کتێبخانه‌ی نیشتمانیی له‌ به‌غدا ژماره‌ «٦٠٦»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوه‌تێ‌و، نرخی «٥٠٠» فلسه‌و، دوو هه‌زار دانه‌ی لێ چاپکراوه‌.. وه‌رگێڕ هه‌ر خۆی سه‌رپه‌رشتی‌ی له‌چاپدانی کردووه‌.

**٢١ – ڕوحی مه‌ولا ‌ن خالید:**

ئه‌م کتێبه‌ بریتی‌یه‌ له‌ دیوانی شیعره‌کانی مه‌ولانا خالید، ئه‌و شیعرانه‌ی له‌ بنه‌ڕه‌تدا به‌ زمانی فارسی نووسراون‌و، پیره‌مێردی هه‌مێشه‌ زیندوو، له‌ ڕۆژنامه‌ی «ژین»دا له‌ ژماره‌ «٧٧٤»ه‌وه‌ تا ژماره‌ «٨٨٨» ناو به‌ناو بڵاوی کردوونه‌ته‌وه‌. مامۆستا «محمود احمد محمد»یش ئاماده‌ی کردوون‌و لێ‌ی کۆڵیونه‌ته‌وه‌، له‌م دیوانه‌دا کاك محمود جگه‌ له‌ لێکۆڵینه‌وه‌که‌ی خۆی «٨٥» چامه‌ی له‌ چامه‌کانی مه‌ولانا بڵاوکردۆته‌وه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌و نووسینه‌ی خواڵێ‌خۆشبوو «نجم الدین مه‌لا» که‌ له‌ باره‌ی ژیانی مه‌ولانای نووسیوه‌.

ئه‌م دیوانه‌ «١٨٤» لاپه‌ڕه‌ی قه‌باره‌ گه‌وره‌ی «٢٣٫٥ × ١٦٫٥سم»ه‌و، له‌ چاپخانه‌ی «الزمان» له‌ به‌غدا چاپکراوه‌، له‌ کتێبخانه‌ی نیشتمانیی له‌ به‌غدا ژماره‌ «٦١٦»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوه‌تێ‌و، نرخی دینارو ڕوبعێکه‌و سێ هه‌زار دانه‌ی لێ چاپکراوه‌.

**٢٢ – أقتران النیرین في مجمع البحرین:**

ئه‌م کتێبه‌ بریتی‌یه‌ له‌ ته‌رجه‌مه‌ی حه‌دیسه‌کانی موسلیم‌و بوخاری، که‌ مامۆستا مه‌لا ڕه‌شید به‌گی بابان دایناوه‌و، مامۆستا «محمد علی قه‌ره‌داغی» لێ‌ی‌کۆڵیوه‌ته‌وه‌.

ئه‌وه‌ی شایانی باسه‌ مامۆستا قه‌ره‌داغی له‌م چه‌ند ساڵه‌ی ڕابردوو چوار به‌رگی تری ئه‌م کتێبه‌ ئایینی‌یه‌ی به‌چاپ گه‌یاندووه‌، که‌ ئه‌مه‌یان به‌رگی پێنجه‌میه‌تی‌و، به‌م کاره‌ی توانیویه‌تی شاکارێکی زانایه‌کی ئایینی‌ی کورد زیندوو بکاته‌وه‌و، به‌ کوردی‌یه‌کی جوان لێ‌ی‌بکۆڵێته‌وه‌و پێشکه‌شی کتێبخانه‌ی کوردی‌ی بکات.

ئه‌م کتێبه‌ «٤٢٠» لاپه‌ڕه‌ی قه‌باره‌ گه‌وره‌ی «٢٣٫٥ × ١٧سم»ه‌و، له‌ چاپخانه‌ی «الخلود» له‌ به‌غدا چاپکراوه‌، له‌ کتێبخانه‌ی نیشتمانیی له‌ به‌غدا ژماره‌ «٦١٨»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوه‌تێ‌و، نرخی دوو دینارو نیوه‌و، سێ هه‌زار دانه‌ی لێ چاپکراوه‌. مامۆستا قه‌ره‌داغی هه‌رخۆی سه‌رپه‌رشتی‌ی چاپکردنی کتێبه‌که‌ی کردووه‌..

**٢٣ – سترانێت شه‌ڤه‌روکا:**

به‌رهه‌مێکی دیکه‌ی برای نووسه‌رو ئه‌دیبی فۆلکلۆر دۆستی هه‌رێمی بادینان کاك حجی جه‌عفه‌ره‌. ئه‌م کتێبه‌بریتی‌یه‌ له‌ کۆمه‌ڵه‌ گۆرانی‌یه‌کی ده‌ستاڕ هارینی شه‌وانه‌ی ناوچه‌ی بادینان‌و، به‌شێوه‌ زمانی کرمانجی سه‌روو گوتراون‌و، کاك «حجی» به‌ هه‌وڵ‌و کۆششێکی زۆره‌وه‌ کۆی کردوونه‌ته‌وه‌و، له‌ دوو توێ‌ی به‌رگی ئه‌م کتێبه‌دا پێشکه‌شی کتێبخانه‌ی کوردی‌ی کردوون.

ئه‌م چاپکراوه‌ «١٧٦» لاپه‌ڕه‌ی قه‌باره‌ گه‌وره‌ی «٢٣٫٥ × ١٦٫٥سم»ه‌و، له‌ چاپخانه‌ی «الحوادث» له‌ به‌غدا چاپکراوه‌، له‌ کتێبخانه‌ی نیشتمانیی له‌ به‌غدا ژماره‌ «٦٧٤»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوه‌تێ‌و، نرخی «یه‌ك دیناره‌»و، دوو هه‌زار دانه‌ی لێ چاپکراوه‌. کاك «فهمی باڵابی» نه‌خشه‌ی به‌رگی کتێبه‌که‌ی کێشاوه‌و، کاك «حجی جه‌عفه‌ر»یش هه‌ر خۆی سه‌رپه‌رشتی‌ی چاپکردنی کردووه‌.

**٢٤ – پێوه‌ند:**

کۆمه‌ڵه‌ چیرۆکێکی کاك «عوسمان حه‌مه‌د ئه‌حمه‌د»ه‌، که‌ ئه‌م چیرۆکانه‌ی گرتۆته‌ خۆی: «سه‌فه‌ری سه‌خت، گورگ، که‌ی ده‌بڕێته‌وه‌، شین‌و شابی، نۆ نۆبه‌ره‌، باگردێن، خه‌و، پێوه‌ند، مه‌ستار، شه‌قڵ». هه‌موو چیرۆکه‌کانیش له‌ ساڵی ١٩٨٤و ١٩٨٥ نووسراونه‌ته‌وه‌، نووسه‌ر له‌ کۆتایی‌دا فه‌رهه‌نگۆکێکی بۆ ووشه‌ گرانه‌کان کردووه‌.

ئه‌م کتێبه‌ «٨٠» لاپه‌ڕه‌ی قه‌باره‌ ناوه‌نجی «٢١٫٥ × ١٤٫٥سم»ه‌و، له‌ چاپخانه‌ی «الحوادث» له‌ به‌غدا چاپکراوه‌، له‌ کتێبخانه‌ی نیشتمانیی له‌ به‌غدا ژماره‌ «٧٣١»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوه‌تێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسه‌و، سێ هه‌زار دانه‌ی لێ چاپکراوه‌.

**٢٥ – دیوانی ئه‌سیری:**

ئه‌م دیوانه‌ به‌شێکه‌ له‌ شیعره‌کانی شاعیری نه‌مر «شێخ عه‌بدولخالیق شێخ حوسێنی نه‌قشبه‌ندی – ئه‌سیری» که‌ مامۆستا «مسته‌فا عه‌سکه‌ری» کۆی‌کردۆته‌وه‌و له‌سه‌ری

نووسیوه.

لەپێشەکی‌دا مامۆستا عەسکەری لەوە دەدوێ کە چۆن ئەم دیوانەی کۆکردۆتەوە، ئینجا دێتە سەر باسکردنی ژیانو شی‌کردنەوەی شیعرەکانی ئەسیری، لەوەبەدوا شیعرەکانی بڵاوکردوونەتەوە، نووسەر سوودی لە زۆر سەرچاوە وەرگرتووە بۆ ئامادەکردنی ئەم دیوانە، جگە لەوەی کە لە نزیکەوە ئاگادارێی لە ژیانو بنەماڵەی ئەسیری شاعیرەوە هەبووە. وەکو مامۆستا مستەفا پەنجەی بۆ کێشاوە وادیارە ئەمەیان بەرگی یەکەمی دیوانەکەیەو، دەبێ چەند بەرگێکی تریشی بەدواوە بێت.

ئەم دیوانە «١٧٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٤ × ١٧سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٧٣٢»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «دینارو روبعێکە»و سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە. کاک «اسماعیل خیاط»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە، مامۆستا «ئیبراهیم میرانی»ش پێداچۆتەوەو سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە.

## ٢٩ – زەوی ئاسنو ئاسمان مس:

بەشی دووەمی شاکارەکەی نووسەری بەناوبانگی کوردی تورکیا «یەشار کەمال»ە، کە لە سێ بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمیان: بەناوی «کاریتە یا ئەو دیوی چیا»یە، کە لە ساڵی «١٩٦٠»دا بڵاوبۆتەوەو، مامۆستا «شوکور مستەفا» ساڵی ١٩٨٣ بەکوردی بڵاوی کردۆتەوە، ئەم کتێبەش کە بەشی دووەمی سێینەکەیە، هەر دیسان مامۆستا شوکور کردوویەتی بەکوردی‌و بە چاپی گەیاندووە، ئەمەیشیان ساڵی ١٩٦٧ بۆ یەکەمجار بە زمانی تورکی دەرچووە، بەشی سێیەمیشیان کە هێشتا نەکراوە بەکوردی هیواخوازین بەم نزیکانە بەچاپکراوی بە زمانی کوردی ببینین - بۆ یەکەمجار بە زمانی تورکی لە ساڵی ١٩٦٨دا بڵاوبۆتەوە.

زەوی ئاسنو ئاسمان مس کە مامۆستای ئازیز شوکور مستەفا لە زمانی تورکی‌یەوە وەریگێڕاوە، «٤٢٤» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣ × ١٧سم»ەو، لە چاپخانەی «علاء» لە بەغدا چاپدراوە، لەکتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٧٦٨»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی سێ دینارەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە، دەرهێنانی هونەریی کتێبەکە «عەزیز رەشید حەریری» ئەنجامی داوە..

## ٢٧ – «١٠٠» ناوداری جیهان:

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە ژیانو سەربردەی «١٠٠» ناوداری جیهان، ئەوانەی لەم بوارانەدا دەورێکی باڵایان بووە «داهێنانو زانستەکان، سەرکردەی سەربازی‌و سیاسیەکان، فەیلەسوفە دوور لە ئایینەکان، پێشەوا ئایینی‌یەکان، هونەرمەندو نووسەرەکان، زەمین دۆزەکان».

ئەم کتێبە «د. مایکل هارت» نووسیویەتی‌و، کاک «ئەسعەد قەرەداغی» لە عەرەبی‌یەوە وەریگێڕاوە، کاکی قەرەداغی لەژێر سەردێڕی «بەربورە» پێشەکی‌یەکی بۆ نووسیوە. ئینجا پێشەکی دانەری بەدوادا دێ. ئیتر یەکە یەکە ناودارەکان باس دەکات.

ئەم کتێبە «٤٢٤» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣ × ١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «حسام» لە بەغدا چاپکراوە، لەکتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٨٥٧»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «دوو دینارە»و، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە. برای هونەرمەند کاک ئەنوەر قەرەداغی، وێنەی ناودارەکانی گرتۆتەوەو، کاک «ئازا حسیب قەرەداغی»ش وێنەی هەندێ ناوداری دروست کردووەو، نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، دەرهێنانە هونەرکەیشی ئەنجام داوە. کاک «نازم دڵبەندیش» سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە..

## د کتێبە یارمەتیدراوە عەرەبی‌یەکان:

### ١ – مدینە اربیل – دراسە فی جغرافیة الحضر:

ئەم کتێبە بە زمانی عەرەبی نووسراوە، نووسەرەکەی مامۆستای دوکتۆر «هاشم خضیر الجنابی»یە، ئەم مامۆستایە دەمێکە بەم جۆرە لێکۆڵینەوانەوە خەریکە. بۆ نموونە دوو سێ ساڵ بەر لە ئیمرۆ لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی شاری دهۆکەوە نووسی کە لە لایەن ئەم ئەمینداریتی‌یە یارمەتی درابوو، ئەمە جگە لە بڵاوکراوەو ووتارو نووسینی تر لە بواری پسپۆریی خۆی‌دا.

نووسەر بۆ ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەرکێکی زۆری کێشاوەو، زۆربەی ئەو شوێنانە گەڕاوە کە باسی کردوون، هەروەها باسەکەی بە وێنەو نەخشەی تایبەتی دەوڵەمەندتر کردووە، بەراستی ئەم لێکۆڵینەوەیەی د. هاشم لەبارەی شاری هەولێرەوە چڕو پڕو تێرو تەسەلە بە تایبەتی کە لایەنە جوگرافیایی‌یەکەی وەرگرتووەو، لەگەڵ لایەنە مێژوویی‌یەکەدا بەیەکی بەستۆتەوە.

ئەم کتێبە «٢١٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣ × ٥ر١٦سم»ەو، لە چاپخانەی (دار الکتب)ی سەر بە زانکۆی موصل، لە موصل چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارە «٩١»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی «دوو دینارو نیوە»و سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە..

### ٢ – طاعة الاوامر واثرها فی المسؤولیة الجزائیة:

ئەم کتێبەیش هەر بە زمانی عەرەبی دانراوە، دوکتۆر حکمت موسی سلمان نووسیویەتی‌و، بە یارمەتی ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان لەچاپدراوە، ئەم کتێبە دەقی ئەو ئوتروحەیەیە کە نووسەر پێشکەشی کۆلیجی یاساو رامیاریی زانکۆی بەغدای کردووەو، لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٥دا پلەی دکتۆرای لە یاسا پێ وەرگرتووە، نووسەر لەکاتی چاپکردنی ئەم کتێبەدا هەموو ئەو شتە تازانەی خستۆتە سەر، کە دوای وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆراکەی دەرچوونو بڕیار دراون. ئەم کتێبە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە، هەر بەشێکیش کراوەتەوە چەند بەشی جیاجیا. لەگەڵ ووتەی کۆتایی‌و، ناوی ئەو سەرچاوانەی سوودی لێ وەرگرتوون، کە بە زمانی عەرەبی‌و، ئینگلیزی‌و، فەرەنسی‌و، ئەڵمانی‌و، تورکین.

ئەم کتێبە یاسایی‌یە «٢٥٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٤ × ١٦سم»ەو. نە کتێبخانەی نیشتمانیی ژمارە «٥٢٢»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و، نرخی چوار دینارەو سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە. هونەرمەند «عبد الستار الخیالی» نەخشەی بەرگی کتێبەکەی کێشاوە.. بەڵام کتێبەکە ناوی چاپخانەکەی بەرسەرەوە نی‌یە، بۆیە ناومان نەبردووە.

**وێنەکان : أبو صباح**

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## هەولێر

دزوار

دەزگای گشتی سینەماو شانۆ. تیپی نواندنی هەولێر لە رۆژی ١٩٨٧/١٢/٢٨ لەسەر شانۆی هۆڵی (ابن المستوفي). بۆ ماوەی چوار رۆژ شانۆگەری (کانیی مەلەك رێزان) ئامادەکردنی ئەسعەد عەدۆ. دەرهێنانی مامۆستا صفوت الجراحی پێشکەش‌کرد. ئەوەی شایانی باسە ئەم شانۆگەری‌یە لە دەقێکی فۆلکلۆری کوردی‌دا بە ناوی (ناسرو ماڵماڵ) ئامادەکرابوو. هونەرمەند صفوت الجراح دەرهێنەری شانۆگەریەکە لە وتەکەیدا دەڵێ: [بە پێی ئەو نەخشەو بەرنامەیەی کەوا تیپی نواندن دایناودو لە سەری دەروات بۆ پێشکەشکردنی دەقی شانۆگەری خۆماڵی بەنووسین یا بە ئامادەکردن لە فۆلکلۆرو کەلەپچەری نەتەوەی کوردمان.. تاکو ئێستا هەر لەسەر ئەو نەخشەیە بەردەوامە.. ئەو شانۆگەریەش وەك ئەوانی‌تر لە چوارچێوەی ئەو نەخشەیەدایە.. ئەو هەوڵەی نووسەریش یەکەمجارە لە ئامادەکردنی ئەو دەقە شانۆییە لە کەلەپچەرو فۆلکلۆری کوردی کە بەشێکە لەو هەوڵەو گرنگی پێدانەی نووسەر لەفۆلکلۆردا...].

ئەکتەرەکان بە پێی دەرچوونیان: سلام کۆیی - حیکایەتخوان. شیرین صابر - پیرەژن، ابراهیم حکیم - تەمر، علی گەرمیانی - ئاقڵمەند + لێوبراو، محمود احمد - باب کۆمەر، رزگار لشکری - علی خان. اسماعیل علی - خەسرۆ +چایچی + دەرگەوان، بکر معروف - ناسر. محمد سعید ابراهیم - ماڵماڵ، سوسن سعدون - نازێ، گەلاوێژ طاهر - نازدار، دڵزار اسماعیل - رێبوار + پیاوی حەیدەرخان، فوزی جلال - حەیدەرخان، ئاسایش عثمان - ئەحمەدی وەزیر، جلال احمد بیار - والی، جوهر باپیر - خاڵەباز، انور عزیز - شوانۆ، نجدت صفوت - برا





بچووکی ماڵماڵێ، کاره هونه‌ریه‌کان: نه‌خشه‌ی دیکورو جێبه‌جێ‌کردنی عبد الواحد مرجانو برزۆ عبد الواحد، رۆناکی – شاهین نجم‌الدین، ئارایشت – مؤید محمد فقێو چه‌ندان ئه‌کته‌ریش هاریکاری کاره هونه‌ریه‌کانیان کردووه.

• تیپی شانۆی سامان سه‌ر به مه‌ڵبه‌ندی لاوانی شه‌هید ئیبراهیم له رۆژی ۹۸۷/۱۲/۲۱ له سه‌ر هۆڵی رۆشنبیری جه‌ماوه‌ر شانۆگه‌ری (قونکه جگه‌ره) نووسینی سعدون العبیدی وه‌رگێرانی کاظم خرواتانی، ده‌رهێنانی مؤید فقێ بۆ ماوه‌ی سێ رۆژ پێشکه‌ش‌کرد. ئه‌کته‌ره‌کان به گشتی: سردار علی – پیاوه‌که، عدنان رۆژبه‌یانی – لاوه‌که، شاسوار عثمان – پاریزه‌ر، ناظم شێخانی – ئه‌فریقی، فارس سعید – هیندی، حمه‌د قادر – پولیس، فرمێسك‌و هاوری و هونه‌ر مؤید فقێ – چۆله‌که (۱، ۲، ۳). کاره هونه‌ریه‌کان: به‌رێوه‌به‌ری به‌رهه‌م عونی شاکرو عبدالرحمن ادم نجم، به‌رێوه‌به‌ری شانۆ – پشتیوان عبدالله احمد، ئه‌ندازی دیکۆر – لقمان طاهر، هه‌ندێك له ئه‌کته‌ره‌کان به‌شداری کاره هونه‌ریه‌کانیان کردووه سه‌ره‌رای فرست زبیر.

• تیپی هونه‌ری نوێی شانۆی کوردی هه‌ولێر له رۆژی ۱۹۸۸/۱/۷و رۆژانی دوایی شانۆگه‌ری (که‌مانچه‌ی رۆچێڵد) کورته چیرۆکی چیخۆف وه‌رگێرانی ره‌ئوف بێگه‌ردو ئاماده‌کردنی به‌کر ره‌شید ده‌رهێنانی کریم عوسمانی نه‌سه‌رشانۆی هۆڵی ئیبنی مستوفی پێشکه‌ش‌کرد. ئه‌وه‌ی شایانی باسه ئه‌م‌شانۆگه‌ری‌یه به‌رهه‌می یه‌که‌می ئه‌و تیپه‌یه، کارگێرانی تیپی شانۆی هونه‌ری نوێ ده‌ڵێن: [له‌دایك‌بوونی ئه‌م تیپه تازه‌یه‌ی ئێمه، ده‌روازه‌یه‌کی تره بۆ گه‌شه‌سه‌ندنو په‌ره‌پێدانی شانۆی کوردیمان، شان به شانی تیپه شانۆییه‌کانی تری کوردستان به‌و هیوایه‌وه ئه‌و تیپه هاتۆته کایه‌وه‌و به‌و هیوایه‌ش به‌رده‌وام ده‌بێت له رێبازی کارکردنی خۆیدا، له یه‌که‌م نۆبه‌ره‌ی خۆشیه‌وه هیوا ده‌خوازێ که‌وا خۆپێشکه‌شکردنی خۆپێشکه‌شکردنیکی پر له ئومێد بێت].

ئه‌کته‌ره‌کان: صباح عبد الرحمن، دڵپاك طاهر، ولید معروف، حه‌مه‌سه‌عی ابراهیم، مناڵه‌که شێنێ ئاراس. شیعری پێشه‌کی به‌سه‌نین وه‌رگێرانی محمود زامدار، ئاوازی ئامانج غازی، وتنی هاوتا ئه‌سعه‌د. سه‌ره‌رای هه‌ندێك له ئه‌کته‌ره‌کان ئه‌م برایانه به‌شداری هونه‌ریان‌کرد دڵزار کافرۆشی‌و بکر برهان.

ئه‌ندامانی تیپی مۆسیقای ئۆرکسترای پاشای گه‌وره هونه‌رمه‌ندان. ئامانج غازی، احمد جبار، ابراهیم حسن، طلعت حه‌وێز به شداری مۆسیقای شانۆگه‌ریه‌که‌یان‌کرد. ده‌رهێنانو وێنه‌گرتنی سینه‌مایی هونه‌رمه‌ند ناسر حسن. جێبه‌جێ‌کردنی وێنه‌ی سینه‌مایی هونه‌رمه‌ند لقمان به‌رزنجی، خه‌ت‌و پرۆگرام عمر ده‌روێش، پۆسته‌ر ئازا حسیب قه‌ره‌داغی.

• تیپی هونه‌ری هه‌ولێر له رۆژی ۹۸۸/۲/۱۷و رۆژانی‌تر له هۆڵی ابن‌المستوفی‌دا شانۆگه‌ری (نالی‌و خه‌ونێکی ئه‌رخه‌وانی تر)ی پێشکه‌ش‌کرد. ئه‌م شانۆگه‌ری‌یه له نووسینی مامۆستا ئه‌حمه‌د سالاری هونه‌رمه‌ندو ده‌رهێنانی هونه‌رمه‌ند حه‌مه عه‌لی‌بوو، ئه‌کته‌ره‌کان به گشتی: حه‌مه عه‌لی – نالی، شلێر ئه‌حمه‌د – حه‌بیبه، زایه‌ر عبدالله – حیکایه‌تخوان، ئه‌حمه‌د جه‌میل‌و سیروان عوسمان‌و ئیسماعیل قادر – ده‌نگی (۱، ۲، ۳)، سوسن سعدون – دایك، رزگار ئه‌حمه‌د – مامۆستا، ئیسماعیل عبد الوهاب – جارچی + سالم، عه‌دنان رۆژبه‌یانی – رامبۆی شاعیر، لقمان محه‌مه‌ده‌مین – چاره‌نووس.

کۆرس‌و قوتابیان: خطاب حامد، بدیع شریف، نور الدین محمد، سالار جعفر، خالد محمد، کمال صابر، محمد حسن، مسعود محمد، کمال عثمان، عمر احمد، نه‌وزاد حسین، یاسین اسماعیل، یوسف نوری، قاسم ابراهیم، یوسف عبدالله، پشتیوان محمد.

## پیشانگا

• به‌سه‌رپه‌رشتی ئه‌میندارێ گشتی رۆشنبیری‌و لاوان پیشانگای هونه‌ری هاوبه‌شی هونه‌رمه‌ندان نورالدین ابراهیم جاف‌و حسام حکیم له هۆڵی رۆشنبیری‌و لاوان له ۹۸۷/۱۲/۲۹ تا ۹۸۸/۱/۲ سازکرا. تابلۆیه‌کانی هونه‌رمه‌ند حسام حکیم بریتی‌بوون له مانه‌ی خواره‌وه: شه‌نگه‌بیری، لادێ، کلۆڵی، هونه‌رمه‌ند، نووستوه‌کان، شه‌ترەنج، خاچ، دابران، سه‌ربه‌ستی، ژووان، درنده، پایز، دیمه‌ن.

به‌ڵام تابلۆکانی هونه‌رمه‌ند نورالدین جاف بریتی‌بوون له: هاوارێکی تاساو، ره‌نج، کۆڵنه‌دان، دایکایه‌تی، هه‌ژان، بارانی ناوه‌خت، خۆبه‌خت‌کردن، شوان، هارین، گزنگ، دواسه‌رنج، ره‌شه‌باو چه‌ندانی‌تر.

• له رۆژی ۱۹۸۸/۲/۱۵ له هۆڵی قوتابخانه‌ی ئه‌یوبیه‌ی کچان پیشانگای چواره‌می ئیشی ده‌سکردو پیشه‌سازی میللی چاوی ته‌ماشاکه‌رانی پێ‌روون بۆوه، ئه‌وه‌ی شایانی باسه ئه‌م خوشك‌و برا هونه‌رمه‌ندانه به‌شداری ئه‌م پیشانگایه‌یان کرد: فازل ئیبراهیم ئۆرفه‌لی، هیوا هاشم، کافیه خۆشناو، گولاڵه خۆشناو، فارس مه‌سیفی، نه‌جات علی.

بابه‌ته‌کان بریتی بوون له مافورو دارتاشی‌و تابلۆو جل‌و به‌رگ‌و که‌ل‌وپه‌لی کۆنینه، ته‌سبیح، سه‌ماوه‌ر.... هتد، ئه‌وه‌ی شایانی باسه خه‌ڵکێکی زۆر زۆر هاتنه دیده‌نی ئه‌م پیشانگایه.

• کۆمه‌ڵه‌ی هونه‌ره جوانه‌کانی کورد له سلێمانی پیشانگای تایبه‌تی هونه‌رمه‌ند علی جۆلای له رۆژی ۱۹۸۸/۲/۱۸ له هۆڵی رۆشنبیری‌و لاوان له هه‌ولێر سازکرد. پیشانگاکه بریتی‌بوو له‌م تابلۆیانه: قاپ – سیرامێك، گوڵ‌دان، دوو ئافره‌ت، رۆڵه‌ی دواڕۆژ، گفتوگۆ، گوڵی زه‌رد، ماڵ ئاوایی، ژنه کوردێك، سلێمانی له‌شه‌وا، کۆچ، ترس، کیژی دۆزراوه، هاوارو مردن، تارمایی، بۆن، کاروان، شه‌وه‌زه‌نگ‌و چه‌ندانی‌تر.

مامۆستا جۆلا له ساڵی ۱۹۶۶ به پله‌ی ئیمتیاز له ئه‌کادیمیای هونه‌ره جوانه‌کان ده‌رچووه، به‌شداری کردووه له پیشانگای گرافیك له ده‌ره‌وه‌ی وولات له ئه‌ڵمانیاو لاوانی جیهان‌و هونه‌رمه‌ندان له ئیتالیا. پیشانگای گه‌رۆك له موسل‌و به‌سره‌و به‌غدا. ڤیستڤاڵی هونه‌ری کوردی یه‌که‌م له به‌غدا. هونه‌رمه‌ندانی کورد له هه‌ولێر. پیشانگای تایبه‌تی له ساڵانی ۱۹۶۸، ۱۹۶۹، ۱۹۷۰، ۱۹۷۱ کردۆته‌وه. له ساڵی ۱۹۷۱ له مه‌ڵبه‌ندی رۆشنبیری سۆڤیتی له به‌غدا.



## صاف هیرانی

له رۆژی ۱۹۸۸/۲/۱۸ ده‌زگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنه‌وه‌ی کوردی کۆرێکی خنجیلانه‌ی له ژێر ناونیشانی (له یادی صاف هیرانی‌دا) بۆ مامۆستا محه‌مه‌دی مه‌لا مسته‌فا، له هۆڵی رۆشنبیری جه‌ماوه‌ر سازکرد. له سه‌ره‌تادا مامۆستا محمود زامدار چه‌ند پارچه شیعرێکی خوێنده‌وه.. ئینجا پووخته‌یه‌کی ژیانی کاك محه‌مه‌دی مه‌لا مسته‌فای پێشکه‌ش به ئاماده‌بوان‌کرد، دوا به دوای ئه‌مه شێخ جه‌مال به‌رزنجی غه‌زه‌لێکی پێنج خشته‌کی له‌سه‌ر شیعری صاف خوێنده‌وه.

ئینجا کاکه محه‌مه‌د هاته سه‌ر باسه‌که‌و به‌م جۆره‌ی خواره‌وه‌ی دابه‌ش‌کرد:

- هۆی هه‌ڵبژاردنی ئه‌م شاعیره.
- په‌یوه‌ندی بنه‌ماڵه‌ی مامۆستای موحازیر له گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌ی صاف‌دا.
- جیاوازی نێوان دیوانه چاپکراوه‌کان‌و ده‌ست خه‌تی دیوانی صاف.
- ژیان‌و سه‌ربرده‌ی صاف شاعیر.
- صاف‌و رێبازی قادری‌و په‌یوه‌ندی به ده‌وروبه‌ر.
- شیعری بلاونه‌کراوه‌ی صاف له کوردی‌و عه‌ره‌بی‌و فارسی‌و تورکی.
- صاف له سه‌رچاوه‌ی کوردی، عه‌ره‌بی، بیانیدا.

مامۆستا محه‌مه‌د توانی زیره‌کانه ده‌ست نیشانی ئه‌و جیاوازیانه‌ی نێو دیوانی چاپکراو ۱۹۵۳، ۱۹۷۳ له گه‌ڵ ده‌ست‌خه‌ته‌که به‌راورد بکات‌و شیعره‌کان بگه‌ڕێنێته‌وه سه‌ر ده‌قی خۆی.. بۆ نموونه پارچه‌ی [(شاری) قه‌لبی حه‌زینم]هه‌روه‌کو له ده‌ست خه‌ته‌که‌دا نووسراوه، که‌چی له هه‌ردوو چاپکراوه‌که المعارف‌و گیودا نووسراوه [(شاره) قه‌لبی حه‌زینم] ئه‌وکه‌سه‌ی له (تفعیلات)ی (عروض) ده‌زانێ، ده‌زانێ ئه‌وه‌ی دوایی چه‌وته، چونکه له‌نگی پێوه دیاره. نموونه‌یه‌کی دیکه‌ی ده‌ست خه‌ته‌که:

مه‌علوومه که ده‌رناچێ له‌به‌ر تیری سواران
چه‌ند ده‌فعه (له ئه‌م قازوخه‌یان) داوه دڵی من

کەچی لە نموونەی چاپکراوەکاندا:

**مەعلوومە کە دەرناچێ لەبەر تیری سواران**
**چەند دەفعە (لە دەم قازوخیان) داوە دڵی من**

هەروەها کاك محەمەد توانی دەست نیشانی ئەو شیعرە هەشت دێڕیە بکات (وردە خاڵی ئێستەکێش نازی لەسەر پەروین دەکا) کە لە دیوانە چاپکراوەکاندا بۆتە حەوت دێڕ، کەچی لە ڕاستیدا دێڕی شەشەمی شیعرەکە بزرەو لە دەست خەتەکەدا وانووسراوە.

**«بۆ پیاکەی جانی من گەربێ ڕوخی شای دەرکەوێ**
**بۆ فرازی فەرزە گەر ئەو فیلو ئەسپی زین دەکا»**

بۆ زیاتر روون کردنەوە وشەی «پیاکەی» لە شوێنی «پیادەکەی» بەکار هاتووە، کە پیادەو فەرزە، روخ، فیل، شا، ئەسپ ناوی بەردەکانی یاری سەرترنجانێیە (الشطرنج).

دوا بە دوای ئەمە کاك محەمەد هاتە سەر باسکردنی بابەتە جۆراو جۆرەکانی شیعری صافی وەك: عیشقو تەسەوف، فەلسەفەو حیکمەتو مەنتق، سەربردەی پێغەمبەرانو ناوداران، باسی هونەرمەندانو بەهرەوەرانی کۆن لە ڕازاندنەوەیاندا وەك مانی، نەققاش، جەنگو بەگژیەکداچوون، اقتباس، کینایە، جیناس، تەوریە، تیباق، موقابەلە.

لە کۆتاییدا باسی ئەو شاعیرە کوردانەی کرد کە چوارینو پێنج خشتەکیان لەسەر شیعری صافی داناوە، هەروەها بە پێچەوانە. ئەوەی شایانی باسە صافی نەمر لە زۆر جێگادا بە تێك هەڵکێشان هەرچوار زمانی لە یەك شیعردا بەکار هێناوە.

خۆی کوردیە صافی لە هەوای عیشقی تو ئێستێ
کوردیو عەرەبیو فارسو تورکی بوە ئەشعار

○



## سلێمانی

- ئازاد -

بەرلەوەی سەبارەت چالاکیە ڕۆشنبیریەکانی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی تازە (١٩٨٨) بنووسین بە پێویستمان زانی کە ئاماژە بۆ دوو چالاکیی مانگی دوانزدەی ساڵی رابوردوو بکەین کە بەرێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەر پێیان هەڵساو لە کاتی خۆیدا فریای راپۆرتی پێشوو نەکەوتن:

* لە رۆژانی ١٥ تا ٢٥ - ١٢ - ١٩٨٧دا و لە هۆڵی گەلەریو لەلایەن بەرێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەرەوە لە سلێمانی پیشانگایەکی فراوان کرایەوە کە تیایدا (شیعرو رەنگ) ئامبازی یەکدی بووبوونو شایستەی دیاردی کردنە کە پیشانگاکە هەر لە ژێر هەمان ناونیشانیشدا کرایەوە.

**لەم پیشانگایەدا شیعری «٣٨» شاعیری کوردی کلاسیكو نوێ بووبوونە ئیحا بەخشی چەندان هونەرمەندی تەشکیلی لە کێشانی تابلۆ یان خولقاندنی کارە هونەریەکانی تریاندا.** هونەرمەند خالید رەسوڵ لەبارەی **ئەم پیشانگایەوە نووسیبووی:** (کە هونەرمەند پەیامە هەمیشە پیرۆزەکەی **هونەر لە ئامێز دەگرێتو تێکەڵ** بە کاروانی هونەروەران دەبێت تا هەموو **پێکرا لەو رێیەوە پەیامەکە بە مەنزڵ بگەیەنن..** هەڵبەت گرنگە گەر **هاوکاریەك لێرەوە بێتە گۆرێ..** با هەستو سۆزی هونەرمەندان لەنێو **تریفەی شیعری شەنگی شاعیراندا** بتوێتەوەو پەیڤو پیتو دەربڕینیش لەبەر بارانی بەخوری رەنگو شێوەو تابلۆکاندا سەمابکەن...».

شایانی ئاماژەیە پۆستەری پیشانگاکەیش هەر لەلایەن هونەرمەند «خالید رەسوڵ»ەوە کرابوو.





• لە رۆژانی ١٧ – ١٨ / ١٢ / ١٩٨٧داو لە لایەن هەمان بەڕێوەبەرێتی ی ناوبراوەوە لە هۆڵەکەیدا دوو ئێوارە کۆڕی فراوان لە شێوەی فیستیڤاڵێکدا بۆ شاعیری کلاسیکی گەورەی کورد «مەحوی» سازدرا کە تیایدا هەر یەك لەم مامۆستایانە بە توێژینەوەیەك لەمەر لایەنێك لە لایەنە فرەکانی جیهانە فراوانەکەی شاعیرەوە بەشداری ی کرد:

(پرۆفیسۆر د. عیزەدین مستەفا رەسول، مامۆستای شاعیر، سالح دیلان، مامۆستا کەریم شارەزا، مامۆستا ئەحمەد سالار، مامۆستا عەبدولقادری دەبباغی، مامۆستا حەسیب قەرەداخی ی شاعیر)، هەروەها لەم فیستیڤاڵەدا لە لایەن تیپی شانۆی سالارەوە چالاکیەکی شانۆیی بە ناونیشانی «لە میحرابی مەحوی دا»ی پێشکەش کرا.

**«نرخی ئازادی»**

بەشی هونەری شانۆی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی لە رۆژانی ٣ – تا – ٢٢ / ١ / ١٩٨٨ دا لە سەر شانۆی پەیمانگا لە پێشکەش کردنی شانۆیی ی «نرخی ئازادی» بەردەوام بوون.

ئەم نمایشنامەیە لەنووسینی «عەمانۆئیل رۆبلس»ەو کاك «تۆفیق ئەحمەد عەبدول» وەری گێراوەو ئامادەی کردووەو هونەرمەند «عصمان فارس» دەری هێنا.

ئەکتەرەکانی ئەم کارە شانۆییە لە چەند قوتابیەکی بەشی شانۆ پێکهاتبوونو برێتی بوون لە: (زوهێر حەمە ئەحمەد – مەحمود، نیاز لەتیف – محەمەد، سەرکەوت حەمە سەعید – ئەفسەر، ئاکۆ سدیق – جۆنی، کامەران فەتاح – دلاوەر، مەریوان ئیبراهیم بازرگان، ژیان ئیبراهیم دایك، سۆزان عوسمان – قوتابی، گۆران عوسمانو بەڵێن جەلال – هونەرمەند، کاروان عومەرو ئامانج حەمە سالحو داخل جەبارو سالار سەلاحەدین – سەربازەکان، پێشرەونەوزادو کاروان عوسمان – کۆرس).



هونەریەکانیش برێتی بوون لە: (مامۆستا حیکمەت هیندی – دیکۆر، بەختیار کەریم – ئاوازو مۆسیقا، مەریوان جەلال – نیگارکێش).

شیعرەکانیش کە کرابوون بە گۆرانی شیعری شاعیرانی عیراقی بدر شاکر السیابو رشدی العامل بوون کە کاك «عاصی باجەلان» وەری گێرابووە سەر کوردی.

«پیشانگای تایبەتی ی هونەرمەند عەلی جۆڵا»

لە رۆژانی ١٤ تا ٢٣ / ١ / ١٩٨٨ کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لە سلێمانی لە هۆڵی گەلەریدا پیشانگایەکی تایبەتی بۆ هونەرمەند «عەلی جۆڵا» کردەوە.

هونەرمەند لەم پیشانگایەدا بیستو پێنج کاری هونەری ی خۆی پیشاندابوو کە تێکەڵاو بوون لە کاری سیرامیكو میناو زەیتو لەو کارانەیش: (گوڵدان، گفتوگۆ، دەوار، سلێمانی لەشەودا، کۆچ، ترس، هاوارو مردن، دەربەدەری، تارمایی.... هتد).





-- هونەرمەند عەلی جۆڵا لە ساڵی ١٩٦٦دا بە پلەی ئیمتیاز لە ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان لە بەغداد دەرچووە.

– لە پیشانگای (گرافیك)ی دەرەوەی وڵات لە ئەلمانیاو پیشانگای هونەرمەندانی کورد لە ئیتالیادا بەشداری کردووە.

– لە فیستیڤاڵی یەکەمی هونەری کوردی لە بەغدادو پیشانگای هونەرمەندان لە هەولێردا بەشداریی کردووە.

– لە ساڵانی ١٩٦٨و ١٩٦٩و ١٩٧٠و ١٩٧١دا پیشانگای تایبەتی ی کردووەتەوە.

●



## «پیرەمێرد» لە کۆڕێکدا

●

سەر لە ئێوارەی رۆژی ٢١ / ١ / ١٩٨٨ و لە لایەن بەڕێوەبەرێتی ی رۆشنبیری ی جەماوەرەوە لە سلێمانی و لە هۆڵەکەی خۆیدا کۆڕێك بۆ برای نووسەر کاك «ئومێد ئاشنا» سازدرا.

پاش ئەوەی کاك «شەهاب عوسمان» کە کۆڕەکەی بەڕێوەدەبرد خۆشهاتنی لە ئامادەبووانی کرد کاك ئومێد دەستی بە خوێندنەوەی باسەکەی کرد کە سەبارەت ژیانو کارەکانی «پیرەمێرد»ی شاعیر بوو.

شایستەی ئاماژەکردنە کە باسەکە پتر خستنە رووی ئەو پرۆژەی نووسینەی لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوەیەی نووسەرە بۆ کارو بەرهەمەکانی



شاعیری ناوبراو کە چەند ساڵێك خۆی پێوە ماندوو کردووەو کردوو یەتی بە پرۆژەی کتێبێکی قەوارە (١٦٥٠) لاپەڕەیی و بەسەر ئەم بەشانە یشد دابەشی کردووە:

١ – یاداشتەکانی پیرەمێرد.

٢ – لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکانی پیرەمێرد.

٣ – پیرەمێردو زمان.

٤ – بابەتو ناوەرۆکی شیعرەکانی پیرەمێرد.

٥ – شێوەی شیعرەکانی.

٦ – تێگەیشتنی زانستی پیرەمێرد بۆ نەورۆز.

ئەمەو جگە لە ئاماژەکردن بۆ ئەو بوارانەی دی کە شاعیر خۆی لە قەرەیان داوە وەکو بواری نووسین بۆ شانۆ (مەمو زین، مەحمود ئاغای شیوەکەڵ، شەریف هەمەوەندی) هەروەها بواری ئەدەبی بەراوردکاری.

لە کۆتاییدا چەند پرسیارێك لە لایەن براو خوشکانی ئامادەبووی کۆڕەکەوە ئاراستەی کاك ئومێد کرانو بە وەرامدانەوەیان کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا.







### «سالەك بوری ل سەر وەغەر كرنا محمد عارفێ جزيری»

ل ژێر چاڤدێريا هێژا سەيدا محمد امين محمد احمد ئەمينداریێ گشتی يێ رەوشەنبيری‌و لاوان ل رێكەفتی ١٧ / ١٢ / ١٩٨٧ ل هولا رەوشەنبيری جەماوەر ئاهەنگەكا مەزن هاتە سازكرن ب هەلكەفتنا بورينا سالەكێ ل سەر وەغەركرنا سترانبێژێ بناڤ‌و دەنگ خودێ لێخوش محمد عارفێ جزيری.

ئەڤيندارو شەيداييت ئاوازو سترانێت ڤی هونەرمەندێ مەزن ژ بەغداو سليمانێ‌و هەڤلێرو ئاكرێ‌و مويسل‌و زاخوو دهوكێ‌و ئامێدیێ ل ڤێ ئاهەنگێ ئامادەبون. ل پێشیێ هێژا اسماعيل گەيلانی موحازەرەك سەبارا ژيان‌و هونەرێ محمد عارفێ جزيری پێش كێش كر.

ددويڤدا چەند هونەرمەندەكا سترانێت خودێ لێخوش بدەنگێ خو گوتن. ژوان سترانبێژا: فؤاد احمد – تحسين طه – صالح ئامێدی احمد زێباری – ميران هەركی. هەژی گوتنێ‌يە بێژين كو ل ڤێ ئاهەنگا مەزن هێژا ئەمينداریێ گشتی يێ رەوشەنبيری‌و لاوان ئەمر كر كو ناڤێ خودێ لێخوش محمد عارفێ جزيری دانە سەر هولا رەوشەنبيری جەماوەر ل پارێزگەها دهوكێ. براستی ئەڤ پێنگاڤە خەلاتكرنەكا بێ‌قام ژبهاتی‌يە بو هونەرمەندێ مەيێ خودێ لێخوش جهێ رێزو شانازی‌يا مە هەميانە.

### «ميهرەجانەكا هوزانێ»

بچاڤدێريا هێژا پارێزگەرێ دهوكێ. ئێكەتيا نڤيسڤانێت كورد ل دهوكێ ميهرەجانەكا هوزان خاندنێ ل رێكەفتی ٢٧ / ١٢ / ١٩٨٧ ل هولا رەوشەنبيری جەماوەر بهەلكەفتنا بورينا چل رۆژا ل سەر شەهيدبونا هژمارەكا وەلاتيا ل نەخوشخانا دهوكێ ب ئەگەرا توپ بارانكرنا فروكێت رژێماخومەينیێ خوين مێژ.

١٥ هوزانڤانا ژ بەغداو هەڤلێرو دهوكی دڤێ ميهرەجانێ‌دا هوزان خاندن. هژمارەكا بەرفرەه - ژ بەر پرسياو ئەديب‌و رەوشەنبيرو خەلكێ بازێری‌و خێزانێت شەهيدا لڤێ ميهرەجانێ ئامادەبون.

ژرێڤە گوتارێت ئێكەتيا نڤيسڤانێت كورد ل دهوكێ‌و رێكخراوێت شەبی‌و مللی‌و خێزانێت شەهيدا هاتنە خاندن.

پاشی هێژا جمال سليمان بەرواری هوزانڤان پێش كێش كرن ئەوژی ئەڤێت ژێری بون: محسن قوچان حسب الشيخ جعفر محمد البدری – خالد



حسين – عبد اللطيف بندر اوغلو – عبد الله عباس – نافع عقراوى – عبد الوهاب طالبانى – تيلى امين – عبد الخالق سەرسام – هزرڤان عبد الله – سگڤان عبد الحكيم – صلاح سيدوك – شكرى شەهباز – عبد العزيز خەيات.

ل دوماهيێ ئێكەتيا نڤيسڤانا ل دهوكێ بروپسكەك بو سەروكێ فەرماندە صدام حسين (خودێ بهێليت) هنارت، تێدا سوزو پەيمان نوى كرن كو هەميشە سەربازێت دلسوزو ب وەفا بن بو بەرەڤانيێ ژ ئاخا وەلاتێ پيروز دژى دەست درێژيێت خومەينيێت خوين مێژو شەر فروش و هەمى دەما قەلەمێت وان دتەرخان كرى بن درێكا سەرفەرازىو سەر بلنديا عيراقا خوشتڤى دا.

**«دوو پێشانگەه–»**

ب هەلكەفتنا سوپاييێ مەيێ قارەمان، ل رێكەفتى ٦ / ١ / ١٩٨٨ ل ژێر چاڤدێريا هێژا پارێزگارێ دهوكێ، ل هولا خاندنگەها گولستان پێشانگەهەك ژ لايێ دەزگەها رەوشەنبيرىو بەلاڤكرنا كوردى ل دهوكێ هاتە ڤەكرن.

دڤێ پێشانگەهێ‌دا هژمارەكا مەزن يا پەرتوكا هاتنە پێش چاڤ كرن، ژوان پەرتوكێت دەزگەها رەوشەنبيرىو بەلاڤكرنا كوردى ڤان سالا چاپ كرين.

ديسان هەر بڤێ هەلكەفتنێ هێژا پارێزگارێ دهوكێ ل هولا بزاڤێت ڤێرگەهى پێشانگەهەكا شكلێت زاروكا ڤەكر، هژمارەكا زاروكێت خاندنگەهێت سەرەتايى ل دهوكێ پشكدارى دڤێ پێشانگەهێ‌دا كرن.

**«پێشانگەهەكا نڤيسينێو هونەرێ شێوەكارى»**

بچاڤدێريا هێژا نامق رقيب سورچى، پارێزگەرێ دهوكێو بهەلكەفتنا شورەشا ٨ شواتا پيروز ل رێكەفتى ٧ / ٢ / ١٩٨٨ پێشانگەهەك ژلايێ رێڤەبەريا ڤێرگەهێت خاندنگەها هاتە ڤەكرن.

ئەڤ پێشانگەهە يا پێك هاتى بو ژ نێزيكى سەد كارێك هونەرى، يێت شێوەكارىو نڤيسينا عەرەبى. خاندنگەهێت ناڤنجىو ئامادەيى ل دهوكێ پشكدارى دڤێ پێشانگەهێ‌دا كرن.

**«دەستپێكرنێت شانوێ دكورەكى‌دا»**

نيقابا هونەرمەندا ل دهوكێ، روژا ١٠ / ٢ / ١٩٨٨ ل هولا بزاڤێت ڤێرگەها كورەك بو هێژا ابراهيم عيسى سازكر ل سەر دەستپێكرنێت شانوێ ل عيراقێ لناڤبەرا سالێت ١٨٨٠ – ١٩٢١.

هونەرمەندێ هێژا بائيز عمر كور برێڤەبر.

ژ رێڤە موحازرى بكورتى ل سەر باروزروفێت عيراقێ ل ناڤبەرا سالێت ١٨٨٠ – ١٩٢١ ئاخفت.

دويڤدا بەحسێ تيپێت شانوێو شانوگەرێت ل ڤێ قوناغێ هاتينە پێش كێش كرن كر.

پاشى تلا خو درێژكرە هندەك لايێت پەيوەندى بشانوێڤە هەين ل وێ قوناغێ، نولا دەقێ شانوێ ديكور، جهـ، جەماوەرێ شانوێ.

بو ڤێ بابەتى سەيداى مفا ژهژمارەكا روژنامەو كوڤارو پەرتوكا ژخورا ديت. ئەڤەو موحازەرێ نێزيكى سەعەتەكێ كێشا.

**«يانا چيروكێ ل دهوكێو ئێكەمين چالاكى»**

يانا چيروكێ يا سەر ب ئێكەتيا نڤيسڤانێت كورد ڤە ل دهوكێ ل رێكەفتى ١١ / ٢ / ١٩٨٨ ئێكەمين چالاكى يا خو پێش كێش كر. ڤان چيروك نڤيسێت برا دڤێ چالاكيێ‌دا چيروكێت خو خاندن:

١ – كريم جميل بيانى: هەلامەت خەريبى ل چاڤێت يارا دهێن.
٢ – جلال مصطفى: چيروكەكا كەڤن و نوى.
٣ – بائيز عمر: ڤەژين.
٤ صبيح محمد حسن: پنى.



پاشی سەیدایێ چیروك نفیس نزار محمد سعید ڤەکولینەك سەبارا کەس د کورتە چیروکێدا پێش کێش کر.

دڤەکولینا خودا سەیدای مەرجێت کەسێ سەرکەفتی دکورتە چیروکێدا دەست نیشان کرن.

ددویڤدا باسێ کەسێت پێشرەو سەخلەتێت پێشرەو بدرێژی هاتە کرنو موحازری تلا خو درێژکرە هژمارەکا کورتە چیروکێت کوردی وب کارهینانا وان بو کەسێت خوو لایەنێت هێزیێو لاوازیێ خویا کرن.

ل دوماهیێ هژمارەکا برادەرا کەفتنە قادا دانو ستاندنێو کور ب دوماهی هاتو نێزیکی سەعەتو نیڤا کێشا.

**«دامەزراندنا یانا شعریێو یا ناچیروکێ ل دهوکێ»**

ئێکەتیا نفیسڤانێت کورد ل دهوکێ ل روژا ١٨ / ٢ / ١٩٨٨ یا نەك بو هوزانێ پێك ئینا، هژمارەکا بەرفرەه یا شاعرا ل ئێڤاریا ڤێ روژێ ل بارەگایێ ئێکەتیێ ئامادەبونو پشتی دانو ستاندنەکا بەرفرەهو دانانا پروگرامەکی بو چالاکیێو بزاڤێت پاشە روژێ یێت یانێ، دەرگەهێ هەلبژارتنێ ڤەکرو چەند برادەرێت شاعر خو تەرشیح کرن، پشتی دەنگدانێ ئەڤ برادەرە هتنە هەلبژارتن:

١ – سلمان کوڤلی
٢ – پێزانێ ئالیخانی
٣ – کامیران محمد بەرواری
٤ – عبد العزیز هاجانی
٥ – صدیق خالد هروری

ئەڤەو دناڤبەینا خودا هێژا سلمان کوڤلی بو سەروکاتیا یانێ هەلبژارتنو پێزانێ ئالیخانی بو سکرتێر.

ئەڤەو بەری چەند روژەك یانا چیروکێ ژی ل دهوکێ هاتە پێك ئینانو چەند برادەرەك بو دەستەکا رێڤەبەر هاتنە هەلبژارتن.

هەژی گوتنێ یە کو ئەڤ هەر دوو یانە سەر بئێکەتیا نفیسڤانێت کورد ڤەنە ل دهوکێ.

هەر دوو یانا پروگرام ژ خورا دانانە بو بزاڤ چالاکیێت خو.

داخازا سەرکەفتنێ بو ڤان هەر دوو یانا د کەین سەخمەرا ڤێ پێش خستنا شعریێو چیروکێ ل دەڤەریێو بەرفرەه کرنا قاعیدا ڤان هەر دوو تەرزو رەنگێت ئەدەبی.

**«ئەدەبو مروڤ»**

ل روژا پێنج شەمبێ رێکەفتی ١٨ / ٢ / ١٩٨٨ ژ چالاکیێت رێڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەر، ل هولا رێڤەبەریێ کورەك هاتە سازکرن بو هێژا صدیق شەرو ل ژێر ناڤ نیشانێ «ئەدەبو مروڤ»، هێژا سەیدا حجی جعفر رێڤەبەریا کوری کر.

ل پێشیێ بکورتی ل سەر ئەدەبی دژیانێدا ئاخفت بیرورایێت هژمارەکا ئەدیبو بسپورا ڤێ چەندێ بو مە ئینان. پاشی بشێوەکێ گشتی بەحسا ئەدەبی کرو دەوری مروڤی د ئافراندنو داهینانا ئەدەبیدا. ددویڤدا بابەتێ خو ل سەر دوو خالا پارڤەکر.

١ – شانوو چیروك.
٢ – هوزانا کەڤنو یا نوی.

بو راو بو چونێت خو، مشە نمونە ژمەرا بەرچاف کرن. ل دوماهیێ چەند برادەرەك لگەل سەیدایێ موحازر کەفتنە قادا دانو ستاندنێ ژوان حسین بیبو – عبد الستار علی.

# كاروان


مجلة ثقافية شهرية

تصدرها الامانة العامة للثقافة و الشباب
باللغتين الكردية و العربية


## في هذا العدد




رئيس التحرير
محمد امين محمد احمد

نائب رئيس التحرير
حسين رشواني

العدد ٦٤
مايس ١٩٨٨

السنة السادسة



العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة كاروان ـ هاتف / ٢٠٨٨٢

# قصائد من الشعر الكردي المترجم

شعر وترجمة: محمد البدري

• محمد البدري
• من مواليد بدره ١٩٣٧
• بكلوريوس اداب / علم النفس
• اصدر مجاميع شعرية بالعربية:
١ - رذاذ الصدأ ١٩٦٩
٢ - ضجة الصمت ١٩٦٩
٣ - كلمات من كردستان ١٩٧٠
٤ - اغنية حب لنوروز ١٩٧٩

وبالكردية
• آه كم احبها ١٩٧٩
• مختارات من عادات الشعوب
• حب الحياة - قصص مترجمة لـ جاك لندن
• الاسطورة.. ترجمة
• رباعيات بابا طاهر عريان

• مثل اتحاد الادباء الكرد في مهرجان الشبيبة العالمي في المانيا الديمقراطية ١٩٧٢
• مثل اتحاد الادباء والكتاب الكرد في ١٩٨٦ في الوفد الادبي العراقي الى الاتحاد السوفيتي
• عضو نقابة الصحفيين
• عضو جمعية الثقافة الكردية
• عضو المكتب التنفيذي والمجلس المركزي في الاتحاد العام للادباء والكتاب في القطر العراقي.

## ١ - ايماءات...



غفوت في ظلال قصيدة
فصارت كلماتها وسادة لي
وفي الصباح
حين أشرقت الشمس
تحولت الانفاس هموما وجراحات
غضب القلم وأصابه الذهول
وأعلنت الاوراق الاضراب
فجأة، حدث فيضان أهوج
امواجه كانت معقدة سوداء معتمة
اصابعه كانت لهبا
فتح القلم ذراعيه
وضم القصيدة الى اعماقه
أما الكلمات
فقد صرن نجوما وانسحبن الى السماء
وبدون مصابيح مشرقة في ذرى الامال
أما انا
فقد صرت ساقية وصورة
ومرآة تعكس الالام والهموم.



## ٢ – سحابة

هاجرت سحابة حبلى بالماء
صوب سهل شاسع يتضور عطشا.
وفي الطريق
مرت السحابة على جبل وغابة
كان الجبل مهموما يعاني من جراحه
وكانت الغابة عارية
تعيش السأم
ويدت الطيور في منتهى الصراخ:
أين البحر.. أين النهر؟!
فاضطرت السحابة الى ان تبكي

## ٣ – الشهيد

قالوا:
هناك شيء يجيء كل يوم
مع اطلالة الفجر
في آفاق هذه الجبال
وعلى طول هذا الموسم
[illegible]
[illegible] المياه
[illegible] دماء الشهداء
المتلألئة اشراقا
تنهمر مع اشراقة موسم الربيع
مثل قناديل وهاجة
لكي تقدم للوطن صلواتها.

# رهان الخمسة دنانير

د. نافع عقراوي



نخس صاحبه الذي كان يجلس بجانبه على المصطبة في فناء الكلية بقلق مشوب بالضحك والأسى قائلا:

– أنظر.. أنظر.. شاهد أمامك..!

رد عليه صاحبه الذي كان منهمكا بقراءة كتاب طبي سميك ضجرا:–

– ماذا أنظر..؟ دعني أكمل موضوعي..!

– أقول لك.. ان صاحبنا ربح الخمسة دنانير!

– ماذا..؟ ماذا..؟ أية خمسة دنانير تقصد..؟

تدخل الثالث والرابع اللذان كانا بجوارهما على نفس المصطبة وقالا بصوت واحد:

– أية خمسة دنانير ياأبله...؟

أجابهم الأول وهو يضرب على فخذيه وكأن هموم الدنيا ساقطة على رأسه.. أو انه ربان سفينة كتب عليه الغرق، بصوت ملؤه الحسرة والحزن الممزوج بالضحك الباهت قال:–

– يستطيع هذا ان ينجز مالم نستطع انجازه طول هذه المدة... شاهدوه وهو ينزل معها درجات السلم... انظروا جيدا لتروا عجيبة اخرى تضاف لعجائب الدنيا السبعة... هذا ياإخوتي حية تحت التبن... كنا نتصور أنه على وضعه المزري لايقوى على شيء..

كانت عيون الاصدقاء الاربعة مسمرة بدرج السلم.. قلوبهم تنبض بسرعة.. كلهم مندهشون أمام ذلك المنظر...

– هذا... نعم هذا وليس غيره.. يربح الرهان..؟

– نحن أحسن منه حالا وقواما وهنداما وملأ للجيوب.. لم نقدر على ماقام به الآن.. كيف يجوز...؟!

– خمسة دنانير... أتدرون كم يستطيع هذا الأبله أن يعتاش بها..؟

– أنا أصرف الخمسة دنانير بدقيقة واحدة بعض الأحيان..!

– هو يصرفها في شهرين...!

تدخل الذي كان على الطرف الأيسر من المصطبة حيث كان يراقب الحديث قائلا:–

– لماذا تقللون قدر الناس..؟ لماذا تتحرجون من قول الحقيقة..؟ لماذا تعتبرون أن ملأ الجيوب وحسن الهندام هو كل شيء.؟ نعم لماذا تتصورون أن الوضع المادي هو السبب في وصول الانسان الى كل مايبتغيه..؟

أجابه الاول:

– وماذا تراه السبب في النجاح.. أيها الفيلسوف.. ان المال ويسر الحال هو

الطريق الى حل كل العقد..!
- لا. ياأخي.. ان كان هذا مملوءا بالمخ... أشار الى رأسه. وأستطاع الانسان الاستفادة من محتوياته لاستطاع أن ينجز كل شيء... لابل ان يأتي بالمعجزات..

- وهل هذه معجزات ياأخ..؟
- نعم معجزة.. أقولها بثقة.. نعم إنها معجزة... كم حاولت أنت... وحاولنا نحن كلنا.. وحاول اخرون أيسر منا حالا أن يصلوا الى ماوصل اليه صديقنا الان.. لم يستطع أحد أن ينجز ذلك... وأخيرا يستطيع هو ذلك.. الا يكون معجزة..؟ نعم إنها معجزة حقا..؟

كان يرتدي الملابس العتيقة... قديمة كانت بدلته التي دخل بها الى الكلية.. لديه سترة أخرى وبنطرونان عدا البدلة القديمة... كان يصلح بنفسه كل فتق أو شق يستجد في ملابسه.. ليس لديه أحد في المدينة الكبيرة يستطيع ان يستمد منه العون.. هناك اقرباء لامه وأبيه يعيشون في المدينة الكبيرة، ولكنه لم يكن يريد ان يظهر أمامهم بمظهر الضعيف الذي لايستطيع انجاز مهمته في انهاء دراسة الكلية، لقد قالوا بحقه الكثير عندما دخل كلية الطب: قالوا أنه لايستطيع اكمال الدراسة وقالوا: كلية الطب صعبة وتحتاج الى مادة... وقالوا: من اين سيحصل على المال في سبيل

اكمال الدراسة.. وقالوا اشياء يستحي أن يذكرها... لذلك لم يكن يمر حتى في المناطق التي يعيش فيها اقرباؤه.. نعم لم يكن يملك مايسد به رمقه.. ولكنه لم يظهر ذلك لأحد... رغم قدم ملابسه ولكنها كانت نظيفة دوما... لم تكن تنبعث منه الروائح كما كان بعض الزملاء يتضجرون من البعض الذين لايتورعون عن المجيء للكلية والروائح الكريهة منبعثة من ارجلهم أو اجسامهم... لاأحد يجلس بجانبهم في مدرجات الدراسة أو حتى في المختبرات المملوءة بالروائح المختلفة كصالات التشريح أو في مختبرات الكيمياء أو

صالات العمليات.. لم يكن لديه مكواة ولكنه كان يحافظ على هيئة الكوي في ملابسه وخاصة البنطرونات بوضعها تحت المنام باعتناء.. يغسل ملابسه وجواربه باعتناء.. حتى لاتتمزق ويقع في مأزق... رغم كل ماكان يقاسيه من ضيق العيش وسوء الاحوال فانه كان يملأ ذلك النقص بالانكباب المستمر على الدراسة والتميز فيها... كان في موضع الحسد من أقرانه... كل أمتيازاته ونجاحه وبروزه في الدراسة العلمية والنظرية يتحملها أصدقاؤه

وزملاؤه في الدراسة، ولكن في أن يكسب الرهان في ميدان استمالة قلوب الفتيات.. أمر لايحتمل.. كل زملائه.. أو حتى كل الناس يتصورون أنه لايمكن أن ينجح في هذا الميدان كيف ينجح في هذا المضمار من يشكو معدته

من الجوع الما... أزعج الأمر أصدقاءه وأعداءه... ولكن لم يكن هناك من يعاديه... ومن يعاديه..؟ ولماذا يعادونه..؟ بعد هذه الحادثة.. يجوز أن يعاديه بعضهم.. كيف..؟ الا يعرف الكل أن الحب شيء قدسي يحرك القلب... القلب كما يقول الكردي كالذبابة تحط على الجميل والقبيح... على الحلو

والمر... على النظيف والوسخ... ولكن هل يجوز أن يكون هو قبيحا... مرا.. أو وسخا حطت هذه المرة الذبابة عليه...؟ مهما كانت المسألة فإنه قد أنجز مالم ينجزه أصحابه وزملاؤه.. استطاع أن يقوم بعمل طالما حلم به الاخرون.. ولكن عمله كان في اليقظة وليس حلما..

لم تكن مواكبة لسنواتهم الاربع التي مضت.. بل تأخرت في السنة الخامسة.. ونجح اعضاء الجوقة... اصبحوا في نفس السنة الدراسية... كالاميرة كانت... تسوق سيارة حمراء في ذلك الوقت... وسط الستينات... كان يسمع زملاءه يتحدثون عن موديل تلك السيارة...

سيارة الشباب... أولاد الذين انعم الله عليهم في الدنيا... وفي الاخرة سيكون لهم امتيازات أكثر.. أميرة كانت في ملبسها ومشيتها وتصرفاتها أميرة في كلامها وطريقة تلفظها للكلمات.. نهود تتحرك وكأنهما ثائران في قيود ثقيلة يودان فكها من اجل الصعود لحبل المشنقة لنيل الخلود... زنود بضة

بيضاء... شفاه كالحجر تتقطر دما.. أميرة.. أميرة.. أميرة... في كل شيء.. تسلم على هذا بكبرياء تحرك لذاك رأسها...تهز يدها بخيلاء لآخرين... كلامها معسول ولكن موزون حتى مع الأساتذة.. ابتسامتها للجميع ولكن من برج عال كل الشباب والطلبة يحلمون بصداقتها وحبها.. ولكنها لم تجلس

مع واحد لوحدها.. كانت تجلس مع زمر الطلبة مطلقة ضحكتها وكأنها أنغام موسيقى لم يجرأ أحد على الادعاء بحبها أو حتى احتكار صداقتها... حتى البنات لم تكن صديقاتها... والسبب يعود للغيرة والحسد.. كم من طالبة كانت تنعت الأميرة بالغرور... لاتحسب حسابا لاحد وكأنها خلقت لوحدها... نسيج وحدها مالا وجمالا...

